## پێناس کتێب:

**نێو پەرتوک:** کوردستان لە ئاوێنەی مێژوودا

**نووسینی:** ئەلی ئەحمەد رۆشەنی (هەڵوەدایَ لەیلاخی)

**ناوەندی بڵاوکردنەوە:** قوروە ـ کتێب فروشی لەیلاخ

**هەژمار:** ۴۰۰۰ جلد

**نورەی چاپ:** اول ۱۳۷۷

**پیتچینی:** مرساد قوروە - تەلەفون ۵۹۲۰

**چاپەمەنی:** نادر

**قیمەت:** ۱۴۰۰ تومان

**ناوەروک:** لاپەرە

## «مەژی بو مەردن بمرە بو ژیان»

وێـنەکـەم هـەڵ بگـرن بـا بـمێنێ بـۆ یـادگار

خوڵی بەر پێ ئەوکەسەم دڵسوزە بوکوردی هەژار

«لە بیرەوەریەکانی ماموستا دوکتور سۆران سنەی»

# به نام خدا

ضمن تقدیم درود خالصانه به روح پرفتوح بنیانگذار جمهوری اسلامی ایران امام خمینی کبیر(ره) و تقدیم سلام به رئیس جمهور محبوب جناب آقای دکتر خاتمی و همچنین عرض ادب به حضور اهل اندیشه و قلم (جناب آقای دکتر مهاجرانی وزیر فرهنگ و ارشاد اسلامی) که با قبول این وظیفه خطیر بی‌شک جان تازه‌ای به روح قلم و اندیشه دمید.

کتابی که هم اکنون در دست است تاریخ و فرهنگ ملتی است که با تاریخ و فرهنگ و تمدن ایران‌زمین پیوند ناگسستنی دارد. چون هر گاه سخن از تاریخ و فرهنگ و تمدن ایران به میان می‌آید بی‌شک از اقوام دیرین مانند لولوبی‌ها و کاسی‌ها و همچنین مادها که در دوران خود نقش به‌سزایی در سرنوشت ایران داشته و جانفشانی و از خودگذشتگی فراوان کردند. وقتی که جناب آقای خاتمی در دوران انتخابات ریاست

جمهوری از قوم کُرد سخن گفتند، فرمودند: همین قوم کرُد بود که حکومت آشوریها را از پای درآورد. و باعث خوشحالی حاضرین شد که چنین فردی با بینش و تفکر وسیعی دور از هر گونه تعصب به اظهار وقایع تاریخی ایران کهن می‌پردازند. حال ما کرُدها هیچ وقت خود را از ایرانی بودن بیگانه ندانسته و همیشه افتخار می‌کنیم که ایرانی اصیل هستیم و خون اجداد دیرین ما برای یکپارچگی ایران به این سرزمین ریخته شده است و جانفشانی و از خود گذشتگی اقوام دیرین شاهد این مدعاست. و ایران ما را از خود بیگانه ندانسته و همیشه سرنوشت گره‌خورده‌ای با هم داشته‌ایم و همیشه ملت عزیز ایران اثبات کرده‌اند که دلسوزتر از بیگانگان هستند در حالی که در آوارگی کـرُدهای عراق ایران بیشترین خدمت و مهمان‌نوازی کرد و این را هرگز کرُدهای زیر سلطه عراق فراموش نخواهند کرد و زبانزد خاص و عام شد و تازه هر سال یادمان و یادواره شهدای حلبچه را گرامی می‌دارند و باعث دلگرمی بیشتر و خدمت صادقانه به این مرز و بوم و تلاش برای سازندگی ایرانی آباد و آزاد در سایه جمهوری اسلامی همه با هم به سوی سازندگی برویم.

والسلام ـ علی‌احمد روشنی

چەن زەمانە ئەخوینم تاکوو خوّمکرد بە پەن

بیرو هوّشم لا نەمابوو فیداکاری وەتەن

«ماموستا قانع»

* * *

زوانی خوّت بگرە دەخیلە لەو وشانە واحەقە

چوّنکە مەشهوورە کە حەق لایٚ بیٚ تەمیزان تالٚ و ڕەقە

چاوی زانا بە نەزانان خویٚنی ئەڕیٚژیٚ و مەولەقە

«نەجمەدین مەلا»

* * *

هـێنده تـەحقیقی حـەقم کـرد تـاکـۆ نـانی خـۆم بـڕی
زەنگـی بـه دنـاویم له نـاو ئـەم کـۆمەڵە کـوردەدا زڕی
چـۆنکه تـێ کـۆشاوم تـا پـەردەیٚ نـەزانـینم دڕی
سووک و ریسوا بـووم لەم نـاوا گـیرودەیٚ ئـاخر شـەڕی
بـەس بـە مـایەیٚ خـوێندم بـیری نـیشتمانم کـڕیٚ

«ماموستا قانع»

ئەی وەتەن کـوا ئـەردەشیر و رووسـتەمی بـێ تـرسو بـیم
شـێرە کـانت مـردن و بـێکارە کـان سـاغ و سـلیم

«ماموستا قانع»

# بە نێوی ئاهورا مەزدا [بە نێوی خوای خاوەن بەزەیی]

## سوپاسنامە

سوپاس و رێزی و دڵسوزی بۆ خێزانم ئەکەم یانێ دایکی شەرمین و رزگار و هەولێر کە بێ شک ئەو بوو لە گەڵ هەژاری ونەداری مندا ژیا و مناڵەکانی ژیان. و منیش بە خوێندن و بە پەێ جویی چەن ساڵەم توانیم ئەم کتێبە بنووسم. و هەروەها باوکم و دایکم ئەبێ بم‌بەخشن کە هیچ خێر و خۆشێکیان لە من نەدیوە جگە لە دەردیسەر و زەحمەت و گەردن ئازاییان لێ ئەخوازم. ئەبێ منداڵەکانم ئەوەش بزانن کە باوکیان سەر باری کۆمەڵ نەبوە و بۆ روناکی و زانست، چەرمەسەری زۆرم دیوە و ژیانم لە پێناوی خزمەت بە گەلەکەم تەواو کردوە. مەبەستم لە کتێب نووسین نیە، بەڵام پابەند بە بیرو باوەڕی دەرونی خۆم بوم و بۆ بیرو باوەر خۆم رێزم داناوە.

درکی چاوی ئەو کەسانە بووم وا دایم بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و ماڵ و تاریف پوڵ

و پارە دەرهێنان ئەکەن و جگە لەو قسانە هیچی تر لە جانتایاندا نیە و کات و ساتی چەپەڵیان هەر دنیا پەرەستیە، کاتێ من ئەبینن سنگی لوتیان ئەدرێ. من دژی سەروەت و پوڵ و پارە نیم، بەڵام لە پاڵی ماڵی دنیا بیروباورمان بێت، تێگەیشتو و زانا بین لە رووداوەکان، بێ لایەن نەبین. من پابەندی بیرو باوەڕی خۆم بوم ئەگینا ئێستا باری ژیانم پڕ لە هەژاری نەبو کە تیروتانەی کەسانێ بژنەفم وا خۆیان لە ژیانی ناموبارکیان تەنیا وەک گیاخۆرەکان بۆ خۆیان ژیاون و هیچ رەوڵێ کیان لە کومەڵدا نەبوە.

جگە لە فیتنە و فەساد و گوێ تەقەی بۆ چونیەتی ژیانی کەسوکاریان و دراوسیەکانیان و یان بۆ کۆکردنەوەی ماڵێ دنیا بە هەر شێوەیەک بێت.

ئەو جۆرەکەسانە ئەوەندە خوێریین کە مرۆڤ بە دەوڵەمەندی ماڵی دنیا ئەناسن چون خۆیان سەرسەرین.

منداڵەکانم تەنیا بەوە شانازی بکەن کە نانی دوورەنگی و چاپلوسی و خائنی و ملشۆڕیم نەداوەتە خواردیان و نانی کەسیشم نەبڕیوە ئەگەرچی جار وابوە لەگەڵ منداڵەکانم شەویش بە نانەڕەق روژمان کردوەتەوە.

ئەوانە وا ویستویانە بە سەروەت و سامانەوە خۆیان بە پیاو چاکە و ماقوڵ بزانن هەر لە لای ئەو چینە وا وەک خۆیان بێبارن قەبوڵیان ئەکەن.

بەڵام ئەگەر ئەوانەی وا بە ماڵی دنیا کەسایەتی (شەخسیەت) کازب و درو بو خۆیان دروست ئەکەن، ئەگەر ماڵی دنیایان نەبێت هەر وەک رێوی بەهار پێستیان پەڵە پەڵە ئەبێتەوە و بەم جۆرە دیارن. خۆش بە حاڵی ئەوکەسانە وا لە خۆیان کەسایەتی و سام و

هه‌یه‌تی کومه‌ڵاتیان هه‌یه.

زۆر که‌سان به شێوه‌ی شه‌م سوتاون به‌ڵام بوون به روناکی بو چه‌وساوه‌کان، هه‌ر ئه‌و ده‌وڵه‌مه‌ندانه ئایا جارێکیش بیریان له‌وه کردوه‌ته‌وه ئه‌گه‌ر چینی زاناکان دژی چه‌وسێنه‌ران هه‌ڵوێستیان نه‌کردبایا ئێستاش هه‌ر به‌رده و نۆکه‌ری مالک و ئاغاکان و سه‌رمایه‌داره‌کان بوین.

به‌سوپاسێکی زۆره‌وه له مامۆستای به‌رێزو خۆشه‌ویست کاک سه‌ید مه‌سعوودی حوسێنی نوێنه‌ری ده‌وری چواره‌می خه‌ڵکی قوروه و دێ‌گولان له راوێژگه‌ی کۆماری ئیسلامی که ئه‌مجاره بوونه هۆی خزمه‌تێکی فه‌رهه‌نگی وباری ماڵی ئه‌م کتێبه‌یان به‌ئه‌ستۆگرت و له ئاستی فه‌رهه‌نگ و مێژووی وڵاته‌که‌مان هه‌ستیان به به‌رپرسایه‌تی کرد. هیوا دارین نمونه و وێنه‌ی کاک سه‌ید مه‌سعوودی حوسێنی‌مان زۆرتر بێت تا وه‌کو ببنه هۆی بوژانه‌وه‌ی فه‌رهه‌نگ و مێژووی نه‌ته‌وه‌که‌مان. له‌کۆتاییدا له یه‌زدانی گه‌وره داوای ته‌مه‌نێکی دوور و درێژ و پر به‌ره‌که‌ت بۆئه‌م برایه‌مان ده‌که‌م.

سوپاس و رێز بۆکاک ئارف نادری و موهه‌ندس کاک ناسری شوکری، کاک هوشه‌نگ ته‌ماسبی، کاک ئه‌لی ره‌زا حیشمه‌تی، کاک مه‌حمودی ئه‌لی په‌نا وه کاک مه‌سعود ئیزه‌دی (ته‌رواڵ).

ئه‌م کتێبه پێشکه‌ش به‌وانه‌ی وا بۆ زانین و روناکی تێ ده‌کوشن

**مێژوو ۹۱۲٦ کوردان**

خزمه‌تکاری فه‌رهه‌نگ و مێژووی کورد

ئه‌لی ئه‌حمه‌دی ره‌وشه‌نی (هه‌ڵوه‌دا له‌یلاخی)

# بابەتی لەبارەی ئەم کتێبەوە

خۆشەویستەکان، خوێندەوارانی بەڕێز، بەر لە ئەوەی وا ئێوە دەست بە خوێندن ئەم کتێبە بکەن سەرنجی ئەم بابەتە بدەن:

ئەم کتێبە دڵینابن بۆ ڕوون کردنەوەی ئێوە نیە تا لە مێژو و... بزانن. ئەم کتێبە دەردی دڵ بوە و بۆتان روون ئەبێتەوە کە من لەو پەری سادەیی و بێ کینە لە گەڵ برا قەڵەم بەدەستە کوردەکان، ئەم کتێبەم نوسیوە. بەڕاستی هەر کوردێ وا خوا گۆشەی ڕەحمی کردبێتە لایەوە و بیرومێشکی تایبەتی پێ داوە نابێ خۆی بەزل بنوێنێ.

هێشتا بۆ کورد رەخنەی فەرهەنگی زووە. بەڵکو فێر کردن و دەرد دڵ کردن و هەروەها سکاڵا نووسین بۆ چارە ڕەشی کورد یەک ڕەنگ بوونی، کە ئەرکی گەورەی قەڵەم بە دەستانە بزانێ. تازە ئەوانەی وا هەنگاوێ بۆ میللەت هەڵ ئەگرن خۆیان ئیتر بۆ خۆیان نابێ بژین هەر لە جەستە تا ماڵ و گیانیان هی میللەتەکەیانە و بەس.

بۆتان ڕوون ئەبێتەوە من چەندە حەسرەتم لە دڵ دایە و ئەڵبەت بە حەقی خۆمی ئەزانم و شانازی پێ ئەکەم، کە لە چینی بێ خەبەران نیم. با ڕۆژێ چەن جار ئەمرم خۆزگە ئەخوازم بەوکەسانە تەنیا جارێ ئەمرن ئەگەر کوردێ ناکورد ئەبینم وا لەکراسی کوردیدا ئابرو و شەرەف کورد خاڵدار ئەکات من هەناسەی سەردم لە گەڵ ئاخی دەروونم کێوان ئەسوتێنێ، یان کوردی وا بە کزی و هەژاری ئاوارە و دەربەدەری هیچی تر، گیان لە جێگایکە دەر ناچێ.

من زۆر جار لە بەر بێ پوڵی و دەست کورتی نیش و تەشەر و تانەی ناکەسانم بیستوە. بەڵام کوردمان هەبووە و هەیە کە بە پارە چی ناکات، لە دەوڵەتە داگیرکەرە کەرەکان خراپتر بۆ کورد زەرەریان هەیە، جا ئەگەر ئێمە دەستی ئەوانە بخوێنین زووتر بە ئامانجمان ئەگەین. خۆشەویستان ئێوە لە داهاتوودا نەڵێن کتێبەکەی لە دڵسوزی بۆ کورد نووسیوە من هەموویانم یان لە کتێبەکان ـ کە ناو و نیشانیانم داوە و ئاشیرەتم بۆ سەرچاوەکان کردووە ـ دەرهێناوە یان بە چاوو تێگەیشتوی روون و ئاشکرایە.

من ئەوکاتە وا هاورێەکانم چ لە لادێ چ لە شار خەریکی فێر بوونی پیشەیێک بون یان ژیانی خۆیان لەرێ کار و کاسبی ئەبوارد من لە شوێنی خوێندن و نووسین و فێر بوونی زمانی کوردی بوۆم.

وا ئێستا بۆ نان ئەچم دۆم نیە یان ئەگەر چی ئێستا ژیانم پڕە لە هەژاری و نەبوونی. بەڵام ئەوە ئەزانم کە خەڵاتی هەر کوردێ وا هەنگاوی بۆ سەر بەرزی وڵاتەکەی هەڵ گرتبێ هەژاری و نەداری نەبوونی و چەرمە سەری و سەرە سوڕیە و لە ئەم رۆژگارەدا بە

غەریبی ژین دەکا.

ئەوەش ئەزانم کە تا زیندوو بم هەر بێ رێز و بێ‌حورمەتم بەڵام جا چۆن ئێمە لە چاڵی نەداری و نەبوونی‌دا بژین مەگەر ئەو کورددانەی وا بە پارە ئەتوانن ئێمە بکڕن، ئەوانە کورد نین؟ بۆنی کوردایەتی لە مێشکیان نەیداوە؟ جا ئەگەر ئەوانیش تەنیا بەقەد پەڕە کاێک دڵیان بو گەل و نیشتمان خۆیان بسووتێ نایەڵن کە قەڵەم بەدەستانی کورد لەبەر دەستکورتی و هەژاری نەتوانن فەرهەنگەکەیان وا بە نارەوا زیندووبەچاڵ کراوە دیسانەوە زیاتر بفەوتێ ئەویش لەبەر دەست کورتی چینە زاناکانی کورد.

جا لە ئاخری ئەم باسە پێویستە سەرنجتان بۆ ئەوەش ڕابکێشم کە ئەوانە وا مایەێ نەنگی کوردن پێیان دەڵێن سەرسەری هەر دەوڵەمەنەکانی کوردن وا جارێکیش لایان لە کورد بونی خۆیان نەکردوەتەوە.

کوردمان هەیە کە ملوێنها تمەن پارە و ئیمکاناتی هەیە کەچی پێ خۆشە کورد دانەێ هەزار تمەن بفروشێ تا گیرفانی پڕتر بێت و یان حیسابی بانگی زۆرتر بیت با ئیتر لە هەڵەبجە ٥ هەزار کورد بە چزلێک بکرێت ئاهیشی بو ناکێشن تا چ بگات بەوانە بڵێ ئەمانە برا و خۆیشکی منن بویە دەڵێم کوردی نامەحرەم وایان بە سەر گەلی کورد هاورد.

هەر کەس بە زمانی کوردی بدوێ پێ ناڵێن کورد ئە بێ لانی‌کەم دایم خەمی چارەنووسی کوردی لە دڵ بێت و فرمێسک لە چاوی بێتە خوار بو بێ کەسی کورد، و خۆی نەبێ بە دژی کورد و من دواکەوتنی کورد بەشی زۆری هەر بائیسی ئەم ناکوردانە ئەزانم وا دەوڵەمەندن و پارەدارن بە تایبەت برێک لە شارنشینەکان چۆن بە لای خۆیانەوە

پێشکەوتوون و خاوەنی تەمەدونن کە چی لە هیچ، هیچ ترن.

ئەم لە خۆ بێ خەبەرانە ئەگەر کورد ببێتە پارە خۆشیان ئەوێت چۆن زیاتر دەوڵەمەند ئەبن.

خوێنەرانی بەڕێز لە هەڵەکانم ئیراد مەگرن چۆن هەروەها کە نووسیومە هەژاری و دەست کورتی باڵێ شکاندوم و پێم خۆش نیە کە لە ئازایەتی و قارەمانەتی میللەتێک وا بە درێژایی مێژوو جگە لە چاکی شتێ تریان بو مرۆڤ نەبووە خوم گێل بکەم و نزیک بە نۆ هەزار ساڵە ئەم قەومە چەرخی لە چەمەر بڕیوە و روژگارانی تێپەڕڕ کردوە بە سەر کەندوکۆسپەکانی رۆژگاردا سەر کەوتو بووە. نە بت پەرست بوون، نە زاڵم. کاتێ حکومەتیان کردوە گەلانی دیکە و دراوسیەکانی بێ خوف و ترس لە پاڵیاندا ژیاون. گەلی کورد خاوەنی تەمەدون و فەهەنگ بووە کە زۆربەیان لە گەڵ چەرخی بیستەمدا یەک ئەگرنەوە. جا لێرەدا ئەوەمان بو روون ئەبێتەوە کە چۆن ئەم قەومە مێژوویە لە نۆ هەزار ساڵ پێش‌دا ئاوا تەمەدونیکی بێت کە هێشتا لەم چەرخەدا پەسەند و بە کەڵک بێت. جا حەیف ئەوە نیە کە پشتی لێ بکەین کە فەرهەنگێ پەسەن بکەین کە لە تێدا جگە لە چەورزبانی و دوو رەنگی و ... نیە.

ئەمن پێم خۆشە ئەوانە وا لە مێژوودا یان لە فەرهەنگی کوردیدا و بە گشتی لە رەوولی کومەڵایەتیدا شارەزاییان هەیە بە تایبەت چینی زاناکان لێم ببورن چۆن دەزانم ئەم کتێبە کەم و کوڕی تێدایە. بەڵام ئەوەش بڵێم کە ئەوانەی وا نێوی خوێانیش بە کوردی نازانن تا چ بگات بەوەی خاوەنی بیر و باوەر بن لایەق بەوە بن کە رەخنە بگرن یان بە رەشقەنەوە

باسی ئەم کتێبە بکەن. ئەو جۆرە کەسانە رەخنەشیان هەر بێ ئەرزش و بایەخە بەلایی منەوە، چۆن تا دوینی و هەر ئەمروژ هەر قسەی لەوق و پوچەڵ لە دەمیان داکەوتوە و ئەم دەمشڕانە ڕەخنە لە ئاسمان ئەگرن تا چ بگات بە منێ هەژار، شوکر بۆ خوا تەنیا کەسانێ هەر وەک خۆیان ژیاون لێان ئەبیسن و خەرابی وتن ئەوان بۆ من خەڵاتە، ئەو کەسانە هەر وەک کرمێ چۆن لە ناو گەنکاو ژین دەکات ئەگەر ئەو گەنکاو و چەپەڵیە لێ ببرێ و لە ناو شوشەدا پەروەردە بکرێ ئەتۆپێت. ئەو تاقمە هەر وا بار هاتوون و تەنیا پێان خۆشە بە گەندەڵایی ژین بکەن، بە لایَ روناکیدا نەچوون. بۆیە هەر کەسێ بیەوێ ژینی چاکە بکات پێان ناخۆشە. ئەم جۆرە کەسانە ژینی چاکە بە زۆر خواردن و خۆش خۆری و تێر بوونی زکیان پەرچ ئەدەنەوە، هەر وەک حەیوان زیانەخورۆن. ئێتر هەر کەسێ هەرچی بێت بابێت، و ئەگەر چی جاروبار بۆ سەرگەرمی خویّان لە فەرهەنگ و زانین ناوێ دەبن. و ئەگەر وا نین بۆ چی سەرشۆرن و ئەم هەموو چینە کومەڵاتیە چیە.

ئەلی ئەحمەدی روشەنی (هەڵوەدا لەیلاخی)

# بەشی مێژوو

هەر ئەم ئادەمیزادە بە واتای ئەمڕۆ پاشان خۆی ئەبێ بە مێژوو. لە لایەکی ترەوە ئەوەش بڵێین کە وا هەر کەسێ هەوڵی نووسین مێژوو بدات بە مێژوو نووس ناژمێرێت چونکە مێژوونووس نابێ چی پێ خۆشە بینووسێ بو خۆی یان بەشان و شکۆێ میللەتەکەی خۆی بینووسێت.

ئەبێ لە نیوی دەریای بێبنی مێژوودا مەلەوانیکی چاک بێت تا لە بنی ئەم دەریایەدا دورڕ و مەرجان بدۆزێتەوە و هیچ راستی‌یک نەشارێتەوە و یان قەومی خۆی پێ ناخوش بێت و یان دەرخستنی ناوو نیشان بێت تا بگاتە پلەی مێژوو نووسی راستەقینەی مێژووی پاش خۆی.

زۆرێ له مێژوو نووسان پاش سەرنجی خوێندنی کتێبەکەی جگە سەرلێشێوان شتێ تری خوێنەر دەستی ناکەوێ وەک ئەوانەی وا خۆیان بە قەڵەم بە دەستی میللەتی دادەنن کە چی ئەم تاقمە نووسەرە ئەگەر ڕاستیش بنووسن خەڵک متمانەیان پێ ناکات کە وا بوو بەر لەوەی وا قەڵەم بە دەستەوە بگرن ویژدان و دووارۆژ له بەر چاو بگرن.

به پەسەن و پەیجوی مێژوو نووسان تا سەردەمی دامەرزاندنی حکومەتی هەخامەنشیەکان زیاتر له چوارده حکومەت بە ماوەی ۸ هەزار ساڵ له ئێران حاکم بوون و هەموویان قەومە پێشویەکانی کورد بوون وەک ئانزان ـ سوباری ـ مانانای ـ گوتی ـ میتانی ـ میدیەکان ـ لولوئی ـ کاسیەکان ـ هوری ـ نایری ـ کاردوخی ـ ئاکاد و مادەکان. به بیروڕای زۆربەی مێژوونووسەکان، سومری و ئورارتویەکان هەر هۆزەکانی کورد بوون.

له بەر بەیانی مێژووە هەر له ئێران حوکومەتیان کردووە و ئێران شوێن و ماوای کۆنی کوردەکانی ئێستایە و قەومی پارس کە لقێ له قەومەکانی کوردن و زوانی پارسی کە بێ کەڵک وەرگرتن له وشە کوردیەکان ناقس و کزە، و پارسەکان هەر له ژێر سێبەری ئەم حوکومەتانە کە له پێشدا باس کرا ژیاون. فارسەکان له هەموو تەنگوو چەڵەمەیەکدا پشتیوانی کورد بوون و خۆیان بە جیا نەزانیوە و له هەر دەور و ڕۆژگارێ خۆیان له کوردەکان جیا نەکردوتەوە. تا سەر دەمی بناغەی حکومەتی هەخامەنیشیەکان ئێران به دوو پارچە ناو نرا کە ئێران پارس و ئێران ماد بو.

له باستان شناسی (کۆنینەناسی) مادەکاندا لاپەڕەی ۱۳ بەم جۆرە هاتووە کە بەڕاستی جێگەی باوەڕ بووە له لایەن پسپۆڕەکانەوە بەڵگەی مێژووی بەدەستەوە هەیە کە

قەومەکانی ئورارتوی و مانایی و گوتیەکان و مادەکان و لولوبیەکانیش هەموویان له بنچینەدا یەکێ بوون و بنەچه و ریشەی ژیانیان هەر له زەنجیرە کێوەکانی زاگروس‌دا ژیاون و مێژووی ئێران و کورد بە جورێ پێکەوە گرێ دراون کە جیاکردنەوەیان سەخت و دژوارە.

گەلی کورد نابێ هەرچێ وا نەتەوەکەی پێی ناخۆشە بیشارینەوە بە تایبەت چینی قەڵەم بەدەست و ئەوانەی له مێژووی کورددا هەووڵ و تەقەلا ئەدەن و یان هەر سەرچاوەیێک له بەردەستیدا بێت متمانە و باوەڕ پێ کراو بێت. بەڵام ئەمن بو خۆم ئەوەم بۆ روون بوەتەوە کە گەلی کورد تا هاتنی داڕێژرانی بناغەی حوکومەتی هەخامەنشی له ئێران هەموو پادشا و حکومەتەکانی ئیرانی هۆزە پێشویەکانی کورد بۆون و پێتەختەکانیان هەر لە خۆرنشین یان کوردستاناتی ئێستا بووە و وڵاتی پارسیش حکومەتە کوردەکان حاکمیان بۆ ناردووە.

ئیمپراتوریەتی ئێران زۆر پان و بەرین بووە، بۆ نموونە بەرزایەکانی گوڵان کە ئێستا رژیمی ئیسرائیل و سووریە لە سەری شەڕیانە ئەم ناوچە سەرزەوینی ئیمپراتوریەتی ئێران بوەە لە سەر دەمی دامەرزاندنی حکومەتی گوتیەکان ئەو ناوچە ئاوەدان کراوەتەوە و چونکا ئەرەبەکان لە جیاتی «گ»،«ج» بەکار ئەبەن دەڵێن بەرزایەکانی جوڵان.(بۆ ئاشنایی زۆرتر بروانن بە جوگرافیای ئێران باستان ـ نووسینی دوکتور مەشکور) ئەو سەردەمە ئیمپراتوریەتی ئێران لە ژێر دەسەڵاتی گوتیەکان بووە و پاناترین سەرزەوی

بەدەستی گوتیەکان لە خاوەری ناوەڕاست[1] حوکومەتداری و دەسەڵاتداریان بووە. ئەم قەومە لە هۆزەکانی بەشی ئاراراتن و لە چیاکانی زاگروس و ناوچەی کەرکوک فەرمانڕەواییان کردووە و لە ٣٧٠٠ ساڵ پێش زایین هێرشیان بردە سەر وڵاتی بابل و داگیریان کرد.

کاردوشیا، کوردوخ، کارداک، کورتی: ئەمانە لە بنەڕەتدا ئەچنەوە سەر هۆزی گوتی و گوتیەکان بەدەست ئورارتویەکان شکستیان خوارد.

لولو یان لولوبێ: ئەم هۆزەش لە ئاراراتەوە[1] دەستیان بە دامەرزاندنی حکومەت کردووە و لە سلێمانی و شارەزور و حەلواندا پێتەختەکانیان جێ بە جێ کردووە و ئانۆبانی‌نی فەرمانڕەوای گەورەی ناسراوتر لە نارامسین کوڕی سارگون یەکەمدا بووە.

مێژوو نووسەکان زیاتر لەم بارەیەوە باسیان کردووە دەوڵەتی ئاشوور چوار جار هێرشی ئەکاتە سەر وڵاتی لولوی ناکام ئەمێنێ لە ئەنجامدا ئاشوور هێرشی دڕندانە ئەکاتە سەر و لولوبیەکان شکست ئەخوەن پێتەختەکەیان داگیر ئەکات کە زەیمەری ناوی پەیتەخت یان بوە.

مێژووی کورد و کوردستان ئایەتوڵلا مەردۆخ دەڵێ زیاتر لە سی شاری وڵاتی ماد و پارس لە ژێر چاوەدێری ئەم حکومەتەبووە کە ئاساری مێژووی لە شارەکانی ئێران

---

١- ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

١-ئارارات ئێستا تورکیا بە خاکی خۆی دەزانێ بەڵام تا هاتنی سەفەویەکان هەر سەرزەوینی ئێران بوە.

شاهیدی ئەم ئیدەئایەیەکە چەن دانە شار و قەڵا لە سەردەمی لولوبیەکان لە وڵاتی پارسی ئاوەدان کراوەتەوە و لە گەڵ گوتیەکان بە هۆی نزیکایەتی زمان ورەگەزەوە تێکەڵ بۆون.

پادشای ئاشوورگەلێ لە پیشەسازیەکانی لولوبی برد بۆ وڵاتی ئاشوور ـ تا لە دەست و نەخش و نگاری قەومی و ئاشوور لە پیشەسازی‌دا لە دیلە لولوبیەکان فێر بن.

کاسو یا کاسی‌یەکان: ئەم هۆزەش هەر ئەچنەوە سەر هۆزە ئاراراتیەکان و زاگروس نشینەکان لە ناوچەی کرماشان بە دەسەڵات‌داری حکومەتیان کردوە و لە ئەم ناوچە پەیتەخت خۆیان دامەرزاندوە. بە هوی گەورەیی هێز و شکۆ و دەسەڵات‌داری ئەم هۆزە ئەکەدیەکان پیان وتوە کاکو یا کاکە، کە رەنگە کاکەوەندیەکان لەم ناوەوە وەرگیرا بێت.

لە ناوچەێ لەیلاخ بەین کرماشان و کولیای دو ئاوایی هەیە کە «کاکۆ»یان پێ ئەڵێن و شۆینەواری مێژووی (ئاسار باستانی) تێدا هەیە کە قەدەغە کراوە. بەداخەوە پاش ماوەیەک بەدەستی نامەحرەمەکان بە کورد و کوردستان و دژی فەرهەنگ و میللەت فروش، کێوەکەیان دابووەوە رەنگە دەفینە و گەنجی زۆریان دەس کەوتبێ ئەوەی وا بسەلمێنێ کە حکومەتی و پەیتەختی کاسیەکان لەوەێ بووە بە دەستەوە نیە.

هوری یا سوباری: ئەم ناوە کە لە سەدەکانی پێش زایین ناوی لێ براوە هەر چەند ئەم هۆزە خاوەنی وڵاتێکی زۆر گەورە و بەربلا و پان و بەرین بووە و حامورابی ئەم ناوچەێ بە ناوچەیەکی سەر بە خۆی ناو بردوە و «تەگلات‌پالازاری» پادشای ئاشوور ئابلۆقەی ئەو ناوچە ئەدات و هێزەکانی سەر بە سوباری یا هوری هەموویان یەک ئەگرن و ئەو ئابلۆقە ئەشکێنن و پاش ئەم شکستە وردە وردە هۆزی سوباری ناوی «نایری» بە خۆیەوە

ئەگرێ و پەیتەختەکەیان له ناوچەی شەمزنیان دائەمەرزێنن. پاش ماوەیەک وردە وردە حکومەتی نایری تێکەڵ بە میتانی ئەبێت و ناوی میتانی بە خۆیەوە ئەگرێت. دوکتور جەماڵ رەشید هوریەکان هەر بە سومریەکان دەزانێ و ئێستا بە سوباری ناویان دەبەن.

لێرەدا ئەوەمان بو دەر ئەکەوێت کە ئەم حکومەتە هەموویان لە یەک رەگەز و هۆز بوون.

حکومەتی میتانی: لە سەردمی دەسەڵاتداری خۆیدا وەک حکومەتە گەورەکانی جیهان ناوبانگ دەرئەکات و پەیتەختەکەی دەوڵەتی میتانی «واشوگانی» ناوی بوە و لە گەڵ فەرائنەکانی میسر پەیوەندی پەیدا ئەکات کە لە لایەن «توشراتای» فەرمانرەوای میتانییەوە نامەکەی بو فەرائەنەی میسر نووسراوە و مێژووناسەکان پێتەکان و نووسینەکەی بە شێوەی کوردی قەفقازی ناوی ئەبەن کە لەو سەردەمەدا زمانی ئەکەدی شێوە زمانی ڕەسمی بووە و لە شاری کەرکوک پاشماوەی حکومەتەکەیان بە جێ ماوە.

جورنسۆ رۆژهەڵات ناس ئەڵێت: ناو و نیشانی میتانی تەنها بە خێزانی فەرمانڕەوای میتانی وتراوە، بەڵام ئەسڵی دەوڵەتەکە سوباری بووە،[1] بە داخەوە هەر نووسەرێک بە جورێک ناوی قەومە دێرینەکانی کوردی بردوە و هاوردویەتە سەر کاغەز.

تەنیا خوێنەرانی کورد ئەبێ بەر لە هەمووشتێ مێژووی خۆیان، خۆیان لێی شارەزا بن نە چاوەڕوانی بێگانە بن و لە قەوڵی ئەوان مێژوو بگێڕنەوە. زۆربەی مێژوونوسەکان کوردئەکەن بەچەن بەشەوە وەک: کوردی رۆژ ئاوا و کوردی رۆژ هەڵات و یان باکور و

---

١ – بە واتای برێک لە مێژوونوسەکان زیاتر لە سەر ئەو باوەرەن کە هۆزی سوباری هەمان سومری بوە بەڵام برێک بە هەڵە رەگەزی سومری بە نژادی سامی دەزانن.

باشور. ئه‌مانه ره‌نگه له‌به‌ر به‌ربڵاوی نه‌ته‌وه‌ی کورد بێت چونکا گه‌لی کورد له سه‌رده‌می خوێدا ده‌سه‌ڵات‌داری به سه‌ر زۆربه‌ی ناوچه‌کانی ئێران بووه و هه‌م به‌یت و باوی و فولکلۆری و زمانیش به هۆی ده‌وڵه‌مه‌ندی زاراوه‌ی لقو پۆی دابێته‌وه و دراوسیه‌کانیش له هه‌ر بابه‌تێکه‌وه که‌ڵکیان لێ وه‌رگرتبێت. لێره‌دا له کتێبه‌که‌ی ئایه‌توولڵا مه‌ردوخ ـ که به مێژوونوسی بێ لایه‌ن ناسراوه ـ ئه‌بێ که‌ڵک وه‌ر بگرین که به‌م جۆره فه‌رمویه‌تی: کورده‌کان له به‌ر به‌یانی مێژوو هه‌ر له ئێرانی کۆنه‌وه سه‌ریان هه‌ڵداوه ئه‌گه‌ر چی جار وا بێت کوچ‌یان کردبێت. به‌ڵام بنه‌بڕ نه‌بوون که‌م و زۆر هه‌ر ماون تابۆ هه‌تاهه‌تایه نیشته‌جێی ئێران بوون.

له پاشماوه دیرینه‌کان بۆمان ده‌رئه‌که‌وێت که لولوبیه‌کان وگوتیه‌کان هۆزه بنچینه‌کانی کورد بوون. و له گه‌ڵ سومر و ئه‌که‌ددا هاوسێ بوون و ته‌نانه‌ت بڕێک کوردی باشور و کوردی باکور یان جیاوازی زاراوه کوردیه‌کان لێیان به جیاواز ناو ئه‌به‌ن. ئه‌م چینه وا دیاره شاره‌زای مێژوو نه‌بن و ڕه‌نگه لایشیان له مێژووی کورد نه‌کردبێته‌وه. به‌ڵام دوکتور ره‌شید جه‌ماڵ له کتێبه مێژوویه‌که‌ی خۆیدا ده‌ڵێ که سومریه‌کان هه‌رکورده‌کانی ئه‌مڕۆژن و ئه‌و ڕایه‌ی به‌تاڵ کردوه‌ته‌وه که سومریه‌کان سامی نژادن چون له کتێبه‌کانیان سومریه‌کان هۆزی سوباری بوون.

ورده ورده رۆژ هه‌ڵاتی به‌جێ هێشتوه تا ئه‌مڕۆژ که له خۆرنشینی ئێرانه‌وه جێ‌گیر بوون و ئێران به وڵاتی مادی بچۆک و کوردستان به ناوی مادی گه‌وره ناسراوه که مێژوونووسه‌کان به چه‌ند جۆر بیرو ڕایان ده‌رخستوه.

بەشی یەکەمی کورد ناو ئەنێین «کوردی ڕۆژ ئاوا» بەشی دوهەم ناو ئەنێین «کوردی ڕۆژ هەڵات». (لێرەدا ئێران بە مادی گەورە و مادی بچوک مەبەست ئاریایەکان بووە کە بە کورد رۆژ هەلات و رۆژ ئاوا مێژوونووسەکان بەم جورە ناویان لێ بردوە).

ئەگەر چێ مێژووی کورد هێشتا بە تەواوی روون نەبوەتەوە تەنیا ئەشو زەرتوشت ئەوڵ بە خوێندنەوەی کتێبی ئاڤێستا کە خەڵاتی زەرتوشت بووە لەبارەی نزیکایەتی فەرهەنگ و ئەدەب و زمانەوانی بۆمان دەرئەخات کە مێژووی کورد ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار ساڵ پێش زایین.

بەڵام ٣٦٠٠ ساڵ پێش زایین ناوی هۆزەکانی کۆنی کورد هاتوە و دیارە هەر لە سەرەتای مێژووە تا ئەمڕۆ ئەم قەومە بە ناوەکانی جۆرواجۆر لە روی ڕۆژگاردا هەر بونی خۆی لە هەر دەور و ڕۆژگارێکدا نشیان داوە و ناوی لە هیچ دەور و زەمانێکدا کەم ڕەنگ نەبووەتەوە وەک گوتی، کوسی یا کاسی، سوباری، لولوبی، کاردوخ، ئاریان و ئێران.

بۆ نمونە لە سەردەمی حکومەتی کەیقوبادی کورد لە سەردمی کیانیەکانەوە وردە وردە ناوی کورد روون و ئاشکرا ئەبێتەوە. پارسەکان بەشێک بون لە مادی گەورە. لە ٨ هەزار و هەشت سەد و پەنجاە و سێ ساڵ پێش کوردەکان پەرەیان دابە ئێرانی گەورە و لە گەڵ تیرە بچوکەکانی ئێرانی وەک پارس و پارت پێکەوە ئەژیان و لە ساڵی پانسەدو پەنجای پێش زایین لە وڵاتی ئێران بچڕان و ئێران بو بە دو بەشەوە. ئێرانی ماد و ئێرانی پارس[١] ـ لەم

١-تەنیا لە کاتی هەخامەنیشەکان ئێران بە ماد و پارس ناو براوە بۆ ماوەیێک کورت. لە کاتی

کاتەدا کورد جارجارێ فەرمانڕەوایی تەواوی ئێرانی گرتوتە دەست.

بڕێک جاریش ژێردەستی حکومەتی پارسی لە کاتی داهێنانی هەخامەنشی تاکۆتایی پێ هاتن ئەو حکومەتە، دەسەڵاتی بە سەر کورددا بووە. بڕێک جار حکومەتی پارسی مادیان پێ وتووە. ئەگەر چی هێشتا دەرحەق بە مێژووی کورد لە لایەن هەر کوردەکانەوە کەم تەرخەمێکی زۆر کراوە و نووسەرە رۆژ هەڵات ناسەکان خۆیان بە پێ خواست دڵی خۆیانەوە چیان پێ خوش بووە وایان نووسیووە. ئێستا ئەگەر چی بڕێک لە برایانی قەڵەم بەدەستی کورد تازە لایان لە مێژوو کردوتەوە بەداخەوە ئەم چینە قەڵەم بە دەستە قەد بە خۆیان زەحمەتیان نەداوە وهەر لە روی کتێبە مێژوویەکانەوە رونووسی کراون. وەک خوالیخۆش بۆ ئەمیرشەرەفخانبتلیسی کە لە روی کتێبەکەی (مروج‌الذهب) نووسینی مەسعودی. مسعودی کتێبەکەی لەبارەی قەومی کوردەوە نووسیوە دەڵێ ئەمانە (هۆزی کورد) لە نەتەوەی دێوەکانی حەزرەتی سلێمانن کەنیزەکانی دەرباری لە گەڵ دێوەکان تێکەڵ ئەبن و ئەولادیان لێ پەیدا ئەبێ و حەزرەتی سلیمان ئەو زاوزوی‌یانە دەر ئەکات و ئێستا کوردەکان پاشماوەی ئەو جن و دێوانەن وا سلیمان پەیغمبەر دەریانی کردووە و هەڵوەدای کێو و شاخ و داخ بوون.(١)

ئازیزان بەداخەوە ئێستاش بڕێک هەر ئەو ترێشتە لە ریشەی مێژووی پڕ لە بنەچەی

---

حکومەتی کورش وڵاتی لیدیە و لودیە چاویان بۆ وڵاتی ئێران خایەن دەبێت ئینجا کورش لەترسی ئەو دو وڵاتە حکومەتەکەی بە ناوی حکومەتی مادی - پارسی ناو ناوە.

٢ - ئەمیر شەرەفخان خۆی لە کتێبەکەی‌دا نوسیویە کە لە قەوڵی مەسعودی وا وتراوە و ئیتر بەتاڵی نەکردوەتەوە و لە سەری نەڕۆیشتوە.

ئاوینەی مێژووی کورد ئەدەن بە پێچەوانە ئەبێ مێژوونووسانی کورد خۆیان قۆڵی هیمەتی لێ هەڵماڵن ماندوو نەناس بن و بەرو گوند لە شوێن هەر شاخ و داخێ بچن. چونکا مێژووی کوردستان هەر ئێستاش لە سینگی کوردە بە ساڵاچووەکاندا ماوە و زۆربەی ئاوایی وکەژ وکێوەکان و شوێنەوارەکۆنەکان هەر پاشماوەی نەتەوە دیرینەکانی کوردن و هەر ناوی برێک لە ئاوایی و کێوەگان بە یادی ئەو قەومەوە یان پادشا و فەرمانڕەواکانی کوردەکان بوون، ماون.

یان بە داخەوە برێک لە باغەڵ خۆیانەوە مێژوو دروست ئەکەن و بە مێژووی گەلی کوردی دائەنن. بۆ نموونە دەڵێن کە حەزرەتی موحەممەد ـ درووودی خوایٚ‌لێ بێت ـ کوردێکی دیوە فەرموویە لە خودا تەڵەب ئەکەم‌کە ئیوە لە هیچ رۆژگارێکدا خاوەنی هێزو قودرەت نەبن.

جا ئایا رێبەری تەواوی موسڵمانان و پەیام هێنەری ئیسلام و قورئان هیچ مرۆڤی خاوەن ئەقل و مێشک باوەڕ ئەکات کە شتی وای بەسەر زاریدا هاتبێ؟ بە داخەوە ئێستا برێک لە قەڵەم بەدەستانی کورد هێشتا لە نێو کتێبەکانی خۆیان ئەینووسن.

مێژوونووسانێ وەک نەمر ئەمین زەکی‌بەگ کە بەڕاستی بێ لایەن کتێبی کورد و کوردستانی نووسیوە و بو خوێنەرانی مێژووزان بەڵگەیەکی چاکە و هەروەها حەزرەتی ئایەتوڵڵای مەردۆخ و دوکتور رەشید جەماڵ ـ کە بە بیرورای من تا ئێستا کورد کەسێکی تری مێژوونووس وا بە خۆیەوە نەدیوە ـ وە هەر وەها ئێحسان نوری ئەتوانین بلێن کە دەریای مێژووی کوردی لە ناو گۆزەی زانین کتێبەکەیدا نووسیوە و مامۆستا

ئەلائەدین سەجادی و چەند دانەتر کە ناویان لێرەدا ناگونجێ. یان ماموستای نەمری شائیری کورد ماموٚستا قانع کە مێژووی لە چوار چێوەی شێعردا داتاشیوە و بەڕاستی مێژووی لە ناو شێعردا گونجاندوە. شائیری راستەقینەی حەماسی کورد کە لە ناو دیوانەکەیدا خوێنەر بۆی روون ئەبێتەوە کە ئەم شائیرە دڵسوتاوە چەندە ئاواتی سەر کەوتنی گەلەکەی لە دڵدا بووە. یان چۆن باسی تەفرە و نیفاق و جیاوازی گەلەکەی کردووە و هوێ دواکەوتنی گەلەکەی چی بووە. هیوا دارم لە هەر ماڵی کوردپەروەردا لە سەر تاقچەی کتێبخانەکەیدا دیوانی ماموٚستای خۆشەویست قانعی نەمری بێت. یان ئەحمەدی خانی چۆن ئەویش لە پەرتوکی مەموزیندا باسی نیفاق و جیاوازی گەلی کوردی لە ٣٥٠ ساڵ پێش‌داکردوە. چۆن دەردی کوردی زانیوە و چەندە حەسرەت لە دڵیا بووە. بۆ نموونە شێعریک کە ئەم باسە برازێنێتەوە.

هەر دو تەرەفان قەبیلی کورمانج

بو تیری قەزا کرینە ئامانج

«ئەحمەدی خانی»

لە لاپەڕەی ٦٩ کورد و کوردستانی ئەمین زەکی‌بەگ دا هاتوە کە کوردەکان لە ئەسڵ و ریشەدا لە یەک تیرە نین. رەنگە ئەم باسە لە سەر چاوەکانی نووسەرە بێگانەکان کەڵکی وەرگرتبێ لەم بارەرەوە نوسیویە بۆ نموونە شێوەی ئاخاوتن سلێمانی و ناوچەی بادینان کە بە ئاسانی لە زمانی یەکتر حاڵی نابن. ئەگەر بەڕاستی وایە نابێ ئەمەش بە ئاسانی لەم باسە خۆمانی لێی دەر بکەین. ئەبێ بە رەوڵی ئیلمی ئەم باسە لێ پەیجوی بکرێ چۆن لە

درێژەی باسەکەی خۆی بویەک خستنی ڕەگەزی کورد بووی نەچووە. ئەوەی نەهاوردوە کە بۆ نموونە بادینەکان پاشماوەی هوریەکانن و پاشماوەی سوباری شیوە ئاخاوتن میتانیەکانن کە ئەم دو هۆزە لە بنەچەدا یەک ئەگرنەوە بەڵام لەو سەردەمەدا بە شێوەی جیاواز حکومەتیان کردوە. هەوەها کەمتر پەیوەندیان پێکەوە بوە. لەبەر ئەوە شێوەی ئاخاوتنیان جیاواز بوە بۆ هەر شتێ وشەی تایبەتییان بۆ خۆیان دا ئەنا. وەک: من، ئەز، وێم، خۆم

شێوە زبانی ئێستا سورانیەکان پێ ئەدوێن و یان لانی کەم ئەم زاراوە و جیاوازی لەق و پۆ و دەوڵەمندی زمانی کوردیە، بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوە کە کورد بۆ خۆی جیاجیایە و هەر ناوچە و مەڵەبەندێ لە تیرە و رەگەز جیاواز بون. بە بیروڕای من هۆی بەربڵاو بونی نەتەوەی کورد لە سەردەمەدا بوە.

گەلی کورد هەر لە مێژەوە پاسەوانی ئایین و رەوشت و داب و نەریتی خۆی بووە و داگیرکەران هیچ بەزەییێک و دڵێ کیان بۆ کورد نەسوتاندوە بەو هەموو رەفتارە نامرۆڤانە کە دوژمنانی کورد بەم میللەتە پاک و بی گەردە کردویانە، نەیانتوانیوە بە ئاواتی نامرۆڤانەێ خۆیان بگەن تەنیا سەرشوری نەبیت شتی تریان دەست نەکەوتوە و بویە کورد لە هەر ناوچەیەک یان مەلبەندی بە هەر شیوەیەک کە پی وترا بیت یان ئاکاری و رەوشتی باب و باپیرانی خۆیان ون نەکردووە. بۆیە لە ۹۱۲۵ سال پیش‌دا بە «من» لە ئاڤێستا وتراوە «ئەز»، لە بادین ئێستا هەر بە «من» دەڵێن «ئەز». یان سورانیەکان چۆن نزیک‌تر بە سومەریەکانن و هۆزیکی گەورەن لە بنەچەی کورد و ئەوگەلە هەر بە ناوچەی

سوراندا بڵاو بونەتەوە و چۆن سوباری یا سومری داهینەری خەت و زێڕ بوون، سورانیەکان هەر بە «تەڵا» دەڵێن «زێڕ» و سومریش پێی وتوە «زەرێ» و سوران زێڕی کەمەوادی تەڵایە بە کەڵکتر لە ئاسن ناسیوە و لە ئاسن جیای کردوەتەوە و زێڕیان پێ وتوە. ئەمانە هەمووی ئەچنە سەر ئەوە کە گەلی کورد زمان و نەتەوەیەکی دیرینەی سەرەتای ژیانی ئادەمیزادی بە خۆیەوە دیوە و رۆژگارانی تێپەڕ کردووە و چەرخی لە چەمەر بڕیوە و ئەسپی مێژووی لە مەیدانی سەخت و دژواردا غار داوە. بۆ هیچ سەردی و سۆڵی ڕۆژگار نەیهێشتوە فەرهەنگ و داب و نەریت گەلی کورد لە مێژوودا تا ئەمڕۆ بفەوتێ و زۆر گەلانی دراوسێی هاوردە ژێر دەسەڵاتی خۆی و تیکەڵ بە کورد بوون و پاش ماوەیەک هەموویانی ئازاد کردووە و دیسان لە ژێر ئاڵای کورد بە ئاسای و ئاسایش ژیاون. پارسەکان بە هۆی نزیکایەتی ڕەگەز و نژادەوە بە ڕەزامەندی خۆیان هاتنە ژێر ئاڵای کوردەکانەوە و لە ڕکیفی لودیەکان خۆیان ڕزگار کرد. ئەمانەی هەمووی بەپێی تێپەڕ بونی زەمان و دەورانەوە گەلی کورد هێشتا هەر لەم گۆڕاوگۆڕی رۆژگارانەوە هەر نەریت و نەتەوەی خۆی پاراستوە.

ئوستاد پورداود کە یەکێ لە زمانەوانەکانی ئێرانیە و یەکێ لە وەرگێرەکانی ئاڤیستایە و بە ئایینی زەرتوشت و بە فەرهەنگ و مێژووی ئێران خزمەتی زۆری کردووە و پانفارسیسم تەواو مانا بووە دەڵێ: کورد لە هەر وڵات و شوێنێکدا بێت هەر ئێرانی ڕەسەنە. بەڵام ئەوەی نەوتووە کە فارس لە نژاد و ڕەگەزی کوردەکانن. لەو بارەوە تەفرە چووە.

ئێرانیش زۆر جار بە هیمەت و توانای کوردەوە لە چنگ بێگانە رزگاربووە و یەکێ لە مەترسیەکانی دوژمنانی ئێران لە بەر ئەوەبووە کە کورد ئەبێت بە رەقیبی ئەوان و چارەیان نەبووە ناچار لە سەر جێگەی خۆیان دانیشتوون.

بێ شک زوانی کوردی لە فارسی کۆنترە و هەشتاد لە سەدی وشە کوردیەکان بەتایبەت زاراوەی هەورامی لە نێو کتێبی ئاسمانی ئاڤێستا کە خەلاتی ئەشو زەرتوشت بووە پەیدا ئەبێت.

زۆربەی وشە فارسیەکان ئەگەرێتەوە بۆ سەر شێوە زمانی کوردی و لە بنەچەداکوردی بووە ئەگەر زوبانی کوردی نەبوایە ئێستا زوانێک بە ناوی فارسیمان نەبو. ئایا ئەگەر بتەوێ بلێیت کە وایە ئێستا بو چی کورد لە سەر بە خۆیی خاکی خۆی بێوەریە یان بو چی مافی نادەنێ یان تو سەربەخۆیی تەواوی کوردوستانت لە گەڵ ئێران قەبوڵە وڵامی ئوستاد پورداود و فارسەکان چ دەبو؟

دوکتور مەشکور نوسەری کتێبی «جوغرافیای ئێران باستان» وتارە مێژوویەکانی زۆر پسپۆڕرانە لە کاتی حکومەتی لولوبیەکان ـ کاسیەکان ـ گوتیەکان ـ ئورارتوی‌یەکان و هەروەها مانای ـ میتانی و... باسی لێیان کردووە و لە برێک جێگادا ناوچەکانی ئێرانکە لە ژێر دەسەلاتی ئەو حکومەتانە بوە باسی کردوە. برێک لە مێژوونووسەکانی ئێرانی بێ کینە و دەغەڵ کورد بە ئێرانی ڕەسەن دائەنن یان لە کاتی روو بە روو بوون لەگەڵیان دەڵێن ئێران یانێ کورد و ئیمەی پارسی بە کورد زۆر قەرزدارین و بە ڕاستی شانازی ئەکەین. بەداخەوە ئێرانیەکان وا سیاسین لەو حەقایقە چاوپۆشی ئەکەن یان خۆیانی لێ گێل

ئەکەن. جا لە ئێرانی کورد لە بەر ئەوەی لەگەڵ پارس‌دا لە مەزهەب جیاوازن هەر ئەوەش وای کردووە چونکا کوردەکان جگە لە تاقمی کوردی ناوچەی لەیلاخ و گەرووسی و شاری کرماشان و سونقر و کەنگاوەر تەواوی کوردستان سونی مەزهەبن ئەمەش بوەتە کەندوکۆسپی گەورە و زیاتر، ئەم جیاوازی مەزهەبیە بوەتە ناکۆکی و تەفرەقە لە گەڵ ئێرانیەکان و دوژمنانی کوردیش لە بەر ئەوە کورد و پارس یەک‌یەتیان نەبێت تۆمی نیفاقیان وەشاند و توانیان بەشێ گەورەی لە خاکی ئێران دابڕ بکەن ئەویش کوردەکان کە خۆیان ئێرانیان ئاوەدان کردوەتەوە.

لێرەدا ئێمە باسمان زیاتر لەوەیەکە ئەبێ دێر یا زوو پارسەکان بێنە سەر گەلی کورد و بەر لە ئەو حکومەتە داگیرکەرەانە وەک تورکیا و ئێراق و سوریە و بەشێ لە ئیرەوان[1]، ئەبێ ئێران هافی ڕەوای سەر بە خۆیی فەرهەنگی کورد بە شێوەی ڕەسمی بناسێ و بە دراوسیەکان کە لە مافی کورد چاوپۆشی ئەکەن ئەوانیش بە ئەو کارە تێ بگەیێنێ و یارمەتی کورد بدات و بە پشتیوانی گەلی کورد فارسەکان ناو دەر بکەن. چۆن ئەمە مێژوو رونی کردووەتەوە کە ئێران تا هاتنی هەخامەنەیش فەرمانرەواکانی کورد بۆون و پاش روخاندنی مادەکان زۆربەی خاکی ئێران کەوتە دەست وڵاتە دراوسیەکانی ئێران.

زیاتر لە سەردەمی مادەکان هەر لە خۆرنشین تا خۆر هەڵات و لە باشور تا باکوری ئێران شارەکانی کە نزیک بە بیست شارە لەو دەورانەدا ئاوەدان بووتەوە. بە داخەوە هیندێکیان یا ئاسەواری نەماوە یان کەوتوەتە ژێر دەسەڵاتی دراوسیەکانی ئێران، بەڵام

---

١-ئیرەوان لە ئیرواچ ئاقێستادا گیراوە.

باس لە سەر ئەوەیە کە ئەو شارانە مادەکان ئاوەدانیان کردوتەوە و بەر لە مادیش قەومە پێشوەکانی کورد شارەکانی تری ئێرانیان ئاوەدان کردوەتەوە یانێ ئێرانی کە بە گیانبازی کوردەوە خۆی بە حکومەت گەیاند. بەڵام دێر یا زوو هەمووی رۆشنایەکان لە کەل سەر دەر ئەهێنێ و تاریکی لە دڵان و پەردەی نەزانی لە چاوان لا ئەبات. ئێستا شارەکانی دەورانی حکومەتی ماد کە لەو سەردەمە حاکمەکانی کورد تێدا بوون و سەر بە ئیمپراتوری ماد بوون یان هۆزە پێشوەکانی ئێرانی کە بە شێوەی سەر بە خۆیی و ژێر چاوە دێری مادەکان و نەتەوە پێشوەکانی کورد ئاماژەی کورتی پێ ئەکرێت. جا چۆن وشەی ماد لە زوبانی ئاشوریەکان بە «مادای» یا «ئامادای» بووە و زۆرتر لە «بەردە نووسراوەکانی ئاشوور» ناوی ئەو شارانە هاتوە جیاوازی لە گەڵ ناوی ئێستای زوانی مادیدا هەیە بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوە کە شک و گومان پەیدا بکات چونکا ئەمە بە یەک گرتنی چەن خاوەن بیروڕای مێژووزانی متمانە پێ کراو داهاتوە ناوی شارەکانی ماد ئەمانن:

خودی مادەکان وڵاتی خۆیان بە «ئامادای» ناو ناوە پی تەختەکەیان «هێگمادانا» کە «هێ» لە کوردی ئەمرۆژدا بە مانای «خاون» کە لەوە ئەچێ خاک و زیدو نیشتمانی مادەکان بێت.

«ئاریزانت» کە بڕێک لە نووسەرە مێژووزانەکان بە ئێرانزو ناویان بردوە ئەم شارە هێشتا بە تەواوی ئاسەوارەکەی و یان جێگای ئێستای نەزانراوە بەڵام لە ناوچەی لەیلاخ گوندێک کە شوێنەواری شارەکۆنە بە ناوی ئارەزەن هەیە کە شوێنەواری کۆنە. هەڵبەت لە

ناوچەی کوردوستاندا چەن گوند بە ناوی ئارەزەن هەیە. رەنگە هەر لەو سەردەمە ئاوەدان کرابێت و ناوی ئەو هۆزەیان لە سەری دانابێت.

شاری‌تر لە ئێران ماد کە ئاوەدان کراوەتەوە ناوی «زیگرتو» بووە کە لە ئازەربایجان بەرەو و ناوچەی سەلماس لە لای باکورەوە ئەویش شوێنەواری کۆنە کە ئێستا لە لایەن میراتی فەرهەنگی کۆنەناسی قەدەغە کراوە.

شارەکانی تر «نیک‌سامما»، «بێت ساگبان»، «شورگاریا»، «کیشەسو»، «بێت‌خێرما»، «بێت ئوومارگی»، «خارخار»، «کیلامبانی»، «ئارمانگو» و «ماژگا» کە ئەم شارانە هەر لە شاری کەرەجەوە تا نزیک کێوەکانی خۆرئاوای ئێران پێجویی ئەکرێت. ئەگەرچی بڕێک لە شارەکانی بە تەواوی لە کاتی هێرشی دڕندانەی ئاشوریەکان و دوای ئەسکەندەری مەلعون و پاشان ئەرەب و مەغول لە گەڵ خاک‌دا یەکسان کران. لە بەردە نوسراوەکانی ئاشوور یا ئاشورپانی‌پاڵ بە یادگاری شومی خۆی جێ هێشتوە کە نووسراوە "من وڵاتی مادەکانم داگیر کرد و خاکی شارەکانی ماد بە فەرمانی من بە توورەکە[1] بردیان و لە دورەوە ئاوم هاوردە سەری ئەو شوێنە تا ئاژەڵ و قامیش تێدا سەوز بێت و ببێتە جێگای جانەوەران تا ئاساری لە بان پاسارەوە نەمێنێ" بەڵام پاش شکستی ئاشور کە بە هێرشی هوخشتەر شای ماد ئەویش کۆتایی بە ئومری ئاشوور هێنا، دیسان مادەکان بۆ سازکردنی ئەو شوێنەوارە یان لە نزیکی ئاوەدانییان کردوەتەوە کە ئاوەدانی دیسان لەو ناوچانەدا ببێتەوە سەر بساتی رۆژگار.

---

١-توبەرە

«شارناته»، «ئارانزشو»، «ساپاردا»، «سیگریس»، «ئوشکایا»، «تاروتی»، «بێت‌سان»، «کارالما»، «ئیزیرتا»، «زیقا»، «ئورمیاته»، «شودیرا» و «تارماکیس» ئەم شارانەیش لەگەڵ ئەو شارانە وا لە سەرەوە باسمان کرد هەموویان لە سەردەمی مادەکان ئاوەدان بونەتەوە. بەڵام ئەو شارانەی کە لەپێشدا ناومان برد زۆربەیان بە کەمی گۆڕاون بڕێ لە شارەکان ئێستا ماون وەک «تارماکیس» کە تەبرێزی ئەمڕۆژە و ئەبێ لە «قەرەسو» ی کرماشان هەتا ورمێ، لەم بەێنابن.

لە کتێبی مادەکان بناغە دانەری ئەوەڵێن حکومەتی شاهنشاییی لە غەرب ئێران و جوگرافیای ئێران باستان نەخشەی واداهێناوە کە لە بەێن تارماکیس یانێ تەبریزی ئەمڕۆ و سونقور کولیای لەو بەینادا بەرە و تەبرێز ناوی «زی‌یڤا»ی هێناوە کە زیوویەی ئەمڕۆیە لە سەرزەوین ئێستای کوردستان.[١]

لە کتێبەکان ئاشوور ناوی قەومەکانی پێشوی ماد هاتوە، زیاتر لە گوتیەکان و لولوبیەکان و هوری و ئورارتوی ناو براوە و ئێستا ئەوە گەورەترین سەرچاوەیە کە بە دەستەوەیە بو ئەو ئیدەئای نەتەوە پێشویەکان کە لە ئێران حکومەتیان کردووە کورد بوون.

لە لێواری دەریای خەزەر کە لە مێژوودا پێیان «کاسپی» وتووە قەومگەلێ دیکە وەک ئاندیا و کادوسیان ژیاوون کە مێژوونووسەکان وەک: هێرودوت و ویل‌دورانت و گریشمەن لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەم هۆزانە لە نەژادی هوریەکان و ئورارتویەکان

---

١-لەم بارەوە بیرورای جیاواز هەیە کە دەڵێن مادەکان بناغەی حکومەتیان لە زیـوڤیە (زیڤا) دامەزراندوە.

بوون.

له کاتێ دەسەڵاتداری مادەکان و فەرمانڕەوایی هوخشتەرە کە گەورەترین ئیمپراتوریەتی مادی پێک هێنا هۆزی کاسپی کە لە لەیلاخ ناوچەیەک هەیە ڕەنگە ئەمە هەمان کاسپی بێت ـ ئێستا «کازێن»ی پێ دەڵێن تەواوی هۆزە بچوکەکانی مادی بە یەک کرد و بەرەو ئاشوور هێرشی برد و تەختی ئاشوری ژێروزەوەر کرد. لەگەڵ شای بابل بە ناو «بنوپولاسی سار» بە ئاشتی و دۆستی لەگەڵ ئەو حکومەتە موئامڵەی بازرگانی کردوە هەموو وڵاتی مادی بەیەک کرد و لە ژێر یەک حکومەت یەکگرتو بە سەرکردایەتی خۆی «هوخشتەرە» بە هێزترین حکومەتی لە ناو حکومەتە دراوسیەکان دامەرزاند. دۆسایەتی بابل و ماد بە چەشنێ بوە کە وڵاتی ئاشوور لە نێوان ماد و بابل بەشی ئەگرێت. چۆن بابل یەکێ لە دۆستە نزیکەکانی وڵاتی ماد بوو شای بابل بە چاکی لە شاکانی ماد ناوی بردوە. وا دیارە کە ماد و بابل لە ماوەی درێژای حوکومەتیان لە گەڵ یەک شەڕیان نەکردووە لێرەدا مەبەست لە حکومەتی مادەکان لە دیاکو ـ ئازدیی‌هاک بوە (جوگرافیای ئێرانی باستان ل١٣٦٥) لە ٧٠٠ ساڵ پێش زایین‌دا زوانی مادەکان بە شێوەی ڕەسمی لە تەواو ئێران پەرە ئەستێنێ و بووە زوبانی ڕەسمی گشتی دانیشتوانی ئێران. لە هەمان لاپەڕەدا (١٣٦) دوکتور جەواد مەشکور ڕەنگە خۆی لێ گێل کرد بێ چۆن لە لاپەڕەکانی پێشودا (١٣٣) پەیوەندی ڕەگەزی و بنەچەی نێوان کوتیەکان و لولوبیەکان لە مادەکان خۆی دانی پیا ناوە کە چی لە ل ١٣٦دا دەڵێن زوبانی مادەکان لە لولوبیەکان و گوتیەکان وەرگیرواە و زوانی ئێرانی نەبوە تەنیا ئازەربایجان و کوردستان پێی دواون، بەڵام شەرق

وڵاتی ماد زوانی ئێرانی داگرتوە وەک ئەسپەهان و بە گشتی وڵاتی ماد لە خورهەڵاتەوە لەو سەردەمە بە لقێ لە شێوە زمانەکانی مادی پێ ئاخافتن چۆن زاراوەکانی مادی بە هوێ دەوڵەمەندی فەرهەنگ زمانەوە نیە و لق و پۆی زۆری داوەتەوە کە یەکێ لەو لق و پۆیە گرتنی شێوە زمانێک بووکە ئێستا «فارسی» پێ دەڵێن، و فارسی لە تان و پۆی کوردی کۆن پێک هاتوە. دیسان جەنابی دۆکتور مەشکور بە شک و گومانەوە لە ل ١٣٩ دەڵێ وڵاتی پارسی باجدەری وڵاتی ماد بووە و لەم بارەوە تەفرە چوە. لە کاتێکدا لەو سەردەمە هەموو کتێبە مێژوویەکان ناوی ماد و حکومەتی ماد و شەڕ و شۆڕڕ لیدیە و لودیە و ئاشوور هەمووی لە گەڵ ماد بووە و ناوێک لە پارسی نەبووە. وڵاتی پارسی یەکێ لە ناوچەکانی ماد بووە لە ژێر چاوەدێری مادد‌ا ژیاوە و حوکومەتێ نەبوە کە ناوی حکومەتی لە سەردا بێت کە باجدەری مادی بوبێت تا پێکهاتنی هەخامەنیش. لە لاپەڕەی ١٤٥ جوگرافیای ئێرانی باستان ـ دوکتور موحەمەد جەواد مەشکور بە متمانە و بە لایەنگری لە پارسەکانەوە نووسیویە و نەیویستوە فەزڵی مێژووی کوردی ئێستا سەر بکەوێت نووسیویە کە هەڵەیە زەرتوشت لە غەربی ئێران یان بە قومی ماد بزانن چونکە تەسەور و باور یان کردووە چۆن ئاگرکەدەی ئازەرگوشسب لە ئازەربایجان بووە پێیان وا بووە کە زەرتوشت بانی ئەو ئاگرکەدە بووە و لە خەڵکی ماد بووە. دوای بە تورەی دەڵێن ئەم بیروڕایە بە تەواوی خەتاو دور لە حەقیقەتە. تەنیا لە وڵامی ئەم نووسەرە ئەبێ ئەوە بڵێن کە خۆی لە بڕێک جێگادا دەغەڵ و تەئەسوب لە بیری چووە چۆن دەڵێن درۆزن کەم بیروهۆشە لێرەدا ئەوەڵ چۆن *دڵێن باسی زەرتوشت هێندە گران و دژوارە کە خودی زەرتوشتیەکان بیروڕای جیاوازیان*

هەیە لەسەر ئەوەکە زەرتوشت ٩١٢٥ ساڵ پێش هاتوە و پاش برێک تریان دەڵێن لە شەش هەزار ساڵ پێش لە دایک بووە و ئەم نووسەرە لە سەر چاوەی کتێبەکانی «کسانتوس» «پتازونی» و «نیبرگ» کەڵکی وەر گرتوە و ئەوانەی دوپات کردووە، کە چی لە سەرچاوەکانی تریش شارەزایی بوە بەڵام نەیویستوە مێژووی تاریکی زەرتوشت دەربخات. چونکا ئەگەر لەوانەی‌تر باسی بکردِایە ناچار بە کورد بونی زەرتوشت دانی ئەنا. سەر چاوەکانی وەک «ئەیەکسوس» «هرتسفلد» و رای زۆربەی مێژوونووسەکان هەر شەش هەزار ساڵ بووە. لێرەدا باس لە سەر رق و کینەی دوکتورجەواد مەشکورە کە ئەوەی مێژووی کورد بە مێژووی لە دایک بوونی زەرتوشت گرێ خواردوە و لە هەر جێگایێک کە باس لە مێژوو و ئائین زەرتوشت بکرێ بێ گومان ناوی کوردیش تێتە مەیدانی مێژوو. کە وا بوو لەمە زیاتر لەم باسە نەدوین، بچینە سەر باسی مێژووی حکومەتەکانی نەتەوە پێشویەکانی کورد. بە جۆرێک مێژوو شوێنەواری ئەو هۆزانە نیشان ئەداپەیتەخت ئەوان «ماناکان» بووە کە هەمان مادەکان بوون پاش لولوبیەکان و گوتیەکان لە ناوچەی زاموئا لە باکوری دەریاچەی ورمێ نیشتەجێ بوون و خۆیان داساکاند و دەوڵەتی گەورەیان پێک هێناوە لە ٩٠٠ ساڵ پێش زایین. پەیتەختی ئەو قەومە «ئیزیرتو» کە رەنگە زێویەی سەقز بێت و لە ٨٠٠ ساڵ پێش زایین لەگەڵ ئورارتوییەکان بە هۆی هاورەگەز و هاو زمانی، بوون بە حکومەتی بەهێز وە لە ٧٠٠ ساڵ پێش زایین توانیان سەکاییەکان بۆدایم لە ئێران راو بنێن و ئەم هۆزە لە کاری هونەری‌دا دەستی باڵایان هەبوە کە پسپوری مێژووناسی لە زیوەیەی سەقز برێک لەو ئاسەوارەیان پەیدا

کردووە. لە هەڵکەندن ئاسن بە شێوەی نەقش و نیگاری دڵڕفێن لە فەرهەنگ و تەمەدونی ئەم هۆزە کوردە حەکایەت ئەکات. مێژووی روناکی کورد هەر برێک لەم لاینگرە خومالێەیانەوە و ئەرەبە داخ لە دلەکان و بێگانە شەرق ناسەکان کە لە گیرفان خۆیان مێژووی کوردیان هەڵ داوە توشی شپرزەی زۆر بوون. پێویستی بە شۆراییکی مێژووزان و شارەزایانی مێژووناسی کورد هەیە چونکا زۆر لە کوردە مێژوونووسەکان ئەو جۆرە شیاوی کوردە و ئەو جورە کە مێژووی ڕاستەقینەیە نەیانتوانیوە رونی بکەنەوە. ئێستا بە شێوەی بێ سەروبن مێژوو فەرهەنگ و بەیتو باو بە گشتی بەسەرهاتی کورد هەر یەک بە بیروڕای خۆی دەنووسی. گەورەترین سەرچاوە بۆ روون بونەوەی مێژووی کورد هەر خاک و ناوچە و شوێنە کۆنەکانی کوردوستانە و هەروەها ڕیشەی ناوی دژ و قەڵا و کێوەکان و ئاسەوارەکانی ژێر زەوین کە کوردی دڵسوز و حکومەتی دڵسوزی ئەوێت. کاتێ کە لە بەردە نووسراوەکانی ئاشور (ئاسور) دەرئەکەوێت - کە «شەمسی داد» کوڕ شالمانازار بە یادگاری شومی خۆی جێی هێشتوە - لەو بەردانە نووسراوە کە زۆربەی شارەکانی وڵاتی مادی کاول و خاپور کردووە. لێرەدا دەر ئەکەوێت کە کوردستان لە کۆنەوە ئاوەدان بووە. بە داخەوە زۆربەیان بە هێرشی دەڕندانەی ئاشوریەکان و مەغولیەکان و سکایەکان کاول بون و ئاسەواری نەماون. گەلی کورد هەوەڵین قەومێ بو کە پاش بچربوونی مقدونیەکان هەڵمەتی کردووەتە سەر سلوکیەکان بەروە پارس راویانناوە. هەروەها لەو سەردەمە دیسان گەلی کورد ناوی هاتەوە سەر زمانی نەتەوە زیندوکان،و ئەشکانیەکان لەگەڵ کوردەکان بە ئاشتی ژیاون و شان بە شانی ئەشکانیەکان

بو ئەستاندوەی خاکی ئێران خەباتیان کردوە.

قەومی کورد له بەردەوام بوونی ئەشکانیەکان دەستێکی باڵای هەبووە لە بواری دەرامەدی دەوڵەمەندیدا یارمەتی ئێرانی داوە. ئەشکانیەکانیش قەد بیری بەژێر ڕکیف دەرهاوردنی کوردستانیان نەکردووە با کوردستان له ژێر چاوەدێری ئێران بووە بەڵام شێوەی سەربەخۆیی بووە بە ئاشتی لەو ئەسرەدا ژیاون.

پارچەکانی کوردستان فەرمانڕەواکانیان کورد بوون بەڵام مادی بچوک و مادی گەورە زیاتر وێردی سەر زوانەکان کەوتوە. لە سەر پارچەی هەمەدان، سنە وکرماشان و ورمێ و ناوچەیْ ئەردەڵان و بەشێک لە خاکی موکریان و قەزوێن و زەنگان بە مادی بچوک ناسراون و لەگۆمی وان تا شارەزور، کەرکوک، بوتان، دیاربەکر، بتلیس، هەولێر، مەهاباد سەردەشت و بانه بە مادی گەورە ناسروان. لە چەرخی ساسانیەکان زیاتر پەرەی دراوە بە حکومەتی مادی گەورە و شارەکانی تری ئێران بە «مادی پارس» ناویان بردوە.

حوسەێن حوزنی موکریانی لە کتێبی «ئاتروپاتەکان» لاپەڕەی ٦١ وتویە کە شای مادەکان لەگەڵ ٢٢ نەفەر چونەتە پابوسی پادشای ئاشوور و سوێندیان بوو شای ئاشوور خواردووە کە باج و مالیات ساڵانە وە هەر ساڵ بە زیادترین ئەندازە باج بۆ شای ئاشوور بنێرن ئەم نوسەرە بۆ هیچ سەر چاوەیْ لەو بابەتەوە ئاماژی نەکردوە.

قەومی کورد بە چەن جۆر لە تەوراتدا باسی کراوە وەک (چوومەر) گوتی کاردوخ[١] تەنیا گەلی کورد لە دەوری مادەکان و حکومەتی ئاژدەهاک (ئازیدیهاک) توشی

---

١ ـ ناوی لەباری نەبوە و ئێران هەر بە هۆزە پێشویەکانی کوردەوە ناسراوە.

روخاندن بووە ئەویش بە پیلان و فێڵ ئەگینا تا ئەو سەردەمە هەر حکومەتێ هاتبێتە سەر کار لە ئێران فەرمانرەواکانی کورد بوون. هەر چەند گەلێک جار ئاسور و سەکایەکان ئەسبی خۆیان لە خاکی ئێران تاو داوە بەڵام نەیانتوانیوە وڵاتی ئێران و کورد بە حکومەتی خۆیان دابنێن. بە یەک گرتنی هۆزەکانی کورد توانیان لە ماوەی چەند ساڵێک ئەو دوقەومە (سەکای و ئاشور) تاڵان کەر و چەپاو گەرە لە ناوبەرن. لێرەدا بڕێک لە مێژوونووسەکان دەڵێن تیرە ئاریایەکان بە سەرکردایەتی هوخشتەرە حکومەتی ئاسوریان لە ناو بردوە ئەگەرچی سەکایەکان کە لە پشت کێوی قەفقازەوە بەرەو بوونتەوە ئەوانیش بە ماوەی ۲۸ ساڵ لە خاکی ئیران ژیاون تەنیا ژیواری خۆیان لە رێگای تاڵان و دزیەوە ئەبردە سەر. بڕێک لە مێژوونووسان دەڵێن حکومەتی جیایان لە ناو خاکی ماد پێک هێناوە بەڵام هیچ بەڵگەی مێژووی بە دەستەوە نیە.

بڕێکتر لەو مێژوونووسان بە «سیسەکان» ناویان ئەبەن کە ئەمە بە بیروڕای زۆربەی مێژوونووسانی تر بە هەڵەی ئەزانن. لە سەردەمی حکومەتی فرورتیش کە لە ساڵی ۶۵۵ تا ۶۳۳ فەرمانڕەوای پارسی و مادی کردووە دەڵێن لە شەڕ لەگەڵ ئاشوریەکان کوژراوە و شوێن و مەیدانی ئەو جەنگە بە هەولێر ناو ئەبەن.

کوڕەکەی[1] فروتیش لە کوشتنی باوکیەوە دەرسی گرت ئەم جارە ئەو بە شێوەی پارتیزانی ڕەخنەی کردە ناو قەڵای ئاشوریەکان. فەرمانڕەوایی ماد (فرورتیش) لەو سەردەمەدا تەواوی کوردوستانی ئەمڕۆ و وڵاتی پارس و بەشێ لە ئێراقی ئەمڕۆ و تا

---

۱- مەبەست لە کوڕی هوخشتەرە.

چۆمی هالیس و دەریاری خەزەر و خوزستان بووە. وڵاتە دراوسیەکانیش زۆر لێی ئەترسان. ئەگەرچی ماوەی حکومەتی ماد زیاتر لە ٦٠ ساڵ نەبوە بەڵام لەم ماوە کورتەدا ئێران تا ڕادەیەک پێشکەوتوو بووە لە بارەێ پەرەپێدان بە کەشاوەرزی و مەڕر و ماڵات و ڕەواجی سکەی ماد و هەروەها کەشفی نەوت لە وڵاتە دراوسیەکان. بە نەوتیان وتووە قیری مادی. لەم ماوەدا ئێران لە دەوڵەمەندی ناوبانگی دەرکرد کە پاش روخاندنی ئەو حکومەتە تا ئێستا ئیتر ئێران قەد حکومەتی وای بە خۆیەوە نەدیوە.

بەداخەوە بڕێک لە مێژوونووسان تاوانی روخاندنی ئەو حکومەتە ئەخەنە کەمتەرخەمی و تەمەڵ بوونی جەنگەریەکانی ماد کە مادەکان پاش سەرکەوتنی بە سەر ئاشوور و لیدیە ئیتر شەڕیان نەکرد. بەڵام سەرچاوە متمانەکان ئەڵێن بە هۆی خەیانەتی وەزیرەکەی ئاژیدهاک، بە ناوی هارکپاک بووە و دەستی چەپەڵی بڕێک لە کاربەدەستانی لە ناو ئەو حکومەتە بووەتە هوێ روخاندن و بەو جۆرە لە پێشدا باس کرا نیە[1]. پارسەکان تا پاش زاڵ بوونیان بە سەر مادەکان تا ئەوساتە پادشایان نەبووە. جل و بەرگی شای مادەکانیان لە بەر کردووە و هەروەها چۆنیەتی حکومەتداری کە چۆن ئایینی و یاسای لەو وڵاتە بە دەرەوە بچێت و دوای روخاندنی دەوڵەتی ماد تا نیوقەڕن هەر حکومەتی پارسیان بە ناو مادەکانەوە ئەناسی و پاش ئەو روخاندنە ئیتر تیرەکانی ماد هەر یەکێ لە پارچە موڵکی خۆی بە شیوەی سەربەخۆ ئەژیان و کەمتر چونەتە ژێر رکێفی پارسەکانەوە و لە گەڵ پارسەکان شەڕیشیان نەکرد تا داریوش گەورە لەشکری

---

١- مەبەست لە تەمەڵ بوون.

بەرەو دامرکانی وڵاتی ماد کە بە شێوەی جیاجیا ئەژیان هەمووی بە یەک کرد و حاکمەکانی لە پارسەکان دانا. بەڵام دیسان زۆری نەخایاند کە سەریان بە شۆڕش هەڵدا و تا هاتنە سەر کار خەشایارشا درێژەی بووە و هیچ کاتێ دەوڵەتی پارسی نەیتوانی قودرەت و دەسەڵاتی خۆی لە خۆرئاوای ئێرانی گەورە سەقامگیر بکات.

لە دەورەی ساسانیەکانیش کورد لە ئەسرێکی باشدا بووە و بە شێوەی فەرمانڕەوایی ژیاوە چۆن پەیتەختی ساسانیەکان لە «قرقرمیسین» (کرماشان) بووە و بیروڕای برێک لە مێژوونووسان وایە کە ساسانیەکان کورد بوون و زۆر بە راستیشەوە نزیکە.

برێکتر لە مێژوونووسە ئێرانیەکان بە پارت، پارسیان دایان ناوە و لە سەر چاوە ئەجنەبیەکان کەڵکیان وەرگرتووە. بەڵام نووسەرە کوردەکان بە کورد ئەم حکومەتەیان ناو بردووە و بەهرامچوبێن - کە ئیتر هیچ شەک و گومانێک بۆ کورد بوونی نامێنێتەوە - ئەم پادشاکوردە رەنگە پەیتەختەکەی گواستبێتەوە بۆ ئازەربایگان و زۆر ئازا و دلێر و جوامێر بووە و ناو بانگی لەو سەردەمە دەرکردووە. لە ئێران و وڵاتە دراوسێکانی ئێران و برێک لە پادشاکانیتری ئێرانی هەر لە سەر پیادە کردنی یاسای حکومەتی ئەو پادشا رۆیشتوون و ئەم شازادە یانێ بەهرامچوبێن لە گەڵ خانتورکدا بە شەڕ هاتوە و خانتورک شکستی خواردووە و بە دیلگیراوە. ئەو سەرکەوتنە بووە هۆی ناو بانگی لە دەور و بەری دراوسیەکان. ترس کەوتە گیانی روومیەکان چونکا کەل و پەلی جەنگی زۆر لەو شەڕە بە دەستی سۆپای بەهرام کەوت کە بەهرام برێکی بەخشی بە هورموز کوڕی نوشیروان شای بە ناو بانگ کە لە دادپەروەریدا بە ئەنەوشیرەوان دادگەر بە ناو بانگە. بە

داخەوە برێک لە نوسەرە مەزهەبیەکانی ئێران بە برێک قسەی دەست هەڵبەست ئەو دادپەوریانەی نوشیروانیانیشیان کەم رەنگ کردووەتەوە.

ئەگەر چی هورموز کوڕ نوشیروان لە بەهرام زۆر ئەترسا ناردی بۆ شەڕی رووم و لەو شەڕە شکا، بەڵام هورموز لە بەر ئەوەی کە تەواوی ئێران سەر بە بەهرام چوبین نەبن. ئەوکارەی کردووە یانێ هورموز بۆ خاڵدار کردنی ناو بانگی بەهرام برێک شەخڵی ژنانەی بۆ بەهرام ناردبو، کە تۆ ئەم شکستە بوەتە هۆی ئەوە ئیتر خۆت بگۆڕی و جلی ژنانە لەبەر بکەی.

بەهرام و لەشکری بەهرام زۆر لەو کارەی هورموز دلگیر بوون و بو بە هۆی هەڵ کردنی شبەڕ لە نێوان بەهرام و هورموز. چۆن هورموز زانی کارەکەی ناشایستە لە روی کینە و حەسوودی بووە و دەرکەوت کە هورموز بەهرامی تایبەتی بۆ ئەو شەڕە هەناردووە کە لەوێ بکوژرێت. لەشکری بەهرام بەرەو تیسفون و قرقرمیسین (کرماشان) ئەمڕۆ کەوتە رێ و هورموز کە خەبەری پێ گەیشت زانی کە پیلانەکان و کارە نابارەکەی سزای زۆرە هەڵات و بە دەستی دەرباریەکان کە خەیانەتی زۆریان لێ دیبو قۆڵبەست کراو بەر لەوەی بەهرام بە تیسفوون بگات هەر ئەو دەرباریانە کوشتیان و بەهرام لە سەر تەختی شای تەواوی ئێران دانیشت.

خەسرەوپەروێز پەنای بردە رۆم و بە لەشکری رۆمی بەرە و ئازەربایگان کەوتە رێ و ئاژاوڵەی خستە ناوچەی ئازەربایگان و بڵێسەی شەڕ تەواوی ئێرانی گرت. بە تایبەت کوردستان. و شەڕ کەوتە نێو ئێران و رۆم لەم شەرەدا هیچ کام لەو دو بەرە بەسەر یەکدا

زاڵ نەبوون و ئاخری پەیمانی سوڵح و ئاشتی‌یان مور کرد.

لە کوتای‌دا بە جۆرێ مێژووی دە هەزار ساڵەی ئێران باس ئەکات لە کاتی شکاردا لە زق ئاوێک بەهرام نوقمەسار ئەبێت. هێشتا جیاوازی مەرگی بەهرام لە نێوان مێژوونووساندا هەیە. هەرکامیان بیروڕایان بە جۆرێک دەربڕیوە کەیەک ناگرێتەوە.

لە هیچ دەوریکی رۆژگاریێ ئێراندا کورد تا ساڵی ٢٢٦ ـ ٦٣٢ زاینی لە کاتی حکومەتی ساسانیەکان لەگەڵ رۆم‌دا روبەرو شەڕیان نەکردووە و زۆر جار سەر ئەکەوتن و جارجارێکیش ژێر ئەکەوتن و زۆرجاریش ئازاد و سەربەخۆ بوون تا هاتنی ئیسلام، لە کاتی هاتنی ئیسلام شەڕ نێوان ئێران ئاهورایی و ئیسلام دەرکەوت کە کورد بەشی زۆری لەشکری ساسانی پێک هێنابوو. ساسانیەکان لە پشتیوانی گەرم و گوڕی کورددا قایم بوون و چونکا دینی ئیسلام لە خۆرنیشنی ئێرانەوە سوپای بەرەو ئێران رویان هاورد لەو ئەسرەدا کورد رەوڵی بێ‌وینەی لە خۆی نیشاندا. تا کوردەکان دینی ئیسلامیان قەبوڵ نەکرد سوپای ئیسلام تووشی گیروگرفتی زۆر بوو و کۆسپێکی گەورەی لە بەردا بوو. بە قەبوڵ کردنی دینی ئیسلام، ئیتر گرتنی ئێران بۆ سوپای ئیسلام زۆر هاسان بوو بەڵام شەڕی نێوان کورد و سوپای ئیسلام بە کوشتو کوشتاری زۆرەوە لە هەردو لایان تەواو بوو بە جۆرێک هەشت جار لە ئێران نێوان سوپای ئیسلام و گشتی ئێران شەڕی دژوار روی داوە. بۆ جاری ئاخر خەڵکی ئێران کە ئیسلام هیرشی هاورد و بە سەرکردایەتی ئومەر پاش کوشتارێکی زۆر و سووتاندنی کتێبە ئاینیەکانی ئێران و هەروەها کتێبە مێژوویەکان و کتێبی ئەستێرەناسی کە لەو سەردەمە لە ئیلمی ئەستیرە شناسی و نجوم و تەلسم و

گرینک‌ترین سەر چاوەکانی ئێرانی سوتاون وجاخی فەرهەنگی ئێرانی یانی درەوش کاوەیەکان کە یەکی لە شانازیەکانی شاهیدی مێژووی ئێران بو سووتێنرا کە بەوکارەساتە وجاخی رووشنی ئێرانیان کوێر کردەوە.

کە چی لەو سەردەمەدا ئەرەب دینی ئیسلامیان قەبوڵ کردبوو هێشتا ئاسەواری بتخانەکانیان مابووە و بە میراتی خۆیان دەزانی بەڵام ئاگرکەدەکانی ئێران کە بە میعماری سەر سوڕهێنەر دروست کرابۆون سوپای ئەرەب هەمووی رۆخاند بەس نەبو، بو چی ئەهرامی سەلاسەی میسریان نەڕۆخاند.

سوپای ئەرەب لە گەنج و خەزینەی ئێران توانیان برسیەتی خۆیان و خێزانیان کە تێرییان بە خویانەوە نەدیبو تێربن و جل و بەرگی تازەش بپۆشن چۆن لە جەنگی ئەرەب ڕەسم وا بووە کە لە شەڕدا هەرکەسێ هەرچێ دەسی بکەوێ هێ خویەتی بویە ئەرەبەکان لە ئێران دێر رۆیشتن دڵنیا نائەبون لێرەدا تەنیا ئاماژە بۆ ناوی هەشت شەر لە نێوان ئەرەب و ئێران ئەکەین.

١ـ شەڕی «دوقار»: لە ساڵی ٦٠٤ تا ٦١٠ ز. لە دەورەی پەرویز شای ئێراندا رویداوە.

٢ ـ شەڕی «زەنجیر»: لە ساڵی ٦٣٢ ز. خالیدبن‌وەلید لە کووەیتەوە بەرەو ئێران لەشکری کێشاوە.

٣ـ شەڕی «پرد»: لە ساڵی ٦٣٢ ز. یەزگرد لەشکری قورسی پێک هێنا و بەرەو شەڕ لە گەڵ سوپای ئیسلام هێرشی کرد. ناوی فەرماندەی لەشکری ئێران فەرۆخ هورمزد بووە کە ڕەنگە لەم شەڕەدا ئێرانیەکان سەرکەوتو بوون چونکە ئەسپ و وشتری ئەرەب بە

دیتنی فیل سڵیان کردوە و ئوبەیدە فەرماندەی لەشکری ئیسلام کەوتوتە ژێر پێی یەکێ لەو فیلانە و بریندار بووە و سوپای ئیسلام ناچار پاشەکشێی کردووە.

٤ ـ شەڕی «بووەیب»: لەم شەڕەدا سوپای ئیسلام بە ڕێک و پێکی و هێزێکی تازەوە بەگژ ئێرانیەکاندا چوە و قەرەبوی شەڕی پردیان کردوەتەوە.

٥ ـ شەڕی «قادسیە»: لەم شەڕە سەرکردەی بە ناو بانگی سوپای ئیسلام بە ناو «سەئد ئبن وەقاس» بوە، بەرەو خاکی ئێران هاتەپێشەوە و ڕۆستەم فەرۆخ هورموز بە ١٢٠ هەزار کەس شەڕکەری ئازاوە چووە بەرامبەری سوپای ئیسلام.لەو شەڕەدا ئێران شکست ئەخوات کە لە مێژوودا ئەم شەڕە بە نەهاتی ئێرانیەکان لە لایەن پانئێرانیەکانەوە ناو ئەبرێ.

(لورەێ سەگ) لەو ئەسرەدا باوی بوە کە ئەگەر سەگ بلورنێ (نوزە) بکات نیشانی نەهاتی و قاتی و قڕی و کوشتار خەبەری داوە یان رووئەدات. لەو شەڕەدا ڕۆستەم خۆی هاوێژتە چۆمی فوراتەوە و یەکێ لە سەحابەکان بە دوایدا چوو پاش گرتنی ڕۆستەمی کوشت و کەللەکەی بە شمشیرەکەی خۆی جیا کردەوە و چو لە سەر تەختی ڕۆستەم دانیشت. ئەم سەحابە ناوی «حەللال ئەبن ئەلقمە» بووە. لەو شەڕە سەروەت و سامانی ئێران بە تاڵان و چەپاو بریلو.لەو شیەڕە سوپای ئیسلام بەرەو «تیسپون» کەوتنە پێشەوە کە پەێتەختی ساسانیەکان بوو. بە هەواڵی پێ گەیشتن یەزدگورد هەڵات. ئەوەش لە بیرنەچێ کە تا ئەو رۆژە ئەرەبەکان زێریان نەدیبوو و نەیاندەناسی و مێژوونووسان لە تاڵانی خەزانەی ئێران ئاجزن.

٦ ـ شەڕی «جلولا»: له ساڵی ٦٣٧ ز. که یەزدگورد به تەمای هاتنەوە دوبارەی له سەرتەختی شایی له کاتی هەڵاتن دەرچوه «حەڵوان» که شارێکی به ناو بانگی کوردستانه. بەخەبەری گەیشینی یەزدگورد، سوپای ئیسلام بەرەو حەلوان کەوته ڕێ. لەم شەڕەداکورد زۆری لێ کوژرا. ئەرەبەکان نزیک به سەد هەزار ئەسپیان برد که مەشهوور به ئەسپی مادی بوون و بای زۆری بوو. مێژووی ئێران باستان لەم بارەوە به وردی باسی کردووه کەکوردەکان تێ گەیشتن ئیسلام دینی نەجاته لەگومڕایی تەسلیم بوون ئەگینا قەد ئەرەب قادر به شکست کورد نەبووه.

٧ ـ شەڕی «ئەهواز»: له ساڵی ٦٤٠ ز. فەرمانڕەوایی ئەو سەردەمەی پارچەێ له ئێران له دەست هورموز بوو. له کوردەکان داوای یارمەتی کرد چون تا ئەوکاته هێشتا تەواوی ئێران به دەستی ئەرەب شکستی نەخواردبو لەشکری گەورەی پێک هێنا که زۆربەیان کوردەکانی ناوچەی کرماشان و هەمەدان و سنه بوون و دیسان شەڕ له نێوان ئێران و ئەرەب داگیرسا و دیسان کوشتارێکی زۆر له هەردو لا کرا که شاهنامەی فیردەوسی باسی ڕەوڵ و نەقشی کورد لەو شەڕە ئەکات. ئەو شەڕە بەگوێرەی نوسینی ئێران باستان و مێژووی ئیسلام نزیک به هەژده مانگ درێژەی بووه و ئاخری ئیسلام سەرکەوتوه و هورمزان به دەستی ئەبووحەفزه کوڕی ئومەر کوژراوە.

٨ ـ شەڕی «نەهاوەند»: له ساڵی ٦٤٢ ز. روی داوە. دیسان کورد ڕەوڵێکی زۆری بووه که یەزدگورد خۆی هانای بردووه بۆ کوردەکان. فەرماندەی لەشکەری ئێران نەفەرێ کورد به ناوی «فیرووزان» به دەستیەوە بووه. فەرماندەی سوپای ئەرەب ناوی «نعمان»

بووە کە فەرماندەری سوپای ئیسلام لەو شەڕەدا ئەکوژریت و خدیفە لە جێی نعمان سەرداری سوپاکە ئەگرێتە ئەستۆ. لەو شەڕەداگەلێک لەکورد لە ناو خویندا تلیاونەتەوە و یەزدگورد خۆی دیسان هەڵات و لە ئاخریش‌داکوژراوە.

ئەرەبەکان بۆیان زۆر بایەخی بوو کە کوردەکان ببن بە ئیسلام چون گرتنی ئێران هاسانتر ئەبێت و بە سەختی توانیان دینی خۆیان بە سەر کوردەکان دا بسەپێنن و پاش ئەوەیٚ کە وڵاتی کوردیان داگیر ئەکرت پاش ماوەیەک دیسان لە دینی ئیسلام حاشایان کرد و ئەچوونەوە سەر ئایینی کوونی خۆیان کە مەزداپەرەست بۆون.

لەم بارەوە لەو سەردەمە یەکیٚ لە شائیرەکانی کورد چەندە پارچە شێعری نووسیوە کە هاوردنی لە ناو ئەم کتێبە بیٚ سود نازانم تا باشتر لە مێژووی کورد بزانین لە بارەی روداوی ئەرەب و ئێران.

کەدەبیژیٚ:

هورمزگان رِمان ئاگران کژان

هوشان شاردەوە، گەڤرە گەڤروەکان

زۆر کار ئەرەب کردنە خاپور

گەنانە پاڵە بەشی شارەزۆر

ژن و کەنیکان وەدیل بەشینا

مەرد ئازاتلینیژ رِوی هەوی نا

رەوشتی زەزتوشت مایەوە بێ کەس
بەزیکانیکا هورموز و هیچ کەس

ئەگەر چی پاش ئەو هەموو شەڕ و کوشتارەگەلی کورد بە مەیلی دەروونی خۆیان ئایینی ئیسلامیان قەبوڵ کرد و بە ئیختیار دینی ناو بانگی دەرکرد ئەگینا قەد ئەرەب نەیدەتوانی ئەو ناوەندە کە کوردی تێدا ئەژیت داگیری بکات چون مێژووی ئیسلام زۆر ڕوونە و لە کتێبەکانی ئیسلامی‌دا زۆر لە جەنگ و کوشتاری ئەرەب و هەروەها شەڕی قورس نێوان ئەرەب و کورد باس کراوە و زۆر جار کوردەکان لە لەشکری ئیسلام تەنگیان هەڵ چنیوە و سوپای ئیسلام شکەستی نزیک بووە لە کوردستاندا.

ڕەوایەت هەیە کە ئومەر لە خوتبەی نوێژی هەینی بە دەنگی بەرز هاواری کردووە کە «هەی شاریەی کوڕی زینم بۆ کێوی ساریە کێو».

ڕەنگە لەو شەڕەدا شاریە گوێی لێ دەبێ لە بەر ئەوە پشتی داوەتە کێوەکەوە و کوردەکانی شکاندووە کە چی ئێستا ئەو باسە بووەتە گۆچانی دەستی دووئا نووسەکان وا لە غەیبەوە باس دەکەن و دووئاکەیان جگە لە درۆ هیچی تر نیە.[١]

لە کۆتای‌دا ئەبێ بڵێن کە تا کوردەکان پاش نزیک بە هەشت جار شەڕی قورس لە گەڵ سوپای ئیسلام دینی ئیسلامیان قەبوڵ کرد و لە خۆرنشینی ئێرانەوە تا نەهاوەند کە

---

١-لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە کە هیچ کەس غەیب نازانێ جگە لە خوای گەورە نەبێت. هەروەها لە کاتی تەنگانە و یارمەتی‌دا تەنیا لە خوا یارمەتی بخوازن بەڵام ئێستاش برێک هەر لە شیخ و... هاوار ئەکەن.

کوردی تێدا بوو بە دژواری و کوشتیارێکی زۆر سوپای ئەرەب توانی ئێران بگرێ. بەڵام لە مەرزی هەمەدان تا ئەوسەری ئێران سوپای ئەرەب بە ئەندازەی شەڕێکی بچووک کە لە گەڵ کورددا کردی لە گەڵ فارسەکاندا نەیکردووە و لە تەواوی سەرتاسەری وڵاتی فارس نیووەی شەڕێ وا کوردەکان لە گەڵ ئەرەبەکان لە دەشتی نەهاوەند کردویانە بەربەرەکانێیان نەبووە ئەویش هەرچێ لە ئێران بو بردیان فارسەکان هیچ تەگەرەیەک بۆ ئەرەب نەبوون. نەک ئەوەی کە لە ئیسلام تێگەیشتوبون بەڵکو لە بەر هێزی ئەرەب و ترسنۆکی فارسەکان بووە.

لە پەڕەی ٨ فتوح‌البلدان بەشی تایبەت بە ئێران هاتوە کە لەشکری ئیسلام هات و خالێد لەکاتی گردنی وڵاتی پارسەکان، لە خۆیانەوە بەربەرەکانێیان نیشان نەداوە. ئەگەر پارسەکان وەک کوردەکان لە خۆیانەوە هەڵ ویستیان نیشان بدایەت مەحاڵ بوو کە تازیەکان ئاوا بە سوک و هاسانی ئێران بگرن و لەشکری پارسەکان بە بێ شەڕ هەڵ هاتن. لێرەدا باش وایە ئاماژەیێ بۆ قەڵای «هەمەدان» بکرێت. لە زاری تازیەکان ١٣٥٠ ساڵ پیش بە قەڵاکانی ئێرانیان وتووە «مازەران» کە مەبەست لە قەڵاکەی مادەکان بووە. بەداخەوە ئێستا بڕێک مێژوونووس دەڵێن کە پەیتەختی هەوەڵین مادەکان زێویەی «زیڤا» سەقز بووە لە کاتیکدا ئەم باوەڕە بەتاڵە چۆن هەروەها لەو سەردەمە لە زبانی ئەرەبەکان وتراوە «قەڵای مازەران مادەکان» کە وا بو لە مێژووەهەر هەمەدان (هگمەتان) قەڵای بنەچەی مادەکان مەشهوور بووە. من لە سەر ئەوە نیم کەگەلی کورد لە ئایینی ئیسلام کینە و ڕق تورەیان بووە بەڵام تا ئەو کاتە ئایینی ئیسلامیان نەناسیبوو بەرانبەری وەستان.

هەرکە ئاشنایەتیان بە ئیسلام پەیدا کرد خۆیان دەستە دەستە دینی یەگانەو راستەقینەیان قەبوڵ کرد. تەنانەت بە «ئیختیارەدینی» گەلی کورد ناویان دەر کرد. یەکێ تر لەو باوەڕانە کە کورد بە دینی ئیسلام ئیمانی هێنا لە بەر زۆر و زوڵمی خەسرەوپەرویز بوو و هەروەها یەزگورد کە ماوەی حەوت ساڵ پێنج کەسیان لە شاکان ساسانی هەر یەک بە جورێک لە ناو چوون. ئەم گۆڕانکاری و ڕوخاندنی حکومەتەکانی ساسانی لە بەر ئەوە بوە کە توانای سەرۆکایەتیان نەبوە تەنیا لەبیر کەیف و خۆشی خۆیان بوون.

لێرەدا مەبەست لەوەیە کە قەومی کورد بە بێ هیچ هۆیەک هیچ قەبوڵ ناکەن و دین نامۆ قەبوڵ ناکەن. لە بەرامبەر بە حەق و حەقانیەت زوو تەسلیم ئەبن و دێر بە زۆرەملی حەق قەبوڵ ئەکەن بە زۆرەملێ بەگەلی کورد هیچ شتێ داناسەپێنرێ مەگەر بە نەرمی مەسەلەکە قەبووڵ بکەن و دینی ئیسلامیان بە مەیلی خۆیان ئاخری قەبووڵ کردووە. لە هێرشی وێرانی و تاڵانی ئەرەبەکان لە خۆیان هەڵوێستان نیشانداوە بەڵام بە حەقیقەتی دینی ئیسلام پەی‌یان بردووە.

ئەرەبەکانیش بۆیان دەر کەوت کە بە زۆر و زەبر لە گەڵ کورددا بۆ داسەپاندنی دینی ئیسلام کارێ بە پێشەوە ناچێ جگە لە خوێن رژتن نەبێت و کوشتاری دوولایەنە و تەسلیمی ئێران بە نەزم و مەیلی کوردەوە پەیوەندی بو چۆن هەر کوردەکان بە ئایینی ئیسلام باوەڕ و ئیمانیان هاورد و پەیتا پەیتا لە شارەکانی ئێرانەوە بەرەوپیری دینی ئیسلام ئەهاتن. لە زۆرەملی ئەرەبەکان نا بێ کەس شک بکات من قەستی خەراپ کردنی سەحابەکانی سەدری ئیسلامم نیە و هیوا دارم خوێنەرەکان بەو گومانە بیر نەکەنەوە،

بەڵام ئەرەبەکان لە بەر سۆزی هەستیّوا بە ئیسلام بویان ڕایان وابوو کە هەرکەند و کۆسپێ لە بەر پەرەپێدان دینی ئیسلام هەیە نابوودی بکەن و وایشیان کرد. وێران کردنی ئاگرکەدەکان و کاخ و بارگاکان کە ئێستا تەنیا ئاسەوارەکەیان ماوە شاهیدی ئەم ئێدەئایەیە. ئیتر کتێب سووتاندنی نەیشاپوور بە جێگەیّخۆی.

کاتێ کەگەلی کورد دینی ئیسلامی بە دڵ وگیان قەبوڵ کردوە یان ڕەنگە سەدان ئەولیا و ئولەمای ئایینی بە ناوبانگی لە ناو کورددا هەڵ کەوتووە و دواجار بۆ بەڕێوە بەردنی فەرزەکانی ئیسلام و سونەتەکانی ئیسلام گەلێ لە خۆبوردنیان لە خۆیان نیشاندداوە.

ئەوەی کە دەستوری خودای گەورە بێت بەجێیان هێناوە وەک ئەوە ئیسلام مەرزی دیاری کراوی نیە و کوردی بەو مەرجەی کە ئیسلام دایناوبو بەجێی هێنا کە چی هەر ئەوانەی وا خۆیان بە ئیسلام دانا لە گەڵ ئائینی ئیسلام درۆیان کرد.

لە نێوان ئەرەبەکاندا هەر دوو یا چەند ملوێن کەسی بۆ خۆی حکومەتی سەربەخۆی داناوە کەچی کوردستان بە ئەندازەی چەند وڵاتی ئەرەب سەرزەوینی هەیە بەڵام بێ حکومەت و بێ سنووره و ئوسمانیەکان کە لەو سەردەمەدا بە ناوی درێژە پێ دەری خەلافەت بوون، نیوەی کوردستانیان دا بە دەم سەرزەوینی خۆیانەوە. هەروەها ئەرەبەکانیش خاکی کوردستانیان خەسب کرد و لە ئێرانیان دابرکرد. ئایا ئەگەر کورد یەکێ وەک سەلاحەدینی لێ هەڵکەوت نەیدەتوانی ئەو هەمووی وڵاتەی وا داگیری کرد بیکات بە جوگرافیای کوردستان و حکومەتی کوردی لێ درووست بکات؟

لێرەدا من مەبەستم لە چارەی ئێرانە کە تا ئەوکاتە وا لە پاش هاتنی ئایینی ئیسلامیش

چۆن گرێی بە چارەی کوردەوە خواردەووە و کورد و مێژو و ئێران ئەبێ لە مێژووی کوردستانەوە بزانرێ و روون ببێتەوە. چۆن مادەکان لە شەرقی ئێرانەوە (قەفقاز) هاتوون و وردە وردە بەرەو رۆژئاوای ئێران هاتوون بەرەو شیوێن و ماوای قەوم و نژادی خۆیان یانێ کەژ و کێوی و شار و دێهاتی ئێران. هێشتا هەر ناوە کوردیەکەی ماوە بۆ نموونە کێوی بە ناو بانگی ئێران «ئەلبورز» (البرز) هەر کێوی «بەرزە» کە ئەرەبەکان لە کاتی دەسەڵات داریان «ئەل»یان پێ زیاد کردووە بوەتە ئەلبورز کە ئێستا بە هۆی سادە بونیەوە بوەتە «البرز» و «ئاوەج» کە دیسان ئەرەبەکان «ج»یان پێ زیاد کردووە کە «ئاوە» بووە. «کەرەج» کە ئەویش «ج»ی پێ زیاد بووە، «کازپین» «قەزوێن» و «مازندەران» «مادزادەکان» بووە وە «خۆرئاوسان» مەبەست لە «خۆر ئاواس». چۆن خۆر لە مەشرق ئێرانەوە دێتە دەر «خۆرئاواس» بووەتە «خۆراسان». بائیسی جیاوازی ئێران لە کوردستان تا سەردەمی حکومەتی «کواکسار» باوە گەوەرێ کۆرشی پارسی کە بە جاسووسی هارپاک وەزیری کواکسار و لەولاوە بە هاندانی پارسەکان کۆرش کە لە زبەی شای مادەکانەوە نامەیکی نووسی کە من ئەمەوێ پارسی بوو دایم نەمێنی و پەرت و پەلابن. بەم حیلە کۆرش توانی لە سادەیی سەرۆکە پارسەکان کەڵک وەر بگرێت و سوپای پارسی پێک هێنا و لەژێرەوە لەگەڵ هارپاک دەستی بە یەک کرد و توانی حکومەتی ماد لە ناو بەرێ،[1] بەڵام لە پاشی رۆخانی حکومەتی ماد کۆرش لە ترسی یونانیەکان و

---

١- تا ئەو سەردەمە هەر ناوێ لە پارس و پارت و ماد نەبوە و تەنیا بە ئاریان (ئێران) نـاوبراوە. رەنگە ئەو هۆزانە بۆ جیاوازی هاتبێتە ناو ئێرانیەکان. تا ئەوساتە هەر ئێرانی گەورە ناوی بـووە

لودیەکان ناوی حکومەتەکەی نا بە پارسی و مادی تا بە بیستنی ماد یونانیەکان و وڵاتە دەرهاوسیەکان بترسن و چاویان بوو ئێران شۆڕ نەکەنەوە و زۆربەی فەرماندەرەکانی لەشکری پارسی مادی بوون و فەرمانڕەوای وڵاتی ماد هەر لە خۆیان (ماد) بوون. ئێران باستان لەم بارەوە کە فەرماندەرەکانی ماد لە شەڕەکانی کۆرش چ گیانبازی و قارەمانەتییێکیان لە خۆیان نیشان داووە باسی کردووە و کۆرش بەرگی شای مادەکانی پۆشی، چۆن تا ئەو سەردەمە پارسەکان نە پادشایێکیان بووە و نە جلوبەرگی جوان کە شیاوی پادشا بێت. کۆرش هەر رەسم و یاسای حکومەتی مادەکانی کردە سەرمەشقی حکومەتی خۆی و لە زۆربەی گیروگرفت پەنای ئەبردە بەر پیاوە دەرباریەکان کە ماد بوون و ئەوان چارەیان بۆ ئەدۆزیەوە.

جا ئەگەر پارسەکان و پارتەکان لا لە مێژوو بکەنەوە و پەردەی غوروری خۆیان بدڕێنن بۆیان ڕوون و ئاشکرایە کە گەلی کورد بۆ نەجاتی ئێران چ لە بارەی فەرهەنگی و چ لەبارەی سیاسیەوە چ لێبوردنێکی لە خوێ نیشان داوە و بویان دەرئەکەوێت کە مێژووی ئێران ئەبێ لە ناو مێژووی کورد ڕوون بێتەوە.

بەڕاستی ئەگەر کورد نەبوایە ئێستا ئێرانێکیش نەبوو، و ئێران بێ کورد هیچ مانایەک نادات. چەن جار ئاشوریەکان ویستیان خاکی ئێران بە سەرزەوینی خویان پاڵ بدەنەوە کە بەدەستی توانای مادەکان هێزی ئاشوریەکان بە ئاواتی شومی خۆیان نەگەین. ئەسکەندەر کە داخی زۆری لە دڵا بوو کاتێ حکومەت و دەسەڵات بە دەستی

---

پاش ئەو ناکۆکیە بوون بە سێ دەستەوە.

پارسەکانەوە بووە بە هەلی زانی تا قەرەبوی شکستە پێشویەکانی ڕۆم بکاتەوە کە وایشی کرد و ئاخریش هەرکوردەکان چون سولوکیەکانیان ڕاونا بە شپرزەیەوە هەڵاتن و غیرەت و هیمەتی کوردەکان لە دەروونی ئێرانیەکان جووڵاوەتەوە. پاش ماوەیە تاڵانی سەکایەکان لە ئێران، دەرکردنی ئەو قەومە وەحشیە بەدەستی توانای کوردەکانەوە بنەبڕ بوو و تەفرە و تونا بوون و هەروەها بە بۆنەی ئازایەتی توانای ماد دامرکانەوە. سام و هێبەتی ئەو قەومە نەبەزە لە دڵ بێگانەکان بو[1]، و قەد خەوی ڕاحەت لە بەر ترسی کورد چاوی دوژمنە داخ لە دڵەکانی نەچوە. زۆر جار ئەوانەی وا خاکی پاکی ئێرانی کۆن و کانی دین و ئائینیان ئەکردە جێگای ڕەتانبازی و پێشێل کردنی ئەم خاکە و سروشتە جوانە، گەلی کورد دیسان ئەکەوتە گیانیان و بە پەلەقاژە داگیرکەرانی خاکی ئێران هەڵ ئەهاتن. یان فەرماندرە داگیر کەرەکان کە تا ئەوساتەوا قوڵ بەست ئەکریان بەزەییان بە ئێران نەئەهات جگە لەکوشت و بڕۆو تاڵان و ماڵ وێرانی هیچی تریان نەئەپرژاند. ئەوانە کوردەکانیان بە هەوساری ئەسپەکەی خۆیانەوە لە سەر ئاخوڕ ئەبەستەوە تا سزای ئەو تاوانە بدەنەوە.

هەنگاو بە هەنگاو خاک و کەژ و کێوی ئێران خوێنی کوردی پێدا تکاوە بۆیە کورد ئێستا بە چاوی برایەتی بە برا ئێرانیەکان ئەڕوانن و لە کاتی تەنگانەدا پەنایان ئێرانە، کە ئەگەر تورکیا بە جارێ بیست‌وپێنج هەزارکورد شەهید ئەکات دەڵێی بێگانە هەر بیگانەیە و یان ئێراق لە ماوەی دە چرۆکە ٥ هەزار کورد ئەکات بە چزلیک، دەڵێی دوژمن هەر

---

١- مەبەست لە ماد بوە.

دوژمەنە. بەڵام ئەگەر لە ئێران بە جۆرێک ناکۆکی کەوێتە نێوان کورد و پارس، کورد دەڵێ قەوم گوشت بخوات ئێسقان ناشکێنێ و لە ئێران چاوە نواڕیان زۆرترە و خاکی پارس بە ماڵی هەوەڵی خۆیان دەزانن. ئێمە ئەگەر لە هەر دەورو رۆژگارێک کە نێوان پارس کوشت و کوشتاریش روی دابێت و کوردیان فروشتووە بە بێگانەکان بە حیسابی پارسەکان داینانێین چۆن حاکمەکانی ئێران زۆربەیان خەڵکی نەبوون و بە شێوەی دیکتاتۆر بوون ئەگینا ئەگەر پارسەکان ئەوانەی وا دەزانن کورد و پارسی لە ڕیشەدا یەکن وگیانبازیەکانی کوردیان لە مێژوودا بۆ ئازاد کردنی ئێران وا کردویانە قەد دڵی ئەوەیان نایێت کە کورد بفرۆشن بە وڵاتی بێگانەکان و هیچکات بە تانک و تۆپ و گوللەی مەترەڵۆز وڵامی مافی ڕەوای کورد نادەنەوە و داخوازیەکانی کورد ئەنێنە سەر چاویان کە ئەویش تەنیا برایەتییەکە لەگەڵ ئێراندا.

لە کتێبی فەرهەنگی ئێران باستان نووسینی ئوستاد پووڕداود لە لاپەڕەی ٤٢ دا هاتووە کە مەهاباد ڕەنگە بە «هوشەنگ ئازەر» بێت.

لە دەساتیردا - کە کتێبی کۆنی ئایینی ئێرانیە - دیسان ئوستاد پووڕداود لێ دواوە لە و سەر ئەم باوەڕە بووە کە مەهاباد پەیغمبەر بووە و خوای گەورەی پەرستش کردووە و لە خوای گەورەی پرسیوە کە هۆی چیە وا شاکان و مەردم تووشی ڕەنج ئەبن.

مەزدا فەرمویە کە ئەوانە لە دنیای ئاخردا ڕۆحەکانیان ئەچێتە لاشەی جانەوەرانەوە وەک سەگ (سپوڵوەت) و کەرو ڕێوی و گورگ و... ئەو حەیوانە بارکێشانە مەردمانێکن کە سزای کردەوەکانی خراپەی دنیای ڕۆشن خۆیان ئەدەنە دەس.

ئه‌م باسه لێره‌دا زۆر به ڕاستیه‌وه نزیکه چون ئێستا هه‌ر ئایینی ئه‌هلی‌حه‌ق ئه‌م باوه‌ڕه‌یان هه‌یه که ئه‌گه‌ر مرۆڤی له‌م دنیا بۆ خه‌ڵک زه‌ره‌ر و زیانی بێت و هه‌روه‌ها زوڵم و زۆر کات، ڕۆحی ئه‌چێته لاشه‌ی جانه‌وه‌رانه‌وه تا سزای ئه‌و کرده‌وه خرابانه‌ی بداته‌وه و هه‌روه‌ها پیاوه چاکانیش دیسان ڕۆحیان ئه‌چێته لاشه‌ی مرۆڤ. ئه‌م باوه‌ڕه له کتێبی «ارتباط با ارواح» نووسینی «آلان کاردک» پێ ئاماژه کراوه.

پێویسته ئه‌وه‌مان له بیر نه‌چێت که «مه‌لافیروز» زه‌نگه‌نه له سه‌ر ئه‌م باوه‌ڕه بوو و خۆیشی مه‌لا فیروز ئایینی ئه‌هلی حه‌ق بوو بۆیه ئه‌توانین بڵێین بێ‌شک کوردستان لانکی ته‌مه‌دون و فه‌رهه‌نگ و کانی ئائین و دین بووه که‌چی به پێی تێپه‌ڕبونی زه‌مان و ڕۆژگاره‌وه گوڕانکاری به سه‌ر ئه‌م ناوچه هاتووه. به‌ڵام ئه‌و باوه‌ڕه ناسه‌لمێنێ که به‌رله‌وه ئاریایه کان بێن قه‌ومه کانی تر وه ک گوتیه کان وکاسیه کان و لولوبیه کان له کوردستان بوون.

بیروڕایه‌کی جیاواز له‌باره‌ی ڕه‌گه‌ز و زوانی کوردیه‌وه هه‌یه بڕێک به کوێرکوێرانه هاتوون کوردیان له چه‌ند ڕه‌گه‌زی جیاواز زانیوه و بڕێک‌تر هه‌ر ئه‌و بیرو ڕایان به‌بێ هۆی ئیلمی هه‌ر ئه‌وانه‌یان هاوردوه نێو کتێبه‌کانی خۆیان و خۆیانیش به قه‌ڵه‌م به‌ده‌ست و مێژووناس زانیوه به‌ڵام هێندێ به توڕه‌یی ئه‌وانه‌یان به‌تاڵ کردووه‌ته‌وه و به ده‌لیل و بورهان گه‌لی کوردیان به یه‌ک ڕه‌گه‌ز و نه‌ژارد زانیوه.

زانایانی کورد ڕایان له سه‌ر ئه‌وه بووه که زمانی کوردی به‌پێی ئه‌وه که له سه‌ره‌تای هاتنی زوان پێ‌دواندن کورد له ناوچه کانی کوێستان ژیاون و له به‌ر ئه‌وه به هه‌ر شێوه‌یه‌ک له سه‌ر هه‌ر شتێ یان هه‌ر بابه‌تێ له به‌ریانی ئاده‌میزاده‌وه که‌م یا زۆر هه‌ر بووه، هێشتا

پاراستوویانە و بە هۆی دەوڵەمەندی زمانی کوردی و لق و پۆی ئەو زمانە کە بڕێک لە وڵاتە دراوسیەکان کورد لە وشە کوردیەکان کەڵکیان وەرگرتووە و دەیان پیت واژەیان لە ئەوان هاوردوە کە لە ریشەدا کوردین.

هەروەها بە هۆی ئەوەی کە زمانی کوردی هەر ئەو زمانەیە کە ئاڤێستا پێی نووسراوەتەوە و بە هۆی ئەوەش گەلانی ئێران وا ئایینی زەرتوشتیان قەبوڵ کردووە و پاش ئەو دینە بەرو هێندە ڕوی کردوە کە بە شێوەی کوردی کۆن بۆ فێر کردن چووە ناو زمانی دراوسیەکان بەڵام بڕێک نووسەر بۆ ژێرخستنی فەرهەنگ و مێژووی کورد لەم جیاوازیە بڕێک لە زاراوەکانی کوردی بە شێوەیەک بی خۆ گەورەیان کردووە تا بە شێوەێ نێوان کورد نیفاق ببێ. بەڵام هەروەها کە روون و ئاشکرایە زاراوەی کوردی لە یەک خێزان و بنەماڵەیەو هەر لە سەر تا سەری کوردستان هەموو خەڵکەکەی یەکێکن لە کاتی ئاخافتن بە تۆزی بیر کردنەوە لە کاتی دواندن تێ دەگەن و کوردی فارسی نەزان قەد بە فارسی ئاخاوتن تێ ناگات، بەڵام بە هەر شێوەیە کوردی قسە کردن تێ ئەگات....؟!

بنەو بنەچەی کورد لە ٨٥٠٠ ساڵ پێش لە کێوەکانی زاگرۆس هەروها بەینولنەهرینەوە ئەمیش هەر قەومەکانی پێشوی کوردن و گوتی، کاسی و هوری مانای ئەمانە هەر کوردەکانی ئەمڕۆژن و لە ئەم خاکە چیای زاگرۆسە، لە بنەرەتدا هەر باپیرەکانی کورد تێدا ژیاون و ئەم قەومانە لە هەر ناوچەیەکدا بۆ خۆیان سەروک و تەخت و هێزو و دەوڵەتیان پێک هێناوە و لە بەرامبەریشیان حکومەتی تر بووە. لەو سەردەمە یانێ ٨٥٠٠ ساڵ تا ٥٠٠٠ ساڵ پێش کەمتر میللەتان و حکومەتان بە ئاشتی ئەژیان و دایم

توشی گێرەوکێشە بوون. بۆ نموونە قەومی ئەکەد وڵاتی سومر داگیر ئەکات، سومریەکان خەت نووسین کە داهێنەری بوون ئەکەدیەکان کەڵکی لێوەر ئەگرن.(سارگون پادشای ئەکەد بووە) و قەومی گوتی وڵاتی سومر لە دەستی ئەکەد دیسان ئەستێنێ و ئەکەدیەکانیش ئەخاتە ژێر رکیفی خۆیانەوە. قەومی گوتی لەکێوەکانی زاگرووس ژیاون. بابل کە شاری گەورە پەیتەختی بابلیەکان بووە و شاکەی حامورابی کە قانوون ئینسانی بۆ یەکەم جار دائەنێ و بە قەوڵی مێژوونووسان کۆنترین دەست نووس و یەکەم قانوونزان حامورابی شای بابل بووە. قەومی کاسی کە لە کێوەکانی زاگرووس ژیاون بەرە بەرە بابل داگیر ئەکەن تاکە قەومی بە نێو میتانی بابل لە دەست کاسیەکان ئەستێنن و قەومێک بە ناو ئاشوور وڵاتی بابل و سومر بە یەک ئەکات و حکومەتی بە هێز پێک دێنن و هەر پادشای ئاشووریەکان بە «رەب‌لنوع»یانێ خوای خۆیان زانیوە و ناوی ئاشوورپانی پاڵ بووە و ئەم حکومەتە بە هێزە پاش چەندسەد ساڵ حکومەت و تاڵان و داگیر کردنی وڵاتەکانی میسر و لیدیە و لودیە و ئێران و تاڵان و ... سەرشای بابل بە زیندوی برین و پێست کەندن و پڕ لە کا کردن بۆ چاوترسێن خەڵک و... ئەم حکومەتە زاڵمە لە ئاخردا بەدەستی هوخشتەرە شای ماد تیائەچێت و زیاتر بەو بۆنەوە قەومی ماد لە سەرەتای مێژووی ئێرانەوە ناوی دەر ئەچێت. هوزەکانی کورد لە خۆر هەڵات تا خۆرنشین خاوەنی بورج و قەڵا و ئەمارەت بووە و لاپەڕەی تاریکی مێژووی ئێران بە بریقەی شەمشێری کورد روون بووەتەوە و هەرلە ناوی ئاوایەکان (گوندەکان) بگرە تا کێوەکان و ناوچەکانی کە لە هەر دەورە و رۆژگاریدا ئەو شوێنە مەکۆی تەخت و بەخت یان ئاگرگا و شوێنەواری روداو

بووە شاهیدی ئەم ئیدەئایەیە.

لولوبیەکان کەکوردەکانی ئەمڕۆژن[1] و زۆربەیان لە لوڕستانن، ئەمانە لەکاتی خۆیاندا حکومەتی بە هێز بوون. لە جێگای خۆی باس‌سی لێ ئەکەین.

بە ناو بانگ‌ترین شای بابلیەکان کە بەخت‌نەسر بووە و هێرشی بابل دژی ئاشوور بەرێ ئەخات و لەو شەڕەدا بابل سەخت شکست ئەخوات.

حکومەتی ئاشووریەکان بە سێ دەستە بەش ئەبن: ١ ـ پێشوویەکان ٢ ـ ناوەراست ٣ ـ تازە. وە نزیک بە پێنج سەدە بە دەسەڵاتداری حکومەتیان کرد.

هەوەڵین شاکەی بە نێوی ئاشوورپانی‌پاڵ‌بووە. دوهەم نێوی شاڵمانزار و سێهەمی تیکلات‌پلاسر. جارێ حکومەتێ بە ناو ئورارتویان ئارارات تەنگ لە ئاشووریەکان هەڵئەچنێ بەڵام شکست ناخوات و لە کاتی هێرشی ئاشور بەرو ئێران فەرماندەرە تا نەهاوەند دێت. پاشان دەچێتە دەماوەند و ئەگەڕێتەوە بە خۆشحاڵی. دەڵێ کە ئاخری دنیامان گرتووە و ئاخری دنیامان بە چەنگ هێنا. حکومەتی ئاشوور تا ڕادەیێک زاڵم بووە کە ئاشوورپانی‌پاڵ لەکتێبەکەی‌دا وتوویە من خاکی ئیلامم بەتوورەکە (توولەکە) کێشا لە مۆسیقی و نەغمە بێ‌بەش بوون و لە حەشەم مەڕو ماڵات گزگم بە جێگای‌داو، بە مار و جانەوەر و دەرەندەکان و بە دەستوری من بەردەکان بیان بەن لەو بیابانە بەرەهوتە بژین.

ئاشووریەکان لە میسریەکان، بابلیەکان، سومریەکان وکەلدانیەکان باجیان سەندووەو هیچ کام لەو حکومەتانە ڕووی ئاسودەیان لە دەستی ئاشووریەکان نەدیوە. دایم لە بەر

---

١ – مەبەست لە لوڕەکانە کە لقێ لە کوردەکانن.

تاڵان و پاماڵی ئاشووریەکان بوون و ئەسپی قودرەت و هێزیان بە توندی و تیژی ڕانیوە بە سەر ئەم حوکومەتانە بەڵام بە دەستی بە هێزی مادی و زەبری سیاسی تەخت و بەختی ئاشوور ئەشێوێ.

لە کتیبی ئاڤێستا دەرئەکەوێت کە بە فەرمانی ئەهورامەزدا هەشت شوێن ئاوەدان ئەکرێتەوە و بریتین‌لە:

١ـ گاوو: بە زمانی ئاڤێستا = دەشت ٢ـ بەلخ ٣ـ ئور ٤ـ ئەورانج ٥ـ ئارياواچ ٦ـ سەئدیا ٧ـ زەنگاو ٨ـ یارنە

مێژوو نووسەکان تا ئێستا شوێنی ٤ جێگایان زانیوە. یەکێکیان بەلخ کە لە کاتی هێرشی مەغولیەکاندا تێک چووە و لە گەڵ خاک یەکسان بووە.

گاوو: ڕەنگە گاوەروو بێت.

سەئیدیا: ئورئانج و... مێژوو نووسەکان بیرو باوەڕیان جیاوازە بۆ ئەو شوێنەوارانە زۆر تەوفیریان هەیە، ئەمانە لێکۆڵینەوەی زۆری ئەوێت هێشتا مێژوونووس ئەو شۆێنەوارانەی دیکەی هەر نەزانیوە و ئەنگوستی بڕیاری لە سەر نەناوە ئەبێ لە کاسە و کۆزە شکاوەکان کەڵک وەر بگرن. لە مێژووی دەهەزار ساڵەی ئێران لە بارەی گوتیەکانەوە دەڵێ ئەم قەومە ژنەکانیان فەرماندرەی جەنگی و بە هێزو بلیمەت بوون و شان بە شانی مێردەکانیان لە گەل دوژمن شەڕیان کردووە.

دارمستر فەرانسەوی لە سەر ئەم باوەڕە سوور بووە کە زوانی ئاڤیستایی هەمان زوانی مادەکانە، کە کوردەکانی ئەمڕۆژن و پێی ئەدوێن. لە زیویەی سەقز خەتی هیروگلیف پەیدا

بووە کە نوسکی لە خەت مادەکان بووە و سەرچاوەکەی لە مادەوە هاتووە. هەمان کتێب مێژووی دەهەزار ساڵە باس ئەکات کە کشت و کاڵ و نەچیر لە مادەکانەوە دەستی پێ کراوە و هەمان سەرچاوە دەڵێ کوورش لە دایکەوە ماد بووە و کوڕی کەمبوجیە دەسەڵاتداری پارسی بووە و بە هاودەستی یەکێ لە ئەمیرەمادەکان هێرش ئەکاتە سەر وڵاتی ماد.

سەرکەردەی سەربازەکانی ماد خۆی تەسلیمی کورش کرد و ئاستیاک ئاخرین پادشای مادی قۆڵبەست کرد. بە جۆرێکتر دەڵێن کە سەرۆکی مادەکان کوڕەکەی هارپاکیان سەر بڕیوە و گۆشتی کوڕەکەی خۆی بە خواردی هارپاک ئەدات، چۆن لەجیاتی ئەوە لە بیابانی بەرەهوتدا بەرەڵای کات ئەیسپێرێتە دەست شوانێ. پاش گەورەبوونی دایکی خۆی پەیدا ئەکات و دایکی کچی ئاستیاک بووە. یانێ کوورش کچەزاێ ئاستیاک بوە.

بە متمانەیەکە ئاستیاک بە هارپاکی بوە هەر هارپاک ئەکاتە سەردەستەی سپای جەنگ لە گەڵ کورش، وەئەویش خۆی و لەشکرەکەی تەسلیم ئەبن. ئاستیاک دەڵێ بریا ئەم کارەت بۆ خۆت کە ماد بویت بکرتبایە یان دانەێ گەورە پیاوی مادت بکردایەتە جێگری من. چۆن من تاوانبار بوم حکومەت و قەومی ماد سوچیان نەبوە بەڵام تۆ کارێکت کرد کە قەومی مادت خستە ژێر دەستی پارس و بۆ هەتاهەتایە قەومی مادت فرۆشت.

ئەگەرچی کورش خۆی بە گوێری نووسینی هێرودت بە بۆنەی خوازبێنی لە

تومیرسی مەلەکەی ماساژت کە لە ئەولای سەیحون ژیاون داوای خوازبێنی و هاوسەری ئەکات و ئەویش بە ڕەشقەنەوە جوابەکەی ئەنێرێتەوە و لە سەر ئەو مەسلە ئاگری شەڕ شەماڵەی بەرز ئەبێتەوە. کورش خۆی لەو جەنگەدا ئەکوژرێت و سەری ئەبڕن و سەری لە ناو خوێنەکەی خۆی ئەبێت. تومیرسی دەڵێ خوێنی خۆت بە دەرخواردی خۆت ئەدەم بەڵام دیسان مێژوو نووسەکان لەم بارەیەوە بیر و ڕایان زۆرە چۆن لە سەرزەوین ئێرانی کۆن گۆڕانکاری زۆر بووە و ئاریایەکان لە دەورە و ڕۆژگاری خۆیاندا بڕێک جار هێندە لە سەرەتای مێژوودا بە گەلێ جۆر ناویان هاتوە و تیکەڵ بە یەک لە بەسەرهاتەکانیان وە یان ئائینی یان کە جیاکردنەوەی هەرکامیان دژوارە. بۆ نمونە مردوو لە ناو ماڵ نیان و دیسان چەند سەد میتر دوورتر پاشان لە سەر لووتکەی کێوی بەرز تا بە خوراکی مەل و باڵدار بێت تا دیسان هەر زیندووبن و نموونەی بێت. بەڵام لە جستەی تردا یان زیوەرئالآت وەک زەڕ و زێو، و بەش کردنی ماڵ و سامانی مردوو و سەروتیان تا بازوبەند شمشێر و قەڵخان و ... هتد لە کنی مردووەکە دایان ناوە ناو گوڕەکە. ئەم باوەرە ڕەوشتە بڕێک لە نوسەرەکان بە سەردەمی هەخامەنش دای ئەنێ هەر چەن ئەو جۆرە مردن ناشتنە زۆر پێشوتر لە سەردەمی هەخامەنش بێت و ئەگەرێتەوە بۆ دەورانی پێش دادیەکان.

کێوەکان زاگرۆس بنەڕەت هۆزە پێشویەکانی کوردن و زۆر کاسە و کووزە و شت لە لای تەرمی مردووەکە کەووتوە دەرەوە کە لە دەورانی ئائینی ڕۆژپەرەستیدا بوە. دواجار بە هاتنی ئاریایەکان پاشان بە سێ دەستەوە ئەبن بەشێکیان بۆ دایم لە کوردستان

ئەمێنێتەوە.[1] بەر لە ئاریاییەکان بڕێک لە هۆزەکانی پێشوو لە ئێرانی گەورەدا باوەڕیان وابووە ئەگەر لە شەڕەکانیان توشی شکست بووایەن، گرتن بتەکان یان قۆڵبەست کردنی شای ئەو وڵاتە بە مانای تەسلیم بوونی ئەو خوایەکە پەرەستویانە بووە و لە شەڕەکان زۆر بایەخیان بە ئەوە بووە و کڕنۆش بردن ئەو شا لە شای دیکە بە مانای خوای دەستەی بە هێزتر لە دەستەی دیکە بووە. ئەم باوەڕە لە فنیقیەکانەوە هاتوەتە وڵاتی گوتیەکان. فنیقیە کە ئەمڕۆ سەرزەوین لوبنانە نەژادی سامی بۆون و لە نزیکی دەریای مەدیتەرانە ژیاون.

قەومی سومر: ئەم قەومە کە نزیک بە ٢ ساڵ پێش زایین لە خۆرئاوای ئێراندا ژیاون و داهێنەری خەت نوسین بوون.[2] پێشکەوتوتر لە دراوسێکانیان بوون و هەروەها زێڕ یەکێ لە پێشە گرینگەکانیان بووە و لە رەگەزی هوریەکانن بەڵام هێندێ دەڵێن سامی بوون و دوکتور جەماڵ رەشید لەم بارەوە بە روونی باسی کردوە و دەڵێ: سومریەکان نە بوون نە سامی و لە کتێبەکانیان خۆیان بە سوباری و هوری ناو بردوە. لە ناو هۆزی مانایەکان و ئورارتویەکاندا تواونەتەوە.

لودیە: هەزار ساڵ پێش زایین ژیاون و نێوی حکومەتەکەش لودیە بووە و سێسەد ساڵ حوکومەتیان کردووە، ناوی شای لودیە «ئالیات» بووە. دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار بوون و تەڵا و سکەیان داهێنا کە سازینی پێشەی لودیەکانە بووە و شاری سارد پیتەختی ئەوان

---

١-بە بیرو رای من ئاریایەکان هەر یەک دەستە بوون بەڵام شێوە زمانیان تۆزی جیاوازی بوە و ماد و پارس و پارت هەر یەکێکن و دەستەی جیاجیا نەبوون. وشەی ئاریای کوردیە = ئاریا ـ ئاریان = ئێران

٢ - دوکتور جەماڵ رەشید لە سەر ئەو باوەرە بوە کە سومریەکان داهێنەری خەت نوسین بوون.

بووە. بەڵام حکومەتی هەخامەنشی چاوی پێ خاین ئەبێت و کۆرش دەوڵەتی لودیە ژێرەوژوور ئەکات.

هیتەکان: لە هەزار و هەشتسەد ساڵ پێش زایین ژیاون و قەومی ئورپێ و هێندی بۆون فەن ئاسن سازییان داهێناوە و لە میسری و سومریەکان قایمیان کردوە. و پێتەخی هیتیەکان «هاتوسا» بووە و لە پلەی بەرزی هێزو دەسەلاتیاندا حکومەتی میتانی ئەشکێنن و ئەوان کۆتایی بە حکومەتی میتانی دێنن. حکومەتی هیتیەکان خۆی بە دەست ئورارتو کە حکومەتی بە هێزتر بووە لە بەێن ئەچێت.

ئورارتو: دەوڵەتێ بە هێز و خاوەن دەسەڵات بووە لە قەراغی دەریاچەی وان حوکومەتیان پێک هێناوە و شاری «توروشپا» پێتەختیان بووە و ئەو شارە یەکەمین قەڵای ئاسنین ئەبێت و زۆر دژێ سەخت و دژواری بووە. بەڵام هێندە درێژەی نابێ و بە هێرشی ماد لە ناو ئەچێت و ماد تێکەڵ بە سەرزەوین خۆی ئەکات.

ئەرمەنیەکان: ئەرمنستان ئەمڕۆژە کە لە دەوروبەر دەریاچەی ورمێ ژیاون لەگەڵ ماد بە یەکێ ئەبن، هەروەها لە جغازەمبیل لە خوزستان تا ئاسەواری کۆن لە ئیلامیەکان پەیدا بووە و ئێستا هێشتا هەر ماوە. هەموو ئەو هۆزانە کە باسمان کرد مێژوویان لە ٥٥٠٠ ساڵ پێش زۆر ناچێ.

---

١-لەم بارەوە وشەی ئورارتو یان ئورارتور بە واتای برێک لە سەرچاوەکان هۆزێ لە ئێرانیەکانن.

به بیروڕای زەرتوشتیەکان یەکەمین شای ئێران کەیومەرس بووە بە ڕای برێکتر یەکێ لە پێغەمبەرەکانە.

پاشان جەمشید شای هەوەڵ ئێران و هێند بووە. ئەگەر چی لە ئێران هۆزەکانی تر وەک لولوبی، گوتی، کاسی، مانایی، هوری و میدی لە خۆرئاوای ئێران کەم و زۆر لە ئێران حکومەتیان کردووە بەڵام لە کاتی هاتنی ئارياييەکان بەرەو ئێران ئەوانیش بە سێ بەشەوە ئەبن کە مادەکان دیسان دێنەوە شوێنی هۆزە پێشویەکانی باپیرانی خۆیان. هۆزە ئاریایەکان بریتین لە: ١ ـ مادەکان ٢ ـ پارسەکان ٣ ـ پارتەکان. کە هەر سێیان یەکێ بوون.[٢]

وە قەومێ بچووک لە پاڵیان ژیاون بەڵام ئەوانیش بە پەی تێ پەڕبوونی زەمانەوە تێکەڵ بەم سێ قەومە ئەبن لە بەر شەڕ و شوڕی قەومی ئاشوور و کەلدانی و ئیلامی، لیدی و لودیە، ئاریایەکان جەنگی پارتیزانی و سوارەکاری و شەمشێربازی فێر ئەبن و ژنانی ئاریای بۆ جەنگ لەگەڵ لیدیەکان بۆ یەکەم جار لەو سەردەمە لەگەڵ پیاوەکانیان لە یەک دەستەدا لەگەڵ دوژمندا شەریان کردوە چوون مێژوو باسی ئەکات.

دیسان لە مێژووی دە هەزار ساڵەی ئێران بۆمان دەرئەکەوێت کە قەومی ئەکەد و بابلیەکان و ئیلامیەکان و کەلدانیەکان هەموویان لەگەڵ گوتییەکان و کاسیەکان و هوری و ماد هەرکام لە دەورەی خۆیدا بۆ ماوەێ درێژ بە ئاشتی ژیاون و برێک لە حکومەتەکان

---

٢-بە داخەوە سەرچاوە کتێبە مێژویەکانی ئێرانیش هەر لە بێگانەوە کەڵکیان وەرگردوە و مەبەست لە جیاکردنی ئاریایەکان رەنگە دەست هەڵبەست بێت و سێ دەستە نەبوون، یەک پارچە بوون.رەنگە بۆنیفاق وایان نوسیبێ.

وەک ئاشور و بابل و ئیلام بە دەستی هۆزە پێشوەکانی ئێران لە بەین چوون و شاری «ئور» لە «بەین‌النەهرین» پێتەختی حکومەتی مادی گەورە بووە. کوردی ئەمرۆ شێری مێژوو ناوی لێ‌نراوە. نە لە سەر سفرەی دوورووییدا نان و نمەکی خواردووە، نە بە مل شۆڕی نانی پەیدا کردووە.

بە شیری پاکی کوردی گۆچ کراوین

لە خاکی پاکی کورددا ڕواوین

٭ ٭ ٭

لە بارەی «توس‌نەوزەر» یان «توش‌نەوزەر» سنەوە، کە جەنگێ لە لایەن ئێران و تورانە و ڕوو ئەدات، نەوزەر یەکێ لە جەنگاوەرە ناودارەکانی ئێران بووە و توس هەوەڵ جار لەگەڵ ئەفراسیاو بە جەنگ دێت بە باوەڕێک دەتوانین لە کێوەکانی نزیک سنە کە بە ناوی توس‌نەوزەر بووە و گرسیوز کە پیاوی فیتنە و بەخێڵ بووە و برای ئەفراسیاو بووە و لە شەڕێ کە لە قەراخی دەریاچەی چیچێست یا دەریاچەی ورمێ بە دەستی کەیخەسرەو ئەکوژرێت و ئەو کارەساتە قەد لە بیر ئێرانیەکان نەچووە کە خوێنی سیاوەش ئێستاش ئەگەر کارێ دەنگ بداتەوە دەڵێن بووە حەکایەت خوێنەکەی سیاوەحشەوە. برای‌تری ئەفراسیاو کە زۆر دڵ نەرم و بە رەحم و بەزەی بووە ناوی «ئەغزەڕیس» بووە و ئێرانیەکانی بە پەنامەکی ئازاد کردەوە. بەداخەوە ئەم پیاوە دڵ نەرمە دوو کوڕی بووە و کاتێ کە ئەفراسیاو بە کارە پەنامەکی ئەغزەڕیس ئەزانێ ئەی‌کوژێت. ئەفراسیاو و ئەغزەڕیس و گریسوز هەر سێ‌یان کوڕ پەشنگ کوڕ تور بوون کە تور کوڕ

فەریدون بووە.

لە ناوچەی بەختیاری شوێنەوارێکی دەهەزار ساڵە بەرچاو ئەکەوێت لە غاری پیدە وسایلی کەل و پەلی پێوستی کاری ڕۆژانەی خۆیان وەک تەوەر و خەنجەر و ... دروستیان کردووە. قەومی کاسیەکانیش لە کێوەکانی کوردستانی ئێستا ژیاون کەوا دیارە کوردستان کۆنترین شوێنی ژیانی ئێرانیەکان بووە و کۆنترین نەتەوەی ئاریایی پاش پێکهاتنی حکومەتی مادە. ئەم کوردستانە لە پێش‌دا پێتەختی چەندین حکومەتی‌تر وەک لولویەکان، گوتیەکان، کاسیەکان، کاکەوەندیەکان، ساسانیەکان و هەروەها ئورارتویەکان و... ماد کە بە هێزترین حکومەت بوون.

ئاریەکان دوژمنانی خۆیان دێو زانیوە بە جۆرێک کە لە گەڵ دێووەکان شکست‌تیان نەخواردووە یان توشی دەردی سەرکێشە بوایەن بە کاری دیوەکانیان زانیوە.

هەروەها کە لە پێش‌دا باسمان کرد لە پێش مادەکان قەومەکانی دیکە وەک گوتی و لولوبی و کاسی ژیاون و ئەم قەومانە لەگەڵ یەکدا تێکەڵ ئەبن و جاریش وابوە جەنگ و هێرشیان بردووەتە سەر یەک‌تر. وەک هوریەکان، ئەکەدیەکان و سومریەکان کە لە بین‌النهرین‌دا ژیاون وەک کۆچری و کەم لە شوێنەوارێک‌دا ژیواریان کردووە و دەسەڵاتی بە هێزی لولوبیەکان لە کێوە گەردەن کەشەکانی باکووری دیاڵە بگرە تا دەریاچەی ورمێ بەر بڵاوی بووە. ڕەنگە ئەم قەومە لە هوریەکان جیا بوبێتنەوە. نارامیس کوڕەزای سارگون لە شاکانی ئەکەد لە کەتیبەکەی خۆی لە لولوبیەکان باسی کردوە.

گوتیەکان لە کوردستانی ئەمرۆ ژیاون و لە باستان شناسی (کۆنەناسی) لاپەڕەی ١٣

بەم جۆرە باسی دەکا و دەڵێ: بەڵگەی مێژووی بەدەستەوە هەیە کە قەومەکانی ئورارتوئی و مانای وگوتیەکان و مادەکان و لولوبیەکان هەموویان لە بنەڕەتدا یەک ڕەگەز بوون و هەر لە رشتە کێوەکانی زاگرووس‌دا ژیاون. کاسی، گوتی، لولوبیەکان، مانای و ئورارتوی ئەمانە لە ڕیشەدا یەکێ بۆون و ڕەنگە ئورارتو هەووەرتووی لە ناوچەیێ دیواندرە بێت. مادەکان لە ناوچەی هەمەدان‌دا حوکومەتیان کردووە و لولوبیەکان ناوچەی کرماشان حکومەتی ئەوان بووە لە زەهاب (یانێ سەرپێڵ) شوێنەوارێ بە دەست کەوتووە کە بە شوێنەواری لولوبیەکانی دەزانن. گوتیەکان لە ناوچەی گورمانج حکومەتیان کردوەو بە ناوبانگ‌ترین شای گوتیەکان «ئانری‌دابی‌زێر» ناوی بووە ئەمانە لە یەک دەوران ژیاون یان جیاجیا ژیواریان کردوە. بەڵام بنچینەیان لە یەک ڕەگەز و نەژاد بوون و لە رشتە کێوەکانی زاگرۆسەوە هاتوون کە کوردستانی گەورەیە وا ئەمڕۆ کوردی تێدا ئەژێت. چونکە ئەم قەومە بە جووتیاری و مەڕو ماڵات‌داری خەریک بوون کە هەر پاش ماوەی کوتیەکان و کاسیەکان و لولوبیەکان و مانای و ماد خاوەن دەسەڵات و هێزی گەورە بوون. قەومی ئاشوور و ئەکەد و لیدیە و بابل و ئیلام باج‌دەری هۆزە پێشویەکانی دانیشتوانی ئێرانی گەورە بوون.

بۆ ئەوەڵین جار هێرشی دڕندانەی ئەسکەندەر بەگڕ و ئاگر و سووتاندنی تەختی‌جەمشید بوو کە لەم بارەوە چون سوپای ئەسکەندەری ماوەی ٧٠ ساڵ[1] جگە لە

---

١- لەم بارەوە بیروڕای جیاواز هەیە و ئێستا دەڵێن ئەسکەنەر رۆمی (یونانی) نەبووە و یەکێ لە شاکانی ئەشکانی بە ناوی ئەلەک‌شاندار هەمان کەس بووە کە بە ئەسکەندەری رۆمی دائەنن.

تاڵان و وێرانی له کوردستان و ئێران شتی تریان نه کرد و شوێنەواری ئێران زەرەر و زیانی زوری به خۆیەوه دی. لەم باره مێژوونووسان باسی سووتاندنی کتێبه دەست نووسه کان و شوێنەواره مێژووی یه کان ئێران ئه که‌ن که مرۆڤ بەزەیی به ئێران دێ. چۆن به هێرشی ئەسکەندەری دڕنده ئه گەر شتێ بۆیان جێ به جێ نەبوایەت شرپیان ئه کرد و له ناو ئاویان ئەبرد. ئەوانه له بیرەوەری شاکان و بەسەرهاتیان بەو جۆره بوه و یان کردەوەی و سرِ و نیزامی ئەو دەورانه بووه هەموویان له ناو برد دەتوانین بلێن که ئەسکەندەر وجاخی ئێرانیان کوێر کردوەتەوه پاش ئەوه دووهەمین زەرەر و زیان تاڵان له لایەن تازیه کانەوه که بەڕاستی سۆز و قرچه له دڵ و دەرونی مرۆڤ هەڵ ئەستێنیت رووی داوه. تازیه کان که ئەرەبه کانی ئەمڕۆژن تا ڕادەیەک زوڵم و ستەمیان کردوه هەر له بیر ناچێتەوه، ئەم قەومه هێرشی‌یان هاورده سەر ئێران و چەند هەزار ئێرانییان کوشت و بڕ کردووه ئەوەی بەردەستیان کەوت بردیان بێ بەزیانه. ژنه کان و ئافرته کان بۆ بەردەیی (گزیری) بردەوه. ئه گەر بەڕاستی له کردەوەی ئەمانه ئێمه باس بکەین گریان دڵ هەر کەسی پڕ ئه کات و چەندە ئێران توش چەرمەسەری بووه چونکه ئەوان له پێش‌دا بت‌پرست بوون و ئێران ئاهۆرامەزدای پەرەست بووه و ئێران بو مافی گەلانی دیکه ریزی ناوه. بەڵام پاداش به چەپاوڵ ئاگر بەردان له تەخت و بەخت هورموزە‌کان بووه کەسێ‌وا بت‌پرست بێت چاوەنواری چاکه له ئەو هەڵەیه، پێغمبەری ئیسلام (د.خ) دەفەرموێ کاتێ ئێرانیه کان دینی ئیسلام قەبووڵ ئه کەن ئەوان ئازار و ئەزیەت مه کەن بەڵام بەداخەوه لەم دواییەش ئەرەبه کان (تازیه کان) یان تاتیه کان له بیریان بردەوه له هیچ تاڵان و کوشت و بڕێ درێغ

ناکەن و ئایینی زەڕتوشت کەمڕەنگی بە خۆیەوە ئەگرێت و بە واتای ئەمرۆ تەڕ و وشک پێکەوە ئەسوتێنن. یەکێ لە داب و نەریتەکانی ئێران جێژنی سەرکەوتنی کاوە بە سەر زوحاک و باقی داب و نەریتەکۆنەکان درێغ و لۆمەی ئەکەن؟! بەڵام ئێستا بتەکان وا بەر لە ئایینی پیروزی ئیسلام لە وڵاتە ئەرەبەکان بووە بە میراتی کۆنی خۆیان ئەژمێرن و بە تەمەدون و فەرهەنگی مێژوی خۆیان شانازی ئەکەن.

٣ لە لاپەڕەی ٤ کتێبی «ماد بناغە دانەری شاهەنشایی لە ئێران» دەڵێ: کە یەکەمین شاهنشایِ لە ئێران پێک هات لە غەربی وڵاتی ئێران قەومی ماد بووە.

قەومی ماد زۆر بۆ یەکگرتو و ژیانی راستەقینە هەوڵیان داوە بۆ مەزدا پەرەستی و یەک بیرو باوڕی تەقەللای زۆریان داوە و بەڕاستی ئازا و جوامێر بوون و دوژمنی سەرسەختی ئاشوریەکان بوون و ئاشوورپانیپاڵ خۆی بە خوای تەواوی وڵاتەکانی تر بەقەڵەم داوە و حکومەتەکانی وەک ئیلام و بابل قەبوڵیان کردووە بەڵام ئێران سەری بە ئەم پەرەستنە دانەنواندوە و جەنگ و ناکۆکی لە نیوانیان دەرئەکەوێت. دەوڵەتی تازە پێ گەیشتوی ماد کە هێشتا بەرەی حکومەتەکەی تەواوی وڵاتی مادی دانەگرتبو ئەکەوێتە بەر هێرشی دڕندەی ئاشوور و چاوی شور ئەکات و بەرو وڵاتی ماد هێرش ئەکات. کە چی لە ئەنجامدا پاش داگیر کردنی وڵاتی ماد هێشتا ناتوانی میللەتی ماد بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی بەڵام هەر ڕۆژێ کێش ئاشور ڕوی ئاسودە لە وڵاتی ماد بە خۆیەوە نەدی و ئاشوور و پادشای ئاشوور بە دەستی هێزی ماد لەبەین ئەچن. لە حەیفا کە سەلمان نازاری خۆی بنەماڵەکەی و دارایی و سەروەتو سامانی لە ناو قەڵاکە ئاگری لێی بەر ئەدات و هەموویان

و بنه‌ماڵه‌که‌ی له ناو ئه‌و ئاگره ئه‌سوتن. ئه‌م شۆڕشه هوخشته‌ره پادشای ماد ئه‌یکات. و سه‌کایه‌کان که ٢٨ ساڵ له وڵاتی ماد تاڵان و جه‌رده‌ی ئه‌که‌ن که له کێوی قه‌فقازه‌وه دێن. سه‌کاکانیش هه‌ر به سیاسه‌ت به ده‌ستی توانای حکومه‌تی ماد له به‌ین ئه‌چن و به ئازادی و سه‌ربه‌خۆی له‌ده‌وری خۆیاندا ژیاون و ئێستا ئه‌گه‌ر وڵاتێ یان قه‌ومێک سه‌ربه‌خۆ بێت له سایه‌ی سێبه‌ری ماده‌کانه‌وه هاتووه و زۆر قه‌ومی دیکه‌ی رزگارکردووه له ده‌ستی ئاشوریه‌کان. وڵاته رزگارکرواه‌کان جه‌واهێر و زه‌ر زۆریان بۆ ماد به دیاری هه‌ناردوه به‌ڵام هه‌موویانی داوه‌ته‌وه پێان و ئه‌وانیش زۆر دڵیان خوش بوو بێ دڵه‌له‌رزه بۆ خۆیان ئه‌ژیان.[1] له کێشه‌ی به‌ین حکومه‌ته‌کان په‌نایان به ده‌وڵه‌تی ماد ئه‌هێنا و شێوه‌یه‌کی نوێ و تازه و گوڕانکاری له ژیانی میلله‌تی ئه‌و سه‌رده‌مه پێک هێنا. قه‌ومی کورد له جوامێری و ئازایه‌تی له هه‌ر ده‌وره و رۆژگارێک‌دا ده‌رسی ئاموژگاری به میلله‌تانی سه‌رده‌می خۆی داوه. له لاپه‌ره‌ی ١٤٧ پادشای ماد باسی زۆربه‌ی شوێنه‌واره‌کانی لورستان و کوردستانی ئێستا ئه‌کات وه‌ک پێشه‌سازی ته‌ڵا، زین و جلگ و... شوێنگه‌یی دیکه یادگاری بیره‌وری زۆریان به جێ هێشتوه. له کاتی هاتو چوی ئیلامیه‌کان به سه‌ر وڵاتی ماد که ئیلامیه‌کان پادشای به‌ناو بانگیان بووه ناوی شوشیناک برای کویترناخونته بووه، وڵاتی ئیلام و بابل وکاسی به‌یه‌ک ئه‌کات و تا ڕاده‌یه‌ک ئاشوور ئه‌خاته ژێر ده‌سه‌ڵاتی خۆی و به‌ره‌و ته‌ختی جه‌مشید له‌شکه‌ره‌که‌ی ئه‌خاته ڕێ و وڵاتی پارس داگیر ئه‌کات.

بین‌النهرین که ده‌جله و فورات نێوان هه‌ر دوو دانه‌یان پێ ده‌ڵێن «بین‌النهرین» که هێزه

---

١-ئێران باستان - موشیرئه‌لده‌وڵه.

پێشوەکانی ئارییایی و مێژوویی‌ترین قەومی کورد لەوێ‌دا ژیاون هاتوونە سەرزەوین ئێران. لەم بارەوە مەجەلەی فَروَهرَ منوچهر موبارەکە دەڵێ: قەومی ئاشوور و بابل مەدیونی مەردمانی پێش ئەوەی لە سەرزەوین «بین‌النهرین»دا و سەوز بووە پێش لەم سەرزەوینە ژیاون نە ئاریای بوون نە سامی نە سومری و لە ئەوەڵین دانیشتوانی ئەم ناوچە (بین‌النهرین) شاری ئور بووە و حەزرەتی ئیبراهیم لە شاری ئوور بە دنیا هاتووە و دەڵێن ئیبراهیم لە نەژادی کورد بووە.

ئەرجاست: شای تورانیەکان بووە و بۆ بەرگری لە ئائین ئەشو زەرتوشت کە چۆن ئێرانیەکان ئاهورایی بوون و ئەرجاست خۆی زاڵم و بێ ئائین بووە زۆر کارشکێنی کردوە و هێرش ئەکاتە سەر ئێران و گشتاسب لە بەلخدا (باختری ئەمڕۆی کابل ئەفغانستان و سیستان[١] بەلغ یان پی وتووە). گشتاسب لەو شەڕە ئەکوژرێت تورانیەکان ئەگەرچی لە ڕەسەندا لە گەڵ ئێران یەکێ بوون و لە ئیرەج جیا بووەتەوە و لە تورکوڕ فەرەیدون بوون و بە توران ناویان دەرکردوە چون فەرەیدون سێ کوڕی بووە بە ناو سرمان. ئیرەچ وە تور (سرمان و تور) دایکیان یەکێ بووە. (هێشتا بەڵخ ی سەردەمی زەرتوشت نەزانراوە لە کویە) ئیراندوخت کچی زوحاک ژن فەرەیدون بووە کە کوڕێکی لێ بووە بە ناو ئیرەچ[٢] لە کچی زوحاک بووە.

---

١- ئەم بیر و باوەڕە کەم‌تر لە لایەن خاوەن‌ڕای مێژووناسانەوە قەبوڵ ئەکرێت و بیروڕای جیاواز هەیە.

٢- «ئیرەج»ی پێ ئەلێن.

ئەرجاسب ئاخرین دوژمنی شەهریار ئێرانیەکانە کچی گشتاسب شای ئێران ئەسیر ئەکات بەڵام رۆستەم سیستانی نەجاتی ئەدات.

ئەسفەند ئاباد یا ئەسپەن ئاوا. ئەسپەن‌ئاوا یان ئەمشاسپیندان یا پاکان‌کە زەردەشت لە بنەماڵەی «سپینمان» بووە ئەوەندە لێ کۆڵینەوە زیادە بەڵام هیوا دارم لە داهاتوو چینی قەڵەم بەدەست کورد وا داماو نەبن تا باشتر شوێنەوارەکان بناسین لەکوردستان و بەگشتی ئێران. لە ناوچەی لەیلاخ (خۆرهەڵات کوردستانی) گەورە ناوچەیەک بە ناوی ئەسپەن ئاوا هەیە. لە ئایینی زەردەشت‌دا سپنت‌مینوو ئەنگرمینو هەیەکە سپنت بە مانای فریشتە یان نیرویێ‌کە بۆ چاکی باش مرۆڤ بە یاری دبێت، فریشتەیێ خەیر ویری زوانی پیرەژنان و پیرەپیاوان بوە. هەر ماوە ئەمە بۆ پەیجوی گرینگ و بایەخ‌دارە چۆنکە کورد بەڕاستی سینەیان کتێبی مێژوویە بۆ نموونە ئەم باسە کە وەک فریشتەی خەیر هات لە باوەڕی ئایینی زەردەشت بووە کە سپنت مینو یانێ فریشتەی خەیر و ئەنگەرمینو یانێ فریشتەی شەڕ.

گەلی کورد بەڕاستی دەتوانین بڵێین گەرچی کورد لە بەر هێرشی دڕەندی رومیەکان و تەیموری شەل و تا ئەوکاتە شا خوێریە خوێنمژەکان کە خەڵاتیان بۆ کورد تەنیا تاڵان و دەربەدەری بووە فەرهەنگ گەلی کوردیان پێ شێل کرد سەروەت و سامانی ئەم خاکە و وڵاتە بە تاراج و باج بردوە. لە منداڵی ناو لانک رەحم و بەزەییان نەهات‌وە، بەڵام ئەوەی کە ئەوان ئێستاش ئەترسن بیر و باوەڕ و ئامانجی و کەللەیێ و سینگی گەلی کوردەکە پڕە لە بەسەرهاتی بابو باپیرەکانمان زوربەی مێژوونووسەکانی ئێران لە کوردەوە کتێبیان

نووسیوە کە چێ بڕێکیان کوردیان بە دێوزادە بە قەڵەم داوە و کوردی وەحشی ناویان لێ بردوە. ئێمە خۆمان لەم کارەساتە بێ بەش نین گوێ نەدان بە قسە و باسی دڵسوزانی کورد بێبایەخ بوون بە خۆمان یەکێ لەو کارە ساتە دڵتەزێنەیە کە وا بۆ کرم دارخۆر لە کوردەواری زۆرترە.

کاتێ وا سولتان سەلیم یاوەروە لە گەڵ شائیسمائیل سەفەوی کوردستانیان بە دو بەشەوە کرد کە چی رەفتاری ناپاکی شائیسمائیل دەرحەق بە کورد زۆر بێ بەزەیێ زاڵمانەو دڕندانە بۆ، و سوڵتان سەلیم ئوسمانی پادشای تورکیا بەشێ لە کوردی دابرکان و شائیسمائیل بەشێک بەرەو ئێران کە وا بۆ کورد هەر لەو سەردەمە لەت و پەت کرا کە چی هەر لەو سەردەمەدا سەرکەردەی کورد خان و ئەشیرەت بوو قەد بایەخێ سیاسی یان نە بووە لە و کاتە ئەوان لە شوێنی تاڵان ماڵ و سەروەتی بڕا کوردەکانیان بوون.لە کتێبی خەبات لە رێگەێ کوردستاندا (ن. خ ) هاتوە کە بڕیەک لە کوردەکان کە لە دەستی ئەرەبەکانەوە بە تەنگ هاتوون لە بەر ئەوە کە دەست رەنجی خۆیان بە دوو نێوە بگرە زیاتر دوای ئەزیەت و ئازار بە هەزاران زۆڵم و جەوری تر .... لە ترسا کوردستانیان بەجێ هێشت و پەڕیوەێ شارەکانی ئێران تورکیا ـ ئێراق ئەبۆون بە فارس یان تورک یان ئەرەب دەرنەهاتن؟!

مایوڕی: کە فەرماندەری ئینگلیزی یانی رۆلینسون، سەرکەدەی سوپاێ شاهنشای ئێران بووە دەڵێ: تورکەکان و فارسەکان دایم بۆ ئەوە یەکتر بترسێنن لە گەڵ کوردەکان روخۆش ئەبۆون و بەم جورەش لە یەکتر سبقەتیان ئەگرد. چۆنکە کوردەکان لە جەنگدا لە

دوو بەرامبەر لە سەربازەکانی‌تر جەنگاوەر و هیمەت‌دارتر بۆون و لە کاتێ شەڕ هەرکامیان کوردی چەکداریان زۆرتر بوو سەرکەوتووتر بۆون لێرەدا کورد بەڵاوەگەڕێن دوژمنی خۆێ بووە. ئەم فەرماندەرە دەڵێ: کوردەکان هەر لە منداڵیەوە فێری جەنگاوەری و ئەسپ سواری قەروڵ‌دان و یان خاوەن‌داری و ماڵ‌داری ئەبۆون کە لە کاتێ تەنگانەدا بە کار بێت لە منداڵیەوە فێریان ئەکن و زۆربەیێ‌یان هەر لە دە ساڵیەوە جەنگاوەری بە هێمەت و چالاک و نەترسن.

تیلەر: کونسولگەری قەڕاڵ ئینگلیز کە لە تورکیا بووە دەڵێ ـ تێکەڵ بوونی قەومێ بە ناو کورد دایم بووەتە ئاژاوە و ناکوکی ئەم دوو وڵاتە (ئێراق و تورکیە) چۆنکە دوو بەش بوە و ئەوان (کوردەکان) لە بەێن خۆیان سنوور ناپرسن و خۆیان بە یەک خوێن جەستە ئەزانن کاتێ لێان ئەپرسی کوردەکان دەڵێن ئێمە یەک رۆحین لە چەند جستەدا گوێ بە سنووربەندی نادەین و کۆچەریەکان هەر لاێکیان پێ خۆش بێت لە کوردستان کۆچ ئەکەن و هەر دوو لایان کوردستانی گەورە بەماڵێ خۆیان ئەزانن و ئەم دیوئەو دیو بۆیان فەرق و جیاوازی نیە. سنوور لە بەێن کورد شتێ بێ‌مانایە ئەبێ بشێوێتەوە و وئێمە سنوور لە بەێن برای خۆمان نابێنین ئەگەریش خوێنمان بە دەم تیری ناپاکانەوە برژێ لە کاتێ کە داگیرکەرەکان لە جێگای پێلانو فێڵ ئاژاوە بۆ کورد ئەبێ بە فکری چارەێ دەردی لە مافی سەر بەخۆیی بن نەک تەڵەکە و پێلان.

تیلەر دەڵێ: کوردەکان لە پێشەێ، مس و زیوەر و ئاسن. زۆر شارەزان و شاخەکانی

*کوردستان زۆر دەوڵەمەندە لە کانی فلزی، بەرد، ئاسن، مس و کروم زێرۆهتە...*

دیسان دەڵێ: بەداخەوە کوردەکان بۆ سەربەخۆیی لە مێشک یان کەڵک وەر ناگرن لە هێزو توانایان بو شەڕکردن لێان کەڵک و سودیان وەرگرتوە و دەوڵەتە داگیرکەرەکان کار و باری رامیاری (سیاسی) و ئەرکی ناوخۆیێ پێیان ناسپێرن. کە چی پیاوانی لایەق و ئازاد و لێهاتو و کارزانیان زۆرە بەلام بەداخەوە یان بێ کارن یان کاری باو دڵیان پێ نەسپێراوە کورد لە باری کۆمەلایەتی و ئابوری هەڵسوکەوتی زۆرە کە چی وایان لێ ئەکەن تا ناچار لە بەر نان دەرهاوردن بە باوی بێگانە رەفتار بکەن. ئەم کارەساتە ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە دەوڵەتە داگیرکەرەکان چەندە ئەیانەوێت کورد لە کاری پیشەسازی و دەسەلاتداری وهتد ... بێ بەش بکەن ئەمیش کارێکە لە ناو میوانداری سەرکەردە تورکەکان و ئەرەب لە کاتێ ئەیش و نووش خەو بۆ کورد ئەبینن. چۆن تەنیا کوردە خەوێ راحەتی لە چاویان سەندوە و بۆ ساتێکیش بێ ترس لە کورد نەحەساونەتەوە. گەلی کورد تا کەی لە خەو بێت پەردەێ نەزانی چاو و مێشکمان پڕ کاتەوەوە بە قەولێ مامۆستا هەژار رەحمەتی سوارمان دەبن غارمان ئەنن بارمان دەنن. کوردە بە من چی نەنگە.

بەرپرسی کۆن سولی دەڵی: ئیران و تورکیا نەیانهێشتوە کوردەکان لە بارەێ ئابورێ ژیانی باش پەرە بستێنن بە هەموو جورێک تەگەرەیان خستوە رێ پێشکەوتنی باری ئابوری کۆمەلایەتی سیاسی و ویژەرێ کورد بەم چەشنە سیاسەتی زد و دژو ناپاکی تورکیا و ئێراق و سووریا بۆمان دەرنەکەوێت و باشتر دەستی ناپاکیان روو ئەبێت کۆن سولگەری رووسی ناوی «یاکیمانسکی» بووە ئەم باسەی نوسیوە.

. هەڵبەت ئەوە بۆمان ئەیانە چ پێوست بە بەیانە، هەر کوردێ لە هەر وڵاتی لەو چوار

دەوڵەتە ئەژێت رەفتار دوژمنان کورد بوی روونە دەزانن بانێ و دوو هەوایە لە بەر ئەوە تەنیا ئاتاج و موحتاجی، بائیس ئەبێ بە مووسای بڵێ بە ریش مەردانگی تۆ قەسەم. برا کوژی لە ناو کوردا یەکی لە پیلانەکانی ئەو شەیتانە گەورەیە یانی ـ ئینگلیز و رووس و سیاسەتی حکومەتەزاڵمەکان نە تەنیا لە لایەن خۆیانەوە دیسان لە ناو کوردەکاندا دووبەرەکی و نیفاقیان ئەخست و کوردیان لە یەک دوور ئەکردو و بەگژ یەکدا ئەچوون و بە یارمەتی‌دانی دەستەیەک بۆ گیانی دەستەێ‌تر ، لەم براکوژیەکە زۆر بە قازانجی حاکمە دەسەڵات‌دارەکان بوو، هێشتا ئەم سیاسەتە بە کار دێنن هەر جاری بە شێوەیەک، چۆن دەزانن ئەگەر کورد خۆی لە بەین نەوات هیچ هێزی نایبەزێنی بۆ نموونە بەڵگەی رەسمی باڵویزخانەێ فەرانسە سری ئێرانی لە دەوری پادشایەتی‌دا فاش کردووە دەڵێ حاکمەکانی ئێران بە سەرکردەکوردە دەرەبەگیەکان چەکی داوە بۆ تاڵانی ئاوایەکان لە مەڕ و ماڵات هەر وەها باج و بێگاری مالیک و ئاغای کورد بە دەست بە یەک کردن پیاوە ژاندارمەکان و حکومەتیەکان.

مێژووی مادەکان لاپەڕەێ ۵۰ نووسیویەتی کە لە هەر شوێنی لەوەڕگەێ مەڕ و ماڵات و بڕێک کاسە و کووزەیان لەو شوێنەوارە بە جێ ماوەلەو شوێنەدا قەڵا و دژیان دروست کردووە و دروست کردنی قەڵا هەر لە خشتی ئەهەکی دروست کراوە کاسە و کووزەیان لەو دەورە باو بووە و ئەگەر ئێستا هەر لە شوێنی کاسێ و کووزە و خشت پەیدا بوویێت بە مانای قەڵای حکومەت بووە و خوای ئێرانیەکان پێش ئایینی زەردەشت «میترا» ناویان بردووە. و ئێرانیەکان کە لە ۹ هەراز ساڵ پێش‌دا وجاخی ماڵیان ئاگر بووە و گەورەێ

تایفەیٚ خۆیان بەر پرسی زانیوە و لەکار و باریٚ رۆژگارداگەورە پیاوانی بنەتایفە خۆیان رووی دەمیان لیٚ کردوە، تاگەیشتووە بە حکومەتی گوتی، کاسی، لولوبی و ماد، ئاو و خاکیان کە بە خوێن سەندووە و خۆیان بە خاوەنی ئەو ئاو و خاکە زانیوە، بەرپرسی سەرۆکی قەومی خۆیان «کویٚ» یا «کیانی» ناو بردوە کە ئیٚستا بە کوردی دەڵیٚن کویٚخوا ویٚردی ئەو دەورانەیە، بە چەشنی (کەیخەسرو) کەیقوباد ـ وەیان لە دەورانی - کەیانیەکان وگوشتاسپ ناوی یەکیٚ لە شاکانی دەورانی پەیغەمبەری زەرتوشت بووە و کەی قوباد کە بە دەورانی پشتاوپشت کیانیەکان مەشهور و باوە.

ئەگەر چی بە تیٚپەر بوونی زەمان گۆڕان کاری زۆر بەسەر میٚژووی ئیٚراندا هاتوە و ئایینی زەرتوشت توش کەمڕەنگی ئەبیٚت بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتداری مادەکان لە ئیٚران دیسان موغ و موبەدەکان ئایینی زەرتوشت ئەدرکیٚنن و رەنگ و بۆیٚ تازە بە خۆیەوە ئەگریٚت دیسان ئەم ئایینە ئەبیٚتە یاسای رەسمی و ئایینی ئیٚرانی و ئیٚرانیەکان. لە هەمو مەزهەب و ئائینی جیهاندا هەر یەکیٚ بە شیٚوەیٚ دینی خۆی چاکتر لە دینی‌تر زانیوە. بەڵام لە ئائینی ئەشو زەرتوشتدا هەموی بە سیٚ وشە کۆکردوەتەوە. وەک: کودەوەی چاکە، ویٚژەی چاکە، بیرکردنەوەی چاکە. کە سیٚ پیٚچ سەروین کوردی و بەستنی شاڵ بە شیٚوەی قوفڵ و بەند (گریٚ) یادگاری پەیرەوانی ئەشو زەرتوشتە لە دەورانەدا هەر کەس پەیرەوی ئائین زەرتوشت بوایە بەو شیٚوە ئەناسرا و دیارە کەهەر ئەشو زەرتوشت خۆی کورد بووە وبە شیٚوەی خەڵک بەرگی پۆشاوە و ئائیٚستا بە زوانی کوردی نوسراوە.

# «سه‌رنجێ بۆ زمان و شێوه‌ی نوسینی کورد»

زمانی کوردی و خه‌ت کوردی به‌ چۆنیه‌تی زمان و نوسینی ئاڤێستاوه‌ گرێ دراوه‌ و ئه‌بێ بۆ په‌یجوی هه‌ر له‌ ئائینی پێشووی ئێرانیه‌کانه‌وه‌ دست پێ بکرێ، چون زیاتر بو تۆژینه‌وه‌ بنه‌وبنچه‌ی زمان و شێوه‌ی نوسینی کوردی و داهاتنی غه‌یر له‌ روون بونه‌وه‌ شێوه‌ نوسینی ئاڤیستا و ئاخاوتنی شێوه‌ زمانی ده‌ورانی زه‌رتوشت به‌ جۆرێک‌تر په‌یجووی دژوار و توژێنه‌ر به‌ هه‌ڵه‌دا ئه‌ چێت. وسومریه‌کان که‌ ته‌مه‌دونێکی به‌ناوبانگیان له‌ مێژودا هه‌یه‌ بۆ یه‌که‌م جار شێوه‌ی نوسین و خوێندن دائه‌رێژن. ئه‌گه‌رچی سومریه‌کان خه‌تیان په‌یداکرد و نیشانه‌ بووه‌. بۆ هه‌رکاری، خه‌تی تایبه‌تی بووه‌ وه‌ له‌ وێنه‌ کێشانه‌وه‌ تێکۆشان و سومریه‌کان روون بووه‌ته‌وه‌ له‌ قه‌ومی پێشوی کورده‌کانی ئه‌مرۆژن. خه‌تی ئه‌لف و بێ له‌ فینیقیه‌کان‌دا به‌ شێوه‌ێ تایبه‌تی خۆیان داهێنه‌ری ئه‌بن به‌ڵام خه‌تی کوردی

ئەو سەردەمەهەمان خەت و زمانی زەرتوشتە و زوانی کوردی هەر ئەو زوانی ئاڤیستایە. چۆن کتێبی زەرتوشت ئاڤێستا بوە بە هۆی ئەوە کە لێ توژینەوەکانی هێندی و یونانی ئێرانی لە سەر ئەو باوەڕەن کە زوانی ئاڤێستا کوردی ئەمڕۆژە و هەموو کردەوەکانی زەرتوشت لە ناو کوردەکان لە جل و بەرگی کوردی تا شوێنەوارە ئایینیەکان دیارە زەرتوشت کورد بووە. و ئەگەر چی زەرتوشت بە دەست ئەرچاسپ تورانی لە ئاگرکەدەی داگوژرا و گشتاسب شای ئێران ئایینی زەرتوشت مەزدا پەرەستی بووە بیر لە چاک کردنەوە «سپنامینو» و خەراپە بیر لە کردەوەێ خەراپە «ئەنگەرمینو» ناویان بردوە. وکاری خەراپەێ بە ڕەویەی دێوی زانیوە و کتێب وندیداد کە بەشی لە ئاڤیستایە قانوونی دژی دێوەکان. مویدەکان بەر پرسی ئایینی و بەڕێو بەری ئەم ئایینە بۆون، رەسم و یاسای دینی زەرتوشت لە ئاگرگابووە چۆن وەها کە باسمان کرد وجاخ رۆشنی یانی ئەو شوێنە نەکوژێتەوە و لە ئایینی مەزدەیەسنا کە زەرتوشت فەرموویەتی کە بە مەزدا پەرەستی روو بکەنەوە و بریک لە نووسەری خاون رایێ دەڵێ سەردەشت کوردستان. لە وشەێ زەردەشت پەیغەمبەر بووە ئەشو زەرتوشت لە سەردەشت بە دنیا هاتووە.

شەێداکە ئەم باسە لە بەر درێژی باسە کە لە سەری نارۆین بەڵام شەید = نوور = شەیدا = نوور ئەلا نوورە = کە کێوی شەیدا لە لای نیاز = یان نیات بووە کە باسی دیکەێ کورد بوونی زەرتوشت جل و بەرگی ئەوە کە لە ناو کوردەکان کردەوەی چاکە = بیرکرنەوەی چاکە قسەی چاکە کە لە شاڵ بەستن لە ناو کورد قوفڵ بەندی لە ناو یەکتر ئەو نیشانەی سێ کردەوەیە گەورەترین شانازی کوردستان بە دنیا هاتنی ئەشو زەردەشت لە خاک و

زێد کوردستان و له خۆدی کورد زکماکه که نزیکه به ۹ هەزار ساڵ پێش که قەراغی دەریاچەیٚ ورمیٚ به دنیا هاتووه و ئەمشاسپندان (یانی) فریشته‌کان نەمرو یام پەیٚام هاوەرانی پارسا و پاک داوێن که نیرپوسنگ یەکی له ئەوانه‌که له ئاڤێستا به ناوی پەیٚک‌یان پەیٚام نێری ئاهۆرامەزدا ناوی لێیٚ براوه.

(سو) که له ئاڤیستادایانی ئارەزو (کام) ئاوات که له کوردی ئەمڕۆژدا وەک دایم و (سۆم) بۆ فڵان شت‌یان سۆم کرد بۆ دووری براکەم هەروەهاکه له پێش‌دا باسمان کرد. که هاتنی له ئایینی مەزدەیەسنا بووەیانی قانوونی دێو که زەردەشت به هاوردنی (مەزدەیەسنا) و داهێنەری ئەم یاسا ئەهورا مەزدایه ـ دێویەسنای به‌هەڵەزانی دژیٚ ئەم دێو پەرستیەیانه به هەڵویست راوێستا تاکو جادوگەره یونانیه‌کان به دژی زەردەشت به هان دانی ئەرجاسپ شای تورانیه‌کان له ئاگر کەدەی بەلخ کوژرا بەڵام بیرورای بریٚ له نووسەرەکان وایه که زەرتوشت له خاکی کوردستان بەرو وڵاتی پارت نەچوو و ئەو شوێنانه که ئوستاد پورداود بو کوشتنی زەرتوشت ناوی لێی بردوه و هەر ئیستاش له کوردستان ناویان ماوه و دەلێن گۆری زەرتوشت له کوردستاندایه.

ئەگەر چی تا ئێستا هێشتا خەتی مادەکان روون نەبوەتەوه که بەر له مادەکان به هەناردنی وەک پەری کەوتر، سەگ، مار و چەقو یەک‌تریان له کاره پەنامەکیەکان تێگەیاندوه. بۆ نمونه هەناردنی پەر یانیٚ وەخته بۆت پەر دەرکەم، یان هەناردنی وێنەی مار یانیٚ دوژمن ئگەر دەرفەتی بو رێکەوی پەلامارت نەدات وه یان هەناردنی شمشێر یانیٚ من پشتیوانی تۆم. بەلام ئەمه بەر له دەورانی ماد بووه و خەتی ماد هەمان خەتی

ئاڤێستایی بو و تازە روون بووەتەوە کە شێوە نوسینی مادەکان هەمان شێوە نوسینێ بوە کە لە ئاڤێستادا نوسراوە.

لە کتێبی بناغەی حکومەت شاهنشای ئێران ل ١٨٠ هاتووە کە جێگەو شوێنی مادەکان هەر لە سانگی بوتو ـ مەرەند و خۆی ـ قوتور ئازەربایجان (ئاتروپاتەکان) و وڵاتی نەمری یە لە ئێران باستان لاپەڕەێ ١٦٩ داهاتووە. نەمری ـکوردستان ـ ی ئەمڕۆ بووە و خارخار ـ خارخارویان هارهار کە رەنگە کرماشان ئەمڕۆژ بێت ـ سمپاش کە شۆینەواری کۆنی مادەکانە - ە - ناوچەی بەختیاری زانیوە ـ و زاموئای بە ورمێە زانیوە. دیاکونف لە تەحقیقەکەی خۆیدا شاری زەهاو و یان سەنەندژ و سلیمانیە، بانە و میاندواو بە مانای تەواوی زاموئا یا لولونیشیان کراوە و (پارسۆئاش) کە بە باکوور خوزستانی زانیوە. سویا کیشاسو بە شارەزۆری ئەمڕو نووسەرەکان ناویان لێ بردوە. و ئێستا برێک لە شۆینەوارە حکومەتەکانی ماد و گوتی ـکاسی ـ مانانایی ـ هوری ـ ماد گەورە لە ئەم شوێنەوارانەن.

موسو ـ یامسی کە دیارە زەرینەروودی ئێستایە.

مانانا ـ یا مانامنی کە لای خواری دەریاچەی ورمێە.

نیسائی ـ یا نیسایە کە فرەێ لە مێژوونووسەکان خواری کرماشان یان زانیوە کە ماهیدشت ئەمڕۆیە.

مەدکوتو ـ یا پتوش ئارا یا سواد کوە یا سمنان - کوککوم. فومەن ئەمر = گیلزان = دەریاچەێ ورمێ.

کاسپین = لە ناوچەی لەیلاخ کازین هەیەو ئاسەواری هوزی کاسیەکانە(یا قەراغی دەریاچەی کاسپین کە رەنگە هەمان شوێنی کاسیەکان بێت). و ئایەتوڵلای مەردۆخ ئەو ناوچەی بە هۆزی گوتیەکان ناو بردوە

زیکرتو = شاری ئێستای میانە و ئەردەبیڵە

ئەونیش دیشن = شایەدمەراغەی ئەمڕۆ بێت.

بێت همبان = شایەد کامیاران بێت

گیزیل بوندا = قەزوێن یان زەنجانە.

ساپاردا = هالە لای خواری زەنجان بەرەو کوردستان.

بێت کاری = ناوچەی هەمەدان یان مەنزڵ گای کاسیەکان.

ئەرانچا = کەرکووک یان ئەڵوەندی ئەمڕۆ لە نزیکەێ هەمەدان.

ئەنەیا = سپی رووخانە چەمی سپی.

سیبارا = سیبورا = نزیکەی زەنجانە.

ئاندرپاتیانو = نزیکەێ قەزونیە.

کوخارس = مەرزی پارسوایە.

ئەیزیرتا = سەقزی ئەمڕۆژە.

ئوزیبا = یا(زیییە) هەر ئەم زێویەی ئەمڕۆژە.

ئارازیاش = نزیک بە هەمەدان یان قوروەیان ئارەزانت.

تیلاشوری = دژی گەورە و سەخت بووە نزێک بە سنە ئەمڕۆیە.

کیلمان = کولمان ـ خارخار یان شوێنەواری له ناوچەی لەیلاخ کە نزیک بە شووراوی قوروه پەیجوی بکرێ.

شوبریا = ئارما ـ نزیک بە تارانەوە.

له مێژووێ زۆدا مادەکان له قیر کەلکیان وەر گرتو و له ئوروپادا به نەوت رەوغەنی مادی پێان وتوه. ئەگەر چی هەموو ئەم ناوانه به شارەکانی ئەمڕۆ ناوی لێ براوه بەلام چۆن ئەمانه توژینەوه یەکی له کوڕێ زانیاری ئەمڕۆیان لێکۆڵەنەو به تەحقیق گەیشتوه هێشتا جێگەی باوەر و متمانه نییه. له بارەی ناوچەی مێژووی لەیلاخەوه چەندانه بابەت مێژووی تەرواڵ = یا(ته ئەورلی) = له لاپەڕەێ ٢١٦ مادەکان بناغەی ئەوه لێی حکومەت شاهنشای له ئێران دەڵێ = بۆ یەکیەتی و یەکگردویی قەومەکانی ماد له ترسی هێرشی ئورارتویی و ئاشوری سەکایەکان. مادەکان کە چەند تایفه بۆون و ئەم تایفه مادیه هەموو دەست یەکگرتوی و پەیوەندی پێشویان تازه ئەکەنەوه و ئەبنه حکومەتی گەوره و خاوەن هێزو دەسەلات و ماننایيان ـ تەئورلی ـ مس‌دالی ـ سوبنی ـ کوموردی ـ ئەمانه هەموویان ماد بۆون بەلام له بەر ئەوه کە چاوی ئاشوور خاین بۆون به یەکی و له ژێر ئالایەک به ناوی ماد گەوره ژیان.بەلام ئێستا باسی توژینەوەی تەرواڵ یان تەئەورلی کە له ناوچەێ لەێلاخ له لاپەره ٢١٦ مادەکان و شاهنشای کورته باسی کراوه لەم بارەێ تورتوداڵ له ناوچەی لەێلاخ کە ئێستا میراتی میللی قەدەغەێ کردووه گوندێک به ناوی تەرواڵ هەیەکە له شوێنەوارەکەی و له کاسیەکان و خشتەکان وا دیاره هەمان تەئەورلی بێت چۆنکه زوان کوردی لەێلاخ تۆشی گۆڕان کاری زۆر بووه و به نزیک بۆون به قوروه

چواردەوڵی تۆش نەخۆشی فەرهەنگیش بووە و کەمتر بایەخی بۆ پاراستن فەرهەنگ و مێژووی دائەنن جا ئێستا تەرواڵ هەمان تورتوداڵ ـ ی مێژووی پێتەخت یەکێ لە هۆزەکانی ماد بووە. ئارەزەن ـ یان ئاریزانت کە نێو یەکی لە شاکانی ماد بووە و ماوەی ٢٠٠ ساڵ حکومەتی کردووە (ئاریزانت) لە لاپەڕەیٚ ٢٥٤ ماد بناغە شاهنشای لە ئێران لە قەوڵی ئوستاد رەشید یاسمی دەڵێ کە زۆر سەیر و هاتوو چوویٚ هێرشی ئاشوور بۆ سەر مادەکان لە کوردستان، لە سلێمانیە و سنە لەیلاخ بووە بۆ هەمەدان هێرشیان بردوە و لە سەر ریگایٚ ئاشوریەکان ئەگەر قەڵا یان دژێ بوبێت خاپور و کاولیان کردووە و ئاساریان لە سەر پاسار نەهێشتوە کە ئەمڕۆ ئەگەر هەر شتێ بۆێ کاولی و وێرانی بدات نابێ ئێمە خۆمان لێ بێ قەیران کەین و ئەبێ ئەو شوێنە بە بیرەوەری شەڕزو شۆڕی خوێن ریژان فرمێسک و ناڵە و رۆرۆ بزانین و ئاسەوارە نەخشینەکان هەموویان لە مۆزە خانەکانی کوردستان دابنن تا باشتر میللەتەکەی خۆمان بناسین و بە دەنگی دلێر بڵین خاوەنی تەمەدون و حکومەت قەڵا و دژ دەسەڵات بووین و ناکوردەکان شەرمەسار بکەین و دیسان چۆن لە لەیلاخ ناوچەی راست و پان و بەرین بووە جێگەیٚ رەتان بازی ئەسپ و فێر کردن سوارە جەنگی بووە ناوی ئەسپ مادی لەو سەردەمە لە رادە بەدەر بووە و ئەسپیان لە جێگەی باج و خەراج هەڵ گردوە لە لاپەڕەی ماد بناغەی شاهنشای ئێران ٢٤٤ هاتووە پاش پانسد و بیست ساڵ دەسەلات بە سەر ئاسیای بچۆک هەموو ئەو وڵاتانە وا دراوسێی ماد بووە لە ژێر رکیفی ماد بۆون و مادەکان هەر لە سەرەتا تا دوایی حوکومەتیان باجگیر و زاڵم لە درێژای حکومەتەکانیان نەبووە تەنیا بۆ ئازادی رزگاری

گەلان تەقەللایان داوە قەد هێرش بەر نە بوون تا هێرشیان بە سەریان نەکرد بێت و بە گیان و دڵ ماڵ و نامووس و زێد و نیشتمان خۆیان پاراستویانە . قەومەکانی دیکە بۆ رزگاری زێد و نیشتمانیان لە چنگ بێگانەکان چاویان لە ماد بڕیوە بۆ سەربەخۆیی لە بارەیَ وتاری ماد لاپەڕەی ٢٢٣ کە نووسیوەتی مەردمی ئامکا لە تاو ترس ئاشووریەکان لە کوێستان پەناپان بردە گوندەکان ئەمر - ئامارو - پارسینەوئەیَریتو - سورتیودیە وێرانەکان کەوتە بەر غارەت و تاڵان ئاشووریەکان و سەکایەکان و زۆر یا لەبێ دەسەڵاتی و پیرە ژنان و پیرەپیاوان مناڵان لە ژێر ئەشکنجە کوشتیان و لە کاتێ هاتنی ئاشوور و سەکایی گەلی کورد زۆر تۆش چەرمەسەری رۆژڕەشی بۆن بەڵام دیسان رۆژگارانیان تێ پەڕ کردووە و چەرخیان لە چەمەر بڕیوە و هەر خۆیان بە مەزلووم هەژار نیشان نەداوە و چاوی دوژمنەکانیان کوێر کردوەتەوە. هەر لەو سەردەمە دیسان ئاشوور هێرشی ئەباتە سەرداگار کە لە نزیکەیَ سنەیَ ئەمرۆیە و بە گومانی زۆر دەور بەری شاری سنەنن‌دژ بێت.

وداگار یەکێ لە قەڵای مادەکان بووە بەڵام لە کاتی هێرشی حاکمەکەی ئەکوژن و شارەکەش ئاگری لێ بەر ئەدەن و تاڵانی سەروەت و سامانی ئەکەن و قەڵاکەش ئەرووخێنن لاپەڕە ٤٣٢ ماد بناغە دانەری شاهنشای لە ئێران هاتوە بەم هەموو کوشت بڕەکە ئاشوور لە کاتێ شەڕدا لە وڵاتی ماد ئەیکات سەکایەکانیش لە کاتێ وا ماد لە گەڵ ئاشوور لە کاتێ شەڕدا بووە قەومێ بە ناو سەکایی لە پشت کێوی قەفقاز هێرش ئەکەنە سەر وڵاتی ماد بەڵام تەدبیر و زەکاوەتی هوخشتەرە شاد ماد کاری ئەکات کە کوتایی

بەدەست درێژی ئومری ئاشوور و سەکایەکان دێنێت بە فەرماندەری خۆی ئەچێتە ناو قەڵای ئاشوور کە لە پێش‌دا باس کراوە و فەرماندرەکانی سەکایەکان مەست ئەکات و هەموویان کوشت و بڕ ئەکات. پاش ماوەیەک سەرکەردەی سەکایەکان بەرەو لیدیە هەڵ دێن و دەوڵەتی ماد لە وڵاتی لیدیە داخوازی سەکایەکان ئەکات بەڵام لیدیە بە گاڵتەوە وڵامەکەی ئەنێرێتەوە و لەم جوابە هوخشتەر کە تازە لە شەڕ ئاشوور و سەکایەکان نەجاتی بووە و هێشتا میللەتی ماد توزی تەمی ئەو بە سەر هاتە لانەچوو بوو لەشکەری بەرەو خاک لیدیە رازاندەوە بەرەۆ شەڕ رێکەوت لێرەدا دوو دانە سەرچاوەێ جیاوازی هەیە. ئێران باستان نووسین موشیرەئەلدولە دەڵێ پاش هەشت ساڵ شەڕ یەکجار خۆر لە خۆرنشین بە سوری تەواو هەڵات و ئەوانیش لە سەر ئەوە باوەڕە کە ئەم جەنگە دنیائاخری و خوێنڕژی مانایەتی شەڕیان وێستان بەڵام هێردوت دەڵێ: ماد سەرزەوینی لیدیە بە دەم خاکی مادەوە ئەدات و کچی شای لیدیە ئەخوازێت و تا ئەگاتە حکومەت فەروەرتیش کوڕ هوخشتەر.

هێرودت، ناوی شەش تایفەی مادی بەم جورە ناو بردوە و بریتین لە ئەم ناوانە:

١ ـ بوزەکان ٢ ـ پارتکن ٣ ـ ئەستروخاتەکان ٤ ـ ئاریزانتەکان ٥ ـ بودین‌یەکان ٦ ـ ماژێکەکان (ماژە) لە دەوری حکومەتی مادەکان چواردە کەس حوکومەتیان کردووە و هەوەڵین ئاریا باکسی و ئاخری ئاستیاز یا ئاستیاک و چوار کەسیان لە هگمەتانە ناو براون و پەیتەختی دیاکو ـ فروتیش یان و هوخشتەر ـ کواکسار ـ ئارباکسی یا ئاستیاک کە حکومەتی ئاشووریەکان‌یان بە واتەێ‌تر ئاسوریەکان بە دەستی ئارباکس رووخاوە

ئارباکسی بەر لە هوخشتەر لە دەوری میدیەکان کە ماد - ی‌دوا رۆژ بوون چونکە ـ میدی ـ گوتی ـ کوداک ـ کاردوخ ـ کاسای ـ خالدی ـ لولوبی ـ نایری ـ کوسی ـ ماننایی هەمووێان پشتاوپشت دێن تا ئەگاتە مادەکان ئارباکس یان ئارباس حکومەتی زیندووە کاتەوە هەڵبەت ئەم ئارباس ـ ئەگەر هەمان دیاکۆ بێت چۆن مێژووی هێشتا روون نەبووەتەوە.

لە کوردستانی گەورە دەیان شار و میرو سالاری لێ هەڵ کەوتوە و ئەم کوردە چۆن تەنیا بە جەنگ و دین نەبێ ئیستعماری کۆن و پیر نەیهشتوە سیاسەت و رامیاری کورد فێر بێت. بۆیە وا مێژوو کەلەپور داب و نەریت بەێت ـ و باوی کورد لە کونەچاڵەکان کەوتووە ژێر لچەوە.

لە لاپەڕەێ ٥٦ مێژووی کورد و کوردستان ئایەتوڵلاێ مەردوخ دەڵێ: دەوڵەتی سومرو ئەو کاتە بە پێ پاشماوە دیرێنەکان لە مێژووی کەلدان و ئاشوور ـ پێش‌دادی کونترە. چونکە هەروەها کە دیارە مادەکان پاش ماوەێ لولوبیەکان و گوتیەکان، کاسی‌یەکان و هوریەکان مانایەکانن و وا دیارە وا لە شوێنەواری کاسیەکان و نەخشی کۆنەکان لە ئاسەوارە کۆنەکاندا لە دەوری مادەکان ئەدۆزرێتەوە لە هۆنەری ئەو قەومە نەقش و نگاری پێشەیان کەڵکیان وەر گرتووە و ئەتوانین مادەکان لە قەومە دیرینەکان خۆیان کە ناویانمان بردون فێر بۆون لێرەدا دوو دوو شتمان بوو روون ئەبێتەوە یەک دیارەمادەکان هەر قەومەکانی دانیشتووی کێوەکانی زاگرووس کە بە پەێ تی پەڕ بوونی زەمانەوە و وشەی ماد ـ یان لە سەر ناوە. دوهەم مادەکان لە بارەێ جەنگ و رەزمی

بەربەرەکانی و بەیتو باوی گوتیەکان زیاتر بە یەکەوە نزیکن.

مادەکان شاکانی خۆیان بە ڕێزو حورمەتەوە دەفن ئەکرد و بە شێوەیەک ئەگەر کەسی بیەوەی بۆ سەر گۆڕی بچێت ئەبێت خۆی چوکۆلە کاتەوە بوو داڵانی ناو ئەو قەبرە لەو کێوە ئەیانتاشی.

مادەکان لە بارەی چونیەتی جل و بەرگەوە، لەمبارەوە بۆ پرس و جو کردن جل و بەرگی و بەیتو باویان زۆرشت روون دەبێتەوە مادەکان بە ڕەواڵەتدا دیارە لە پەسەک و کڵاو گوڵەنگدار و کڵاو کوزەڵەی و بەستنی شاڵ کە سێ دانە گرێ هەیە بە مانای کردەوەکانی زەرتوشت کە ئاموژگاری بووە و لفکە و گورەوی بە پوزەوانە ئەمانەیان لە بەریان ئەکرد ـ گزنفون نووسەری بە ناو بانگی یونان دەڵێ کۆورش بە وەزیرەکان سەردارەکان کاتێ خەڵاتی پێاندا و جل و بەرگی مادی بووە یانی هەر کەسی شایستەی ئەو جل و بەرگە نەبووە لە بەری بکات.

ئومستد: لە کتێبی خۆی کە لە کتێبی باستانشناسی ماد ل ١٢٦ هاتووەلە قەوڵی ئەو دەڵێ: لە تەختی جەمشید لە نەخش و نێگارەکانی مادەکان لە ناو سەربازەکان دیارن و لە هەموو سەربازەکانی تر جوانتر و جوامێرتر نەخش و نێگاریان کێشاوە ئەمەش نیشانەی ئازایەتی ئەوان بووە. سپری سایکس دەڵێ: جلی ئەرغەوانی شای پارس هەر ئەو پارچەیێ زۆر جوان و کەسایەتی خەڵکی ماد بووە و تاج – ە ریشوودارەکەی بە شێوەیێ کڵاوی ماد دروستیان کرد بوو کۆورش و لە سەری‌نا (باستانشناسی ماد پارس ل ١٢٧ ئێستاش هێشتا لە پاش چەن هەزار ساڵ ئاڵ و گۆڕ بەسەراهاتن هێشتا جل و بەرگی مادی

دیمەندارترین جل و بەرگی سەرزەوینی جیهانە بە داخەوە بڕێک چۆن شان و شەوکەتی ئەویان نیە نای پوشن کە چی نازانێ ئەو جل و بەرگە پیاو ئەکات بە شێر چۆن خۆی رێوی‌یە بە خۆی نازانێ.

نەمری کە کوردستانی ئەمڕۆیە لە دەوری حکومەتەکان پێش ماد بۆون و ئەم ناوەش چۆن دانیشتوانی کوردستان ئازاو نەبەز بۆون «نەمری» پێ‌یان وتووە. خارخار یان هارهار رەنگە کرماشان ئەمڕۆ بێت ـ دیاکونف نووسەری کتێب (ماد) هارهار ـ ی ـ بە هەمەدان ئەمڕۆ زانیوە. و سمیاسی کە شوێنەواری کۆنی مادەکان بووە بە حیساری زانیوە و زاموئای بە ورمیە ئەمڕۆ ناوی ئەبەن مێژوونوسەکان لە کتێبی مێژووی ماد شارەکانی زەهاو، سنە، سلیمانی، بانە و میاندواو و بە تەواوی وڵاتی زاموئا لولونیشان کراوە و پاسوئاش کە بە باکووری خوزستانی زانیووە کیشە یاکیشاسو شاری شارەزۆر ئەمڕۆژە.

موسو یا مسی کە وادیارە زەرینەروود ئێستایە.[1]

ماننا یا مانامنی کە بەشی خوارەوەێ دەریاچەی ورمێیە.

نیسائی یا نیسایە کە فرەێ لە مێژوونووسان بە خواری کرماشان کە ماهیدشت زانویە.

گلیزان: دەریاچەی ورمێ.

مددکوتو یا خۆئارا یا بتوشی ئارا یا سوادکو یا سمنان ئەمڕۆژە بە بیرورای دیاکونوف.

کوک‌کومایا فومن ئەمر یا زیکرتو شاری ئێستا میانە و ئەردەبێڵ.

---

١ – ئەم بیرورا لە تاریخ ماد نووسینی دیاکونوف نووسراوە.

ئەوشیش دشین: شایەد مەراغه بێت.

بێتهمبان: کامیاران.

ساپاردا: هارهار خواری زەنجان (زەنگان یان ئەرزەنجان).

بێتکاری: ناوچەی هەمەدان یان مەنزڵ گای کاسیەکان.

ئەراپخا: کەرکووک یان ئەڵوەند.

ئەندیا: سپێ روود یان چۆمی سپی.

سیبارا: یا سیبوارو نزیکی زەنجانه.

ئاندرپاتیانو: نزیکەی قەزوینه.

کوەخارس مەرزی پارسوایه سوروخوخات ـ یان سراوقات قوروه یا سورەجو.

ئەیزیزتا: سەقزی ئەمڕۆیه.

ئوزیبا: یا زیبیه یا هەرزنویەی ئەمڕۆیه.

ئارازایاش: نزیک به هەمەدانه.

تیلاشوری: دژی گەوره بووه له نزیک سنه.

کیلمان: کولمان خارخار ئێستایه.

شوبریا: یا ئارما دژی له لای تارانەوه.

مادەکان له قیر کەڵکیان وەرگرد و له ئوروپادا به نەوت وتویانه (روغەن مادی).

له لاپەڕەی ۲۱۶ مادەکان بناغەدانەری یەکەم حکومەت له غەرب ئێران. له بارەی

یەکی له حکومەتەمادیەکان بەم جۆره باس دەکات مادەکان له ترس هێرش

ئۆرارتوی یەکان بۆ خاک ماد بوو هەموو قەومەکانی ماد یانی: تورد و دڵ ـ ئاریزانت ـ ماژ ـ ئوستروخان مانایی دەستیان بە یەک گرت هەر ئەم ئیتەحاد و یەک یەتیە مەترسی خستە دڵ دەوڵەتی ئاشوور. تایفە مادەکان بۆون هەموویان دەستی یەک گرتووی برایەتییان داو و حکومەتی بە هێزتریان دورست کرد و لە هەر بارێکەوە بە هێز توانا بۆون و رێکخراوی ئەم حکومەتە بە هێزە لە شاری تەاورلی یان تەئورلی بووە. لە ناوچەێ لەێلاخ ئاوایە کۆنێ یان شارەکۆنێ هەیەبە ناوی تەروالْ کە ئێستا ئەم شوێنە لە ژێر چاوەدێری بووە بە تایبەت ناوچەێ لەێلاخ چوونکە بە قوروە و هەمەدان (هگمەتان) نزیکە کەمتر پاراستویانە و زوبانی فارسی وتورکی کاری لە سەر زارو زبان کردووە و تەتورلی (تەروالْ) زۆر نزیکە لە هەمان کتێب ناو براو لە قەولْ یْ ئوستاد خوالێخۆش‌بوو رەشید یاسمی دەڵێ: خەتی‌یانی رێگەی هاتو و چووی هێرشی ئاشوور بو هەمەدان کە پەێتەختی مادەکان بووە «توئورالْ» بووە و هەر قەلاو دژی لە سەر رێگایان بووە خاپووریان کردووە و ئاساریان لە بانی پاسار نەهێشتوە. و ئاشوریەکان پانسەدو بیست ساڵ لە سەریەک یان بچڕ بچڕ لە ئاسیای ناوەڕاست بۆون و تەواوی قەومە هاوسیەکان باج‌دەری ئاشوور بوون. تەنیا مادەکان هەر لە سەرەتاوە تا ئاخر سەر بە شۆڕشی داوە و یاخی بۆون باجیان بە ئاشوور نەداوە هەر بو ئازادی وڵات تێکوشان و خەوی راحەتیان لە چاوی ئاشوور حەرام کرد و هەر کاتێ هەلێ‌کیان بە دەست کەوتبایە پەلاماری ئاشوریان ئەدا و ئاخریش بە فەرماندەری و چالاکی هوخشتەرە لە حکومەتی ئاشوور لە ناو چو و کوتایی بە ئەو حکومەتەزاڵمە هات.

وڵاته دراوسیه‌کان ماد خه‌ڵاتی زۆریان بۆ حکومه‌تی نارد له جیاتی ده‌ست خۆشانه و ماد له راستی‌دا بوو به رچه‌شکێنی ئازادی سه‌ر به خۆی بوو حکومه‌ته‌کانی دیکه چاویان له ماد برێ و بۆ ئازادی خۆیان مه‌رگیان باشتر له ترس و له‌رز ژیان کردن زانی.
له‌و کاته وا ماده‌کان کێوه‌کانیان گرته به‌ر و شاره‌کانیان چۆڵ کرد و په‌نایان برده کێوه گه‌رده‌ن که‌شه‌کان ئاشوریه‌کان وه‌حشیانه و درِندانه په‌لاماری شاره‌کانی مادیان داو کازوێن ـ ئامارو – پارسینه ـ ئه‌ی‌ریت ـ مس ـ ته‌ئوره‌ اڵی که‌وته به‌ر چه‌پاو ئاشوریه‌کان و ئه‌وانه‌ی وا تووانای که‌ژ و کێویان نه‌بووه وه‌ک پیره‌ژن ، پیره‌پیاو بێ ده‌سه‌ڵات ئاشوریه‌کان به ئه‌سپه‌کانیان نه‌وه هه‌موویان کرده ژێروه.[1]

له‌م هێرشی ئاشوریه‌کان قه‌ڵای سه‌خت و دژواری ماده‌کان که ناوی (داگار) بووه و به‌گومانی دیاکونف نزیک شاری سنه‌یه یان له به‌ین هه‌مه‌دان و سنه‌بووه. ئه‌م قه‌ڵا ئه‌روخێنن و حاکمه‌که‌ی ئه‌کوژن و شاره‌که‌ش ئه‌سوتێنن.

له‌کتێبی ئێران باستان نووسینی پیرنا (مشیرالدوله) هاتووه‌که ده‌شتی له‌ێلاخ مه‌ێدانی فێرگه‌ی ئه‌سپ و جه‌نگاوه‌ری بووه ئه‌گه‌رچی ماد کوتایی به ئومری ئاشووریان هاورد.

سه‌کایه‌کان هێناوه ژێر رکیفی خۆی به‌ڵام سه‌کایه‌کانی قین له دل به هۆی ده‌رکه‌وتنی خه‌یانه‌ت ده‌رچونه وڵاتی لیدیه (تورکیه‌ی ئه‌مرِۆ) و له سه‌ر ئه‌وێ که وڵاتی لیدیه خه‌تاباره‌که‌ی نه‌داوه‌ته‌وه جه‌نگی به ماوه‌ی هه‌شت ساڵ له‌به‌ێن ماد و لیدیه رووی داووه، خوه‌رگیرا له ماوه‌ێ ئه‌م جه‌نگدا وایان زانیوه که ئه‌مه نیشانه‌ی خوێن رژیانه و دنیا

---

١ ـ مێژوو ماد

ئاخریە و هیچکامیان سەر نەکەوتن ئاخری بە ناوجی شای بابل بە ناوی بەخت ئەلنەسر کوتایی بە شەڕ هێنا و شای لیدی کچی خۆی دا بە کواکسار کوڕی شای ماد و بەم چەشنە ئاشتیان بووەوە.[١]

پاش ئەوە کە حکومەتی ماد بە جاسوسی وەزیر کواکسار کە نامە بۆ کورش شای هەخامەنشی نارد و کوورش بەرەو وڵاتی ماد بە لەشکەرەوە بەڕێ کەوت و کوورش کە باوکی دایکی خۆی (کیاکسار) قۆڵ بەست کراو کیاکسار بە هارپاک وەزیرەکەی وت کە تو لە من داخت و کینە بوو قەومی ماد کە خۆیان خاوەن دەسەڵات و بە هێزن تاوانیان چی بوو تۆ ئەبوایە ئەبووایە یەکی لە پیاوەکانی ماد بە سەرکەردەی حکومەتەکە بکردات و خوێشی بکوشتایە با ئێمەیٚ ماد تا ئەمڕۆ پارس لە ژێر رکیفی ماد بوون ئێستە تۆ وڵات و قەومی مادت فرۆشت حەیفت کرد ئەم قەومە نرخی گران بوو بۆ چی بە هەرزان فرۆشتت. و خۆمت زیندوو بە چاڵ بکردایە بەم جۆرە ماد نەکەوتبایە ژێر دەستی ـ ژێر دەستی خۆی. و لە پاش ئەو روخاندنە حکومەتی ماد ئەگەر چی سەدان و هەزاران حکومەت قەڵا و تەختی لە کوردستان بووە و سەرکەردەی کورد بووە بەڵام کورد قەد رووی ئاسودە بە خویەوە نەدیوە هەر بەشیان ئاژاوە و خوێنڕشتن و ماڵ وێرانێ و چەرمەسەری و دەربەدری بووە، و رۆ رۆ دایکان و چەمانی پشتی باوکانی کورد شاهیدی ئەم باسەیە و ئێتر کورد لەت‌لەت و لە ناو خۆیاندا براکوژی و ... هەزاران‌تر بە

١ – لەم بارەوە بیرورای جیاواز هەیە. بریک مێژوونوس دەلی بەهاوکاری بابل وە دەست یەکی کردن مادەکان و بابلیەکان و شەر کردن ماد و بابل لە گەل ئاشوور بوە.

سەریا هاتوو بەڵام بەویش هێشتا چەرخیان لە چەرمە بڕیوە رۆژگاریان تێ پەڕکردووە و وێردی سەر زوانی تەواوی گەلانی جیهان لە قارەمانەێ ئازایەتی ئالا هەڵ گرێ جوامیری رۆژگاران بوو دوژمن بە بیستن ناوی کورد لەرز لەگیانی ئەکەوێت ئەگەرچی لە پاش رووخاندنی حکومەتی ماد هێشتا کۆرش هەموو سەردارەکانی مادی کرد بە دەسەڵاتداری حکومەتی خۆی و لە هەر لایەکەوە هێرشیان بە سەر وڵاتی ئێران ئەکرد. سەربازەمادەکان فەرماندەرەکانی ماد بەرەو ئەو جەنگەی ئەنارد و ئەو شۆڕشە و هێرشە بە زەبری شمشێر ماد ئەکوژایەوە و راستیەکەێ ئەوەیە لە و رووخاندنە بەرەو ئەولا ماد بوو بە بەڵاوەگەڕێن پارس و ئێران تاکوو ئێستا دەیان شەڕی قورس واکورش و داریوش لەگەڵ بابل و ئیلام و لیدیە و ... بەرپا بوو هەموو سەردارە شەرکەرەکانی فەرمانرەوای ماد بوون بۆ ئەوەی باشتر رۆون بێتەوە سەرەنجی مێژووی دەهەزار ساڵەی ئێران و ئێران باستان بدەن تورک و ئەرەب ئەگەر بون، بون بە قوربانی ئەو قەومە خۆیان کردیان بە خۆیان بویە دەڵێ خۆم بە خۆمم کرد.

هەروەها کە باسمان کرد پاش روخاندنی دەوڵەتی ماد ئیتر کورد حکومەتی یەکگرتووی نەبووە بەڵام لە هەر ناوچەو دورگەێ بو خوێ حکومەتی نیمە سەر بە خوێ لە ژێر چاو دیرێ دەوڵەتی مەرکەزی بووە بەڵام یان کەمدەوام یان تووشی شەڕو براکوژی بوون و بڕێک لە شاکان بۆ سیاسەتی خۆیان هەر لە کوردەکانیان بە حاکمی ناوچە کوردەکان کردووە تا خۆیان ئاگری شەڕی حەق‌خوازی بکوژێنەوە بەڵام زۆریشیان زۆر وریا لە کارەساتەکە تێگەیشتن کوو ئەبوونەوە و ئەگەر چی لە لایەن شاکانەوە بە

فرمانڕەوای داڻەنران و دەست نیشان بۆون پاش ماویەک سەریان به دژی شاکان هەڵ ئەدا.

برێ له نووسەره بورژوازەکان کوردیان به چەته و تاڵانگەر ناوبردوە، بەڵام به ڵگەی مۆرکراومان هەیه که تورک بۆ له برچاوخستن کورد، کوردەکانی مەجبوور کردووه وڵاته دراوسیەکانی تاڵان و تاراج بکات. هەروەها بۆ براکوژی کورد، فارسەکان چەکیان به دەربەگیەکان داوه بۆ تاڵانی خودی کوردەکان وئێستاش تالان و تاراجی مەنمێ و گەڵواخی بۆ ناوچەی لەیلاخ، باوکه پیر و دایکه پیرەکان دوبارەی ئەکەنەوه و شەریفدەوڵه سەرکەردەکانیان به بنەرەت باشگای سنەدژی ئەمرۆی دانا...

کتێبی خەبات له رێگەی کوردستاندا(ن خەلفین) له زوانی کۆرزون ئەڵێ: کوردەکان به بێ بەزەی و فێڵبازی و بێ یاسایی له مێژودا ناویان لێ بردوه. کوردۆلۆک ئەڵێت هەر کەسێک تۆزێک خەریکی خزمەت به کورد بێت هیچ کەس هیچی بۆ ئەنجام نادات تاسزای کوردبوونی بچێژێت. تورک و ئەرەب پێان خۆش نیه ناوێ له کورد ببرێت.

کوردستان له سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا له نێوانی ئیمپراتۆریەتی ئوسمانی و ئێراندا بەش کرا. به لەبن گوێ خوێندن پیر کەفتار ئینگلیز ئەم پیلانه کریا و له سەرەتای سەدەی شانزدەهەم دەستی دیپلوماسی له کار بووه یانێ سێسەد ساڵ پێش دەستێ بۆ له ناو بردن فەرهەنگ ومێژوو و مێشک کورد له بەینا بوه. به شەر کردن وتاڵان ئاو و خاک دەستی له کار بووه تا له نێوان ئێران وکورد جیاوازی بێت. وله ئێرانی بونی، کورد بێگانه بێتەوه.

له راستیدا هەموو شاکان و دەوڵەتەکان کوردیان بەرەولای خۆیان ئەکێشا چۆن کورد تەنیا بۆ شەڕ له ناو هێزی سوپای خۆیان گەرەک بوو گەرچی ئەبو مسلم خوراسانی کورد بوو خزمەتی زۆری بە ئێران و خەلیفەی ئیسلام کرد یان [1] سەلاحەدین ئەیوبی کە لاپەڕە کتێبە ئیسلامیەکان بە قارەمانی سەلاحەدین ئەیوبی رازاوەتەوە بەڵام لە سەر بە خۆی خاکی حکومەتی بە ناوی کوردستان خەبەرێ نیە یان لە کاتێ هێرش ئیسلام کە لە کورد چ کوشت و کوشتاری کراوە هەر لەو سەردەمە تاکو شەڕی شائیسمائیل سەفەوی کە رەفتار لە حەقی کورد چەندە زاڵمانە بووە و دەر بە دەر کردنی کوردەکان بەرەو خوراسان و لە برسا لە ناو رێگە مردن نەخۆشەکان منداڵ لە بار چووێ ژن دووگیانەکان و ...و یەکیک کە کوردە بە دیل‌گیراوەکانی وا هەلامەتی کوشتنی شائەباسی ئەدات، و پارتی‌زانی کوردەکان بۆ چاوترسین مەنوچهرخان و سپەسالار، و هەروەها شەڕی نادرشا بە کردەوەێ دڕنددانەوە، و رەوڵی کوردەکان لە شکست‌دانی ئەفغانیەکان لە ئەسپەهان و دەرکردنی تورکەکان ئوسمانی لە ئێران، و بەشداریان لە گرتنی هەرات، و حەماسەێ هەڵ خوڵ‌قاندنی کورد لە گرتنی هندوستان، و بەشداری کورد لە جەنگەکانی ئێران و توران بە بەشداری پیاوە جەنگیە نەبەزەکانی کورد لە ناو لەشکری نادرشا، شکست‌دانی سوپاێ رۆم لە کوردەکانی خوراسان، کوژرانی نادرشا لە قوچان، رەوڵی کوردەکان لە کوشتنی نادرشا، و بەربەرەکانی لە گەڵ کوڕی نادرشا، وەسڵەت کردنی خزمایەتی فەتالی‌شا لە گەڵ کوردەکان، فەرمانرەوای کورد لە مەشەد و سەرهەڵدانی کورد دژی سەفەویەکان،

---

١- بیروڕای جیاواز هەیەلەم بارەوە

ڕەوڵی گرینگی کورد لە شەڕی ئێران و ڕووس و تورکیا و ئەرەب و ڕووس، پاڕانەوە ئەباس مێرزا لە سەفیری ئینگلیز بۆ سەرکوت کردنی کورد، جەنگی تەنوتەن کورد لە گەڵ داگیرکەران، پەیوەندی شاە ئەباس لە گەڵ ئەردەڵانیەکان، خویشک شاە ئەباس بۆ سلێمان خان ئەردەڵان و ...

ئەمانە هەمووێ ئیشارە کورت و کوڵ لەبارەێ ڕەوڵی کوردەوە لە ئێران وڵاتە دەراوسیەکان کە ئەگەر لە بارەی هەرکامیان لێ بکۆڵێتەوە یەکێ لەو بەسەرهاتە کتێبی چەند سەد لاپەرەی باس ئەوەێ ئەویش لە ئاخری کە بێ ئەوە قەڵەم بەرەولای دڵسوزی بۆ کورد بچەرخێنێ دێتە سەر ئەوە کە لە ڕاستیدا هەر بەدەست و هێزی توانای کورد کارەساتەکە کوتای پێ هاتووە بەڵام چۆن کوردەکان بیریان لە دوا ڕۆژ نەکردوەتەوە ؟!! و ئەم کوردانە بوونەتە تیری ئامانج بۆ بڵاگەردانی ئەوانەی و بە دەستی ئەو حکومەتەماڵ و خێزان و تاڵان سەرگەردانیان بە سەر هاتووە کە چی خۆیان لەم کارە ساتە بێبەش نین لێرەدا سەرەنجتان بۆ بیروڕاێ چەن خاوەن قەڵەم رادەکێشم.

وەک گزنفون دەڵی: «کوردەکان لە دڵ گەورەێ بێباکی لە سەرزەوین بێ وێنەن».

یان شمیم دەڵێ: «ئەبی دان بەوەدا بنێین کە کوردەکان باشتر و فرەتر لە قەومە ئێرانیەکان داب نەریتی و ... خۆیان پاراستوە و تێکەڵ بە بێگانە نەبۆن».

دەرک‌کنیان دەڵێ: «کورد لە هەر جێگایەک بێت خویێ کوردانەێ خۆی نیشان ئەدات و قەد سەر شوڕی ناکەن و دایم بۆ شەڕ ئامادەن و یان کاتێ کە ئێمە لاپەڕەکانی مێژووی ئێران ئەدەینەوە پاش چەن هەزار ساڵ پێش هەر کورد چەرخی ئێرانی چەرخاندوە وەک

لە ئێران کە کاوەێ ئاسنگەر چارەنووسی ئێرانی بە تەواوی گۆڕی و زوحاکی مار لە شان کە چ بەسەرهاتێکی بە سەر ئێران هاوردوە کوردیک بە پیکی ئاسنگەری، زوحاک ئەکوژێت و یەکێ هەر لە کوردەکان بە سەر تەختدا ئەنێ کە ناوی باوکی ئاپتین بووە و فەرەیدون کە لە کێوی ئەلوەند خۆی شاردوەتەوە بە سەر تەختی دائەنێت وتەهەموورس کە لە نەتەوەکانی خەسرەون و فەرەیدون یەکەم پادشای بووە کە بناغەدانەری سلسلە کیانیەکان بووە هەخامەنیش‌یەکان و ساسانیەکان لە سەرکوت کردنی کوردەکان دەستیکی باڵایان هەبووە. ئەردەشیر ساسانی کە خۆی کورد بووە کینەی فرەێ لە کوردەکانی لە دڵیا بووە و لەقات و قڕی کوردەکان لە هیچ تەقەلای ڕانەوستاوە ئەگەرچی بڕێک جار لە کورد شکستی خواردوە و هەر لە هەخامەنیش - ەکان تا حکومەت شاهنشایەکان هێچکام بەزێیان بە کورد دانەهاتوتەوە و لە هەموو فەن و فێڵی بۆ لە ناو بردنیان کەڵکیان وەر گرتووە کە چی کوردی هەژار بووەتە تیری قەزا و قەدەری ئەو زاڵمانە و ئەمانە هەموو ئەوە روون ئەکاتەوە کە کورد پێشەێ لە ریشەێ سەری تەسلیم دانانەوێنێ. مێژووی کۆنی کورد سەراسەر پڕە لە شانازی و شەرەف ئەگەر چی ئەسکەندر تەواوی ئیرانی گرت، قەومی‌تر وەکو کورد لە بەریان هەڵوێستی نەکرد تەنیا توانی جێگەێ لەشکەرەکەی خۆی بکاتەوە وە نەیانتوانی لەشکەرەکەیان لە کوردستان بڵاو بینەوە. تا یەکی لە سەربازە ئەسکەندەریەکان لێان جیا ئەبوو دەست بە جێ گۆڕبەگۆڕیان‌ئەکرد تا دەرس ئبرەت بۆ دوایەکەیان بێت.

سەرزەوین کوردەکان هەمیشە مەیدانی جەنگ و قەتڵ وکوشت وکوشتار بووە و تاڵان

و جەردەی لە خەڵات حکومەتە زاڵمەکان بۆ کورد شەڕێ ئێران و رووم و ئەرەب هەموو لە خاکی کوردستان رووی داوە شۆڕش بابەک خورەمدین لە گەڵ ئەباسیەکان و ئەبو مسلم خوراسانی و مەروان و حەمار بڵێسە شەڕی لە سەر پێڵزەهاو بووە و روخاندنی دەوڵەتی ئومەوی لە جەنگ زاب شەڕی کرد پاش ئەوە کوردستان لە ناو جەرگەی شەڕی تورکانی سەلجوق، مەغولیەکان و تەیموورییەکان کانگای توندترین شەڕی چارەنووسی بووە و ئەم شەرە چەن ماڵ وێرانی دەربەدەری بووە لێرە ئێمە ئەگەر بیرلە ڕابردووە بکەینەوە ئاموژگاری ئێمەیە کە چۆن خۆیان (کوردەکان) ماون و یان بۆ چی شەڕ ئەبێ هەر لە ناو خاکی کورد روو بدات. ئەگەر چی لە مێژووی کونەوە تاکوو ئەمڕۆ قەومی کورد لە خزمەت و یارمەتی‌دانی حاکمانی باش و بە ئینساف خۆی قوسوری نەکردووە هەر میللەتی و یان حاکمی کەوا دانی بە مافی کوردانا بێت و بە لایەنگری یەکڕەنگی لە گەڵی هاتبێتە پێشەوە دایم خەیری لە کورد دیوە و لە قابلییەت و جەسارەتی شوجائەتی کورد کەڵکی باشی وەرگرتوە و لە خنکاندنی ئەو حکومەتە بە یارمەتی کورد نەجاتی بووە و ئەگەر قەومی حاکەمەکە ویستویە زوڵمی لێ بکات و تەجاوزی بە مافی رەوای و شەرەفی بکات بە پێچەوانە زەرەرێکی زۆری پێ گەیشتووە. حوکومدارانی ئاشوری کە دایم لە گەڵ کورد کینەیان بوو ئاقیبەت هەر بە زەبری کاری‌دەری کورد لە بەین چوون و لە دەورانی حکومەتەکانی (پارت) ئەشکانی و ساسانی و ئمپراتوریەتی روومدا مەیدانی شەڕ لە کوردستان بووو زیاتری کورد لە هەر لایەکێ بوایە ئەو دەستە سەرکەوتوو بوون لە دەوەری ئیسلامیدا دەرحەق بە حکومەتی ئێران وەفا و راستی راستەقینەدا خۆیان بە جێ

هێناوه و لەگەڵ لەشکری ئیسلامدا بەربەرەکانێیان کرد. قەومی کورد، لە تەشکیلی خلافەتی ئەبباسیدا خزمەتێکی زۆری کرد و لە ئوردوی ئەبوموسلمدا ئونسریکی تێکوشەرو رەوڵدار بوون.

والی کوردستان و ئازەربایجان هێرشی ئوردوی روومی بە یارمەتی ئەشایری کوردەوە تێک شکاند.

مەلکشای سەلجوقی بە بەرگری قاوورت، و سوڵتان مودودبو فەتحی موسڵ و سوڵتان موحەممەد کوڕی مەلەکشا کەڵکی زۆریان لە هێزی کورد کرد.

قەومی کورد بو خەلافەتی ئیسلامیەت زۆر خزمەت و وەفاداری لە خۆبوردنیان لە خوێان نیشان داوە.

لافاوێکی تورک (غەز) کە رۆومی کردەبوو وڵاتی ئیسلام لەکوردستاندا و بە هیمەت و توانای ئەشائری کورد و تەدبیری ئومەرای حکومەتی مورروانی بەربەست بوو.

لایەنگری راستەقینەی کورد و کوردستان و یارمەتی بە نرخی کورد لە زەفەری[1] سوڵتان سەلیمدا جێگە و پلەێ بەرزی لە مێژوودا هەیە شائیسمائیل سەفەوی هەر لە هێزی کورد بە پلەێ قودرەت و بنە و بارگای خۆی توند کردەوە کە چی دواجار بوو بە پشیلە و سپڵە بۆ گیانی کورد.

ئوردوی موکری کورد شاەئەباس مەشهور بووه لە شەڕ و شوڕی ئێران سەر زوبانی خەڵک بووه. والیەکان ئوسمانی بۆ دژی ئێران لەکورد ئەپاڕانەوە لە ناو لەشکەرەکەیان بن

١ – نفوز ـ دەست چوون.

تا ئێران بترسێنێ. کورد مێژووی پڕە لە حەماسەی ئازایەتی، حاکمەکان هەموویان کوردیان بۆ رۆژی هێمەت ویستووە بەڵام لەکاتێ هێمنایەتی و خۆشیان کوردیان لیێ بێ‌وەری کردووە لە شەڕی ئوسمانی و رووس و ئێران کورد تۆش زەرر و زیانی زۆر بۆ حکومەتی رووس زۆربە وردی ئەحواڵی کوردی شوێن ئەگرد و کارێکی کرد کە کورەدکانی قەفقازی هێنایە ژێر رکیفی خۆی بۆ رۆژگاری تەنگانە تا وڵاتە دەراوسیەکان لێی بترسن و لەم دوایەدا لەشکری جیاوازی لە کوردەکانی قەفقازی پێک هێنا.

حکومەتی ئوسمانی ئەگەر ئونسری کوردی نەبو و دایم کزو لاواز بوو ئەویش سیاسەتی رووسی و ئێرانی کردە پێش لە کورد لەشکری رازاندەوە و ئێران کاتێ کە زانی لە دەستی رووسی وئوسمانی حاڵێ شرە کوردەکانی بە برای مێژووی خۆی زانی ئەویش لە کوردەکانی هەڵخراندوە ئەمانە هۆی چی بووە ئایا ئەم کوردە بو خۆی لە سەر ئاو خاکی خۆی شەڕی بکردایە و بو خۆی حکومەتی پێک بهێنا چاکتر نەبو تا تیری قەزای دوژمنانی خۆیان بن. باشتر نەبوو بیرلەوە بکەنەوە مەگەر نانەلەم بۆون و ئەگەر یەکی وەک شێخ ئوبەیدڵلا یان ئیبراهیم پاشا یان بەدرخانیەکان و قازی و میرموحەممەد ئەم بیرەی کردبێتەوە کەسانی دیکە وەک مەلا خەتی ئەوانەی‌وا زەرری خۆیان کە خەێریان لە شەڕ و دوو بەرەکی لە ناو کورددا دیبو نەیان هێشت ئەگەرچی کە خۆیان رۆیشتن بەڵام هەرکەسێ وا حەزی لە براکوژی و دوو بەرەکی و نانی خۆیریەتی و دوو رەنگی و ئاگری حەق خوازی کوردی دامرکاندوی رۆژ بە رۆژ لە مێژووی کورددا رسوا دەبوون و ئەوانەێ وا بۆ سەربەخۆی کورد ژین و ژیانی خۆیان تەرخاندابێ و لۆمەێ کەس و

ناکەس یان بیستبێ هەر بە ئەو تەکلیفی خۆیان زانی بێت هەموویان ناویان هەر زیندوە جا ئەگەر ئێمە هەموو یەک دڵ و یەک رەنگ بێن ویان بۆئەوەی خۆمان، خۆمان نەخۆین کەسی تر چاوی بۆمان خاێن نابی و مێژووی خۆمان بناسین ئێتر وامان بەسەر نەدەهات لە مێژوی ئێرانی گەورەمان لەت‌لەت نەئەبو و کوردیش وای بە سەر نەئەهات.

قەومی کورد ئەوندە شانازی هەیە کە برێک لە بێگانەکان ئینسافیان لە دەس نەداوە باسیان کردووە بەڵام ئەوەشیان وتووە کە بێ‌سیاسەتن و خۆیان لە بەین ئەبن هەر ئەمەش بووەتە هۆی دوواکەوتنیان.

به داخەوه لەم دووایه بۆ ئەوەی که فەزڵی کورد دەرنەکەوێت برێک له نوسەرەکان له درگای فەنەوه دەرهاتوون و دەڵێن که حکومەتی زوحاک له تەمەدونێکی واڵا بەشدار بوه ئایا هەر حکومەتێ وابێ هۆی ئەوەیه که زاڵم خوێن رژێنه؟ هەرلەم چەرخەدا به چاوی خۆمان دیومانه که زۆربەی ئەو حکومەتانه وا بەلای خۆیانەوه پێشکەوتن وموتەمەدنن خوێنی هەژاران ئەمژن و چینی کومەڵایەتی له ناو وڵاته هاوار دار ئەکات و تازه کومەڵی بەردەداری له ناویان دا به جۆرێکه که خۆیان بوی وشەی ئوروپای دائەنن زیندو بوەتەوه ئایا هەر حکومەتێ که بەلای خۆیەوه پێشکەوتو بێت ئەبێته هۆی ئەوەکه زڵم و زۆری تێدانیه؟. ئیستا ئەگەر زوحاک تەمەدونێکی پێشەسازی بێت

ئەبێته هۆی ئەوه که نابەرابەری زڵمی تێدانەبوه، رەنگه ئەمه بوو ژێرکردنەوه گەورەی کاوەی ئاسنگەر تازەی دایان هێنا بێت ،

## «پەرچەم»

له بارەی پەرچەمەوە ئاڵاکانی حکومەتی هۆی روخانی تەخت و بەختی بە دەستی کاوەی ئاسنگەر لەوکاتەوەچەرمی کاوە بەنیشانەی ئا ولات دا هاتوه ، زوحاکی شان زامدارکه زوحاک ئەوەندە زوڵم ئەکات بۆ تیماری زامی شانەکانی سەری لاوەکان ئەبڕی و مێشکیان له ناو ئەو زامە ئەنن تا ئەو زام سەر شانیە ئوقرە (سرەفت) بگرێت ئەم کارەساتە ماوەیەک درێژەێ ئەبێ و هەر رۆژێ کەسێک سەر ئەبڕن لەو وڵاتە خەڵک بە تەنگ دێن و نیوەێ ئەو وڵاتە بەم چەشنە لە ناو ئەچن وکاوەی ئاسنگەر کە کورد رەسەن ئەبێت دوو دانە کوڕی کە ناویان قارون و قوباد بووە زوحاک فەرمانی سەربڕینیان ئەدات تا مێشکان بۆ تیماری زامی شانی زوحاک بێرن و کاتێ کە کاوەی ئاسنگەر ئەوە ئەبیسێ چەرمەکەێ کە لە پێس گابووە بە سەر چێوێک ئەکات و ئەو چەرمە بە سەر دارەکەوە خول

ئەدات و هاوار ئەکات و خەڵک بە دەوری خۆیا کۆ ئەکاتەوە و بەم چەشنە ئەسبابی روخاندنی حکومەتی زوحاک پێکدێت. بەم جورە چەرم مانای ئەمڕۆژی پەرچەمەکە بەدەرەفشی کاوەیان (درەوش کاوەیەکان) ناوی ماوە، کاوەیەکان لەمەودوا بە چەرمەکە بە درەفش کاویان ناویان نیاوە، سەری و لە کاتی حکومەتی فەریدون زۆر ریزیان بۆ داناوە و بە نیشانەی ئاڵای رزگاری رێزیان لێ گردووە. نیشانەێ ئارمانی (ئاڵا) ئەو میللەتە بووە هەر لەو کاتە تاکوو ئەمڕۆ پەرچەم نیشانەی رەسمی بوونی ئەو میللەتەیە و بە میللەتی سەربەخۆ دەناسرێ. بەم جۆرە دەرئەکەوێت کە ئاڵایان پەرچەم کاوەێ ئاسنگەر بناغەدانەری بووە و ئێستا هەر وڵاتو بزوتنەوەی بۆ خۆی پەرچەمی جوراوجور بە نیشانەی ئاڵاێ خۆی هەیە.

پاشی تێپەر بونی چەند هەزار ساڵ ئەگەر کەسێ زۆر بێرەحم و بەزەی بێت پێی دەڵێن ئەوە زوحاکێ کە بۆ خۆی وگەلی کورد هەر روداوێکی مێژووی چ خۆش و ناخۆش لە سینگی خۆیدا پاراستویە و زڵم وجەوری زوحاک ئەگەر چی بە شێوەی داستان دەرهاتوە بەلام وێردی زوانی هەر کەسیکە یان مەسەلە دەلێن چەن قەرن بگورێ تا کاوەێ تر هەلکەوێ.

# «کوردستان»

کوردستان به مانای شوێنێکه وا کوردی تیدا ئه‌ژێت و زۆربه‌ێ کورد له رێگه‌ی ئاژه‌ڵداریه‌وه و کشت و کاڵ ژیانیان ئه‌به‌نه سه‌ر و ئێستا له لایه‌ن ئوسمانی، له کاتێ ئوسمان پاشا حاکمی ئیمپراتوری ئوسمانی بۆوه ئمپراتوری ئێران له کاتێ ئه‌فشاریه‌کاندا به‌ش کرا.[1] کاتێ وا ئه‌مرۆ ته‌واوی ئه‌م شۆێنه‌واریه واکوردی تێدا ئه‌ژێت هه‌موویان به‌کورد و خاکیان به‌کوردستان حه‌سێب ئه‌کرێت و تا بگاته لورستان به موڵکێ کورده‌واری ئه‌ژمێریت و لوره‌کان که لقێکی گه‌وره له کورده‌کانن که تووش شه‌ر و شورێکی زور بوون.

دوای روخاندنی (نینوا) له ٦١٢ پێش زاین یانی ئه‌و ده‌مه وا ماده‌کان حکومه‌تی ئاشوریان رووخاند، تا ئه‌و ده‌مه کوردستان و ئێران یه‌کپارچه بو تا شه‌ڕی چالداران له

---

١–له‌و کاته به‌دواوه ئیتر بۆ دایم کوردوستان ناوی گرته خۆیه‌وه له ناو حکومه‌ته کاندا.

سال ١٥١۴ زاینی بەگشتی کوردستان لەم جەنگە کرا بە دوو لەتەوە و پاشان بە چەند بەشەوە قەومێ کورد تۆشی کێشەێ زۆر بووە، لە تاڵان و داگیرکردنیان لە دەستی بێگانەکان زۆر تەنگانەو چەرمەسەریان بە خۆیانەوە دیوە، ئەم قەومە هێرشی سلوکیەکان ـ ئەرمەنیەکان ـ رومیەکان ـ بیزانسی ـ ئەرەب ـ تورک و سەلجوق و مەغوڵ و لە گشت بەدبەختی‌تر خەیانەت دەست چەپەڵی خۆمالیەکان بە خۆیەوە دیوە هێشتا لە مافی چاوی نەپووشیوە بە دەیان ساڵ سنوورلە بەیندانان وڵاتە داگیرکەرەکان قەد سنووریان لە بەین خۆیان نەناسیوە.

لە لاپەڕە ٣٨٧ مێژووی ماد تەرجومەێ کەریم کەشاوەرز هاتووە کە هارپاک کە لە ئاستیاک (ئاژدی‌هاک) دڵڕەنجا بوو حکومەتی ماد فرۆشت بەکۆرش و تەنیا ئاستیاک ئەوەی بە هارپاک گوت بێ‌حەیا خۆو فرۆش تو لانی کەم بە یەکی لە مادەکان تاج و تەخت وڵاتی ماد بفرۆشتا حەیفت کرد و زۆر ئەم قەومە نرخی‌گران بوو بو بە هەرزان فرۆشتت و کاری تو (هارپاک) کردت لە جێگەێ ناوی چاکە جێگە لە ناوی نەنگ و نفرینت بۆ خۆت بە جێ نەهێشت من لە حەقی تۆ شاید خرابیم کردەبێ ئەویش خۆت بائیس بوێت کە بە قەوڵی منت نەکرد ئەوەتە ئاخری کۆرش کچەزای من کاری خۆی کرد و وڵاتی ماد و مەردمی ماد سوچیان چیە لە ژێر دەستی قەومی وەک پارس بژیت کە خۆیان لە ژێر رکیفی مادن بوون. چون لەو سەردەمە پارسەکان لەگەڵ مادەکان یەکێ بوون و هارپاک ئەو جیاوازیەی خستە نیوان.

# جیاوازی

بۆیەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٥ لە لایەن ئیمپریالیسمی پیرەوە (ئینگلیز) بە هان دانی تورکیا دابەش کراوە و بەشی زوری بە تورکیا داوە لەو ساوە تاکۆ ئێستا کورد رۆوی ئاسایشی و بەختەوەری بە خۆی‌یەوە نەدیوە و لە هەر دەوڵەتی دابەش کراو خەڵاتی جگەلە کوشتن و ماڵوێرانی دەربەدەری پێ نەدراوە وڵاتانی دیکە هیچی‌تر نەبووەو مرۆڤ سەری سورِ ئەمێنی کە بەم هەموو کارەساتە دڵتەزینەوە چۆن هێشتا زمان و ئەدەب و بەیتوباوی هەروا ماوەکە بێ ئەوەێ دڵسوزێک بەزەیی بە حاڵی ئەم قەومە نەبەزە بێت بەڵام چارە رەشی کورد لە سەر نەبەزی و دلێری بوە.

ئەوە لە پێشەکی کتێبی کەنداڵ عصمت تەرجومە دوکتور یونسی لەکتێبی (کوردەکان) دەڵێ: کەس نیە بڵی کە چۆن سەدام دەیان هەزار کورد کەباب و قاورمە ئەکات بۆ چی حوقووق‌زانان ناڵێن بۆ چی ...

بەڵام کووەیت چی هاواری داگیرکردنی بە دەست هەر ئەرەب دنیای خستە مەترسی جەنگی سێهەمەی جیهانیەوە بەلام کورد. تورک و ئەرەب و روس داگیری ئەکات کەس

نیە بڵێ ئەمانەش هەر بە ناو مرۆڤ حیساب بکرێن. ئەگەرچی کوردیش نەوتی کەرکووکی هەیەیان خۆدی کوردەکان بۆ چی بە گیانی یەک کەوتوون بۆ ئەوەیەکە خوتان لە بەر تاقە پیاوێەک بە هەزار کردەوە بیر ناکەنەوە و نابێ بە ئاوێنەی ئیبرەت مەگەر ئەم هەموو بزوتنەوە لە کوردستان رووی دا بۆچی سەری نەگرد کوردەکانیش خۆیان لە شکەستدانی بزوتنەوەکاندا بۆ سەربەخۆیی بێتاوان نەبۆون دووبەرەکی و براکوژی لە بزوتنەوە و ئەوانێوا لە هەرکات و ساتدا بە قەوڵێ خۆیان کۆپانن و هەر خەریک گیرفان پڕکردنن و سەرباری هەموو دەزانن و بگرەلە سیخوران و خووفروشان خراپترن چۆنکە بە هەر لای بای بێت شەن ئەکەن خۆیری و بێبارن بۆ برا و نیشتمان و گەڵ و هۆزیان دڵ سۆزنین و بەهەست و تینی هەر هەلی بۆیان کەوێت قازانجی خۆیان ئێستا ئەبینن نەتەنیا کوردستان با دنیا ئاو بیبا دڵیان بۆ برای خۆیان داناچەڵەکێ با بەم جورە کورد نیم گۆڵ نەبرژاوانە بەڕاستی ناکورد و ناکەس خۆیری و نەنگترین پیاوان و ستەمکارترین پیاوەکانی مێژووی گەلی کوردن بزوتنەوەکانی کورد زۆر بۆون هەر لەکاتێ شێخ سەئید پیران ـ سوڵتان سەلیم ـ ئەمیربەدرخان و شێخ بارزان و شێخ مەحمود ـ قازی موحەممەد (پێشەوا) سمکۆ و وردە شەڕەکانی ئارارات و ...

هۆی چێ بوو کە یەکیان نەگردوە بوچی تێک شکاوە بۆچی و هۆی چی بوو. ئەبێ ئەوانەوا هۆی شکاندن و دواکەوتنی بۆبێت ببێتە ئاوێنەێ ئیبرەت.

مینورسکی دەڵێ: کورد ئازا و دلێر و نەبەزە و قەد سەر شوڕی قەبووڵ ناکات کە چی لاپەڕەکانی مێژوو ئێران بە بریقەێ شمشێری کورد روونە، بەڵام سیاسەتیان نیە بێ

سیاسەتن و لەبارەیْ سیاسیەوە کزن وایە بەڕاستی ئەگەر گەلی کورد ئاوڕیْ بەرەو دوابکەتینەوە زۆربەیان لە بیْسیاسەتیە یا شکاون و فریویْ فەن و فیْلی باڵویزخانەکان خارجی تاکو حکومەت مەرکەزیەکان کە لەبارەیْ شەڕەوە نەیاتوانیوە بەرامبەر بە کورد راوستن کە چی بە سیاسەت بزوتنەوەکەیان چەک و پەک کردووە بۆ نموونە زۆربەی باڵویزخانەکان جاسوسی حکومەتەداگیرکەرەکانن بە قەوڵ و بڕیاردان تا خۆیان دیسان گورج ئەکنەوە بۆگیانی کوردی هەژار و دڵساف لە تورکیاو ئیراق.

کەماڵ ئاتاتورک رووی هیتلر و... جەنایەت کارانی مێژووی سپی کرد و لاپەڕەیْ وا لە مێژوودا بو حکومەتە وەحشیەکان تەرخاندراوە بوەتە خەڵاتی کە ماڵ ئاتاتورک بۆکورد ئەوەیە کە لە چلەیْ زستاندا کوردەکانی تەفرە و توونا کرد و بە فڕۆکەیْ بومب هاویْژ دیْهاتەکان کوردەکانی کاول کرد کە ژن و کچ و منداڵ دەربەدەر بۆون و بەسەر ناموسیان دەست درێژییان کرد و ماڵویرانی و دەربەدەری پیرەپیاو پیرەژنان کوڕو کچی کوردی بێچارە کران بە پەتیداری سیدارە و کە ئەمانە لە ترسا هەڵاتون لە کناری گومی وان دەسگیر کران و سەریان بڕیوە و سەرەکانیان لیْ جیا کردونەوە و لاشەیان ئەنجن ئەنجن یان کرد (لە کتیبی کیشەیْ کورد دوکتور بەلەج شیرکو ل ٨٦ نووسیویوە تورکەکان بە بیانۆی بەرپابونی شۆڕشی ئاگری داخدا ٣٢٠ گوندیان کاول کرد و دانیشتوانی ئەم گوندانەشیان کە ژمارەیان بە دە هەزار کەس دەگەیشت هەموویان پیر و منداڵ و ئافرەت بۆون لە دۆڵیْ زیلان کۆ کردەوە بە فڕۆکە ئاگربارانیان کردن بە ناشیرینترین شێوە هەموویانی لە بین برد، بەڵی ئەمە مافی میللەتی بوو کە خۆی لە کاتیْ حکومەت کردندا

دیل و یەخیسری ئازاد ئەکرد و خۆی دادگەری دەکرد لە زیدو نیشتمانی خۆی ئاوای بە سەر بێت هۆێ چیە چی بووە؟ سەرسەریەکان بەتەمای دابەش‌کردن ئەو ماڵ سامانی براکانی خۆیان هەڵگرتوە.

گیرفانپڕکەرەکان چۆن نامرن ئەمانە ئەژنەفن بەڕاستی نابێ بە مرۆڤ ناویان ببرێ ئەم کارە ساتە دڵتەزینە و هەزاران‌تر مەگەر روژی بۆ زار و زەوین و میرات بەر کوژراوەکان بن وا بەو چەشنە کوژراون ...؟!

بەڵام نیشتمان پەروەرانی کورد ئەوانەی‌وا لە ئەوتێک شکاندنی شۆڕشەکانی بزوتنەوەکان دەستیان لە خەبات هەڵ نەگرت و لە بارەێ فەرهەنگی بە رۆژنامەکانی ئەودەمە خۆیانیش لە خۆیان مایەیان نیاو گۆڤاری کوردیان دەرخستوە و بەم چەشنە بانگەوازی مەزلۆومی کوردی هەژار و بێ کەس‌یان بە نەتەوەکانی دیکەێ جیهان گەیاندووە.

دوکتور کامران بەدرخان ئاڵا هەڵگری گۆڤاری کوردی و لە زانکوێ فەرەانسەدا ئەدەبیاتی کوردی دەرس داوە و بە پەی وەسیەتی خۆی ماڵ و سامانی لە رێگەی کوردی‌دا خەرج کراوە گلەی کردوە دەڵێ بەداخەوە کوردەکان لە کار و باری ئیداری‌دا و بەیان کردنی دەردی خۆیان ناخوێنن ونانووسن بەداخەوە لە تورکیا کاری پەیجووێ لە هەر بارێکەوە قەدەغەیە بۆ ناوچەێ کوردستان و کاربەدەستانی تورکیە تئوری و بەڵگەی مێژووی بەدەستەوە ئەدەن کە کوردەکان تورکیە هەر تورکی کوێستانن؟! و ناو کوردستان لە تورکیا قەدەغەیە و بە کوردستان دەڵێ (ئاناتولی شەرقی)؟! لە بەر ئەوە کە بە دابەش

بوونی کوردەکان ئاشیرت نەبێت و جلو بەرگی کوردی لە تورکیا قەدەغەیە لنینی کومونیست وتویە: بەرگریّ کردن لە حەقی هەر میللەتیّ بیّت بوو سەربەخۆیی زۆرکاری ئەستەمە.

لە زۆربەیّ ناوچەکان کوردستان بە تایبەت ناوچەی لەیلاخ رەوشتی زانیاری بەرەو کوردی چۆن زۆرکزە وە کورد بۆونیّ لە باریّ سیاسیەوە و فەرهەنگیەوە ۹۶ دەرسەد هیچیّ لە مێژووی خۆیان نازانن بە پەی تەحقیق یەکی لە فەرهەنگیەکان ئەوانەیّ وا تا لیسانسیش خوێندویانە لە بارەیّ فەرهەنگی خۆیان هیچی نازانن ئەوەندەی پیرەپیاوی وا لە بەسەرهاتی کورد دەزانیّ مێژووی خۆیان نازانن، بەلاَم کوردستانی تورکیە سیاسەتی کەماڵ ئاتاتورک ئەوە بوو لە کاتیّ لە دەس یونانیەکان تورکیە بە تەنگ هاتووە لە وشەیّ بە ناوی هەموو ئیسلامین و سەر بە خەلیفەیّ ئوسمانی و برای دینی تورک و کورد بە کاری برد و داوای لە کوردەکان بۆ یارمەتی کردن تورکیە دژ بە یونانیەکان و بە ناوی شەڕی ئیسلام و کافر بەم چەشنە دیسان کوردی دڵ ساف دڵی نەرم بوو و بە یاری تورکیە دژی یونان بە جەنگەوە رۆیشت بەلاَم ئاتاتورکی دەغەڵباز بۆ نەجات بوونی حکومەتە کەی لە دەس یونان بوو نەک برای دینی. کوردەکانیش کە شێخ سەئیدی پیران لەو دەمە رێبەربوو فتوای ئەوەی دا کە چۆن برا تورکە موسڵمانەکان لە گەڵ کافردا جەنگ ئەکەن ئەگەر ئێمە بە فریای ئەوان نەکەوین و نەچینە دادی ئەوان پەیغومبەر(د.خ) لەئنتمان لێی ئەکات بەم فتوایە کوردەکان لە گەڵ یونانیەکان بە جەنگ هاتن و شەڕی قورسیان لە گەڵ یونان کردو زەبری کاریگەریان بە یونان گەیاند بەرەو مەرزی یونان پاشەکشەی کرد

بەڕاستی هۆی شکستی یونان لەو شەڕەدا کوردەکان بۆون لە جیاتی دەس‌خۆشانە و حەق‌دان تورک بە کورد کەماڵ ئاتاتورک بە هێرشی دڕندانەیٚ تورکەکان بو سەر کوردەکان ئەکەونە ئابلۆقەی ئەرتەشی تورک و لەو شەرە بە ناشیرین‌ترین شێوە ئەو پێشمەرگانە هەموویان کوشت و بڕئەبن. پاش تێک چوونی ئەوان شێخ سەعید کە لە ئەستەمول بە خەیاڵ جەنگی موسڵمان و کافرە، مل خوییشی ئەکەنە پەتەوە تەنیا ئەوە دێتە سەر زمانی کە من هەر شکاتی ئەو پەیغومبەرەتان لێی ئەکەم. ئەم کارە ساتە دڵ‌تەزینە حەق خوازی کوردەکان لە ساڵی ١٩٣٩ بووە. ئێستاش هێشتا کوردی دڵ‌ساف بیری لەوە نەکردۆتەوە یانی کورد بە ئەوەی کە ئیسلام و هاو دینی چۆنیان خەڵەتاند ئەوە تەجرەبەی باشە ئەگرچی هەزاران کورد لەو ڕێگە بە ناحەق کوژران بەڵام بەو شەرتە کە ئیتر سادە دڵیٚ نەکەین ئەگەر بیکەین‌یانیٚ نەزان و پیٚ‌مان لە خوێن ئەو کەسانە ناوە ئەوە ئەزموونێک تاڵە بەڵام دووپات نەکردنەوە شیرینی ئەکات.

ریش پان و لولەکان بە قەوڵیٚ شائێرانی نەمری کورد قانع و موحەمەدی کوێی کە لە دەستی ئەم جۆرە کۆرکە شێخ و کۆرکە مەلا هەناسەی سەردیان هەڵ کێشاوە کورد تەنیا لە لاییکەوە دەردی گران نیە مەلاکانیش کە دەورانی خۆیان لە هەر ڕۆژیٚ و ڕۆژگارێک‌دا جگە لەوەی ئەرەبی فێر بن ئێتر ناوی خۆیان بە کوردی نووسینی و خوێندنیش نازانن باس لە سەر میللەت کورد ناکەن بڕێکشیان هێندە کوێرن کە لە پیش‌کەوتنی زانینی کورد بەرەو فەن و ئیلم لومە دەکەن [1] لە هەژار کردنی میللەتی کورد ئەگەر خۆیان بیرلەوە

---

١- بریک لە مەلا ئایینەکانی کورد دەڵین جگە لە خویندن قورئان ئیتر ئەوانی‌تر بەتاڵن.

بکەنەوە کە لە قیامەت‌دا چۆن بە میللەتی کورد جواب بدەنەوە ئەوەندە نەزان بۆون کە حەق خوازی میللەتی کوردی خۆیان بە قەوم پەرەستی زانیوە و نووزە و ناڵەیان کردووە و بڕێک لە مەلاکان لە تەکیە و مزگەوت و خانەقادا لە دەس بزوتنەوە حەق خوازیەکان کورد بە بەتاڵ، و کاری غەیری ئیسلامی‌یان زانیوە و وتویانە کە ئێمە هەموو موسڵمانین براین، کوردی چی، ئەجەم و ئەرەب و تورک چی ئەمانە کافر و ناسیونالیزم و قەوم پەرەستی‌یە ئەمانە براکوژی ئەکەن بەم چەشنە دیسان لە ناوکوردەکاندا ئاگری فیتنە هەڵ ئەکەن مەگەر ئاڵای ئیسلام لە ئەرەبستان هەڵ نەکرا بۆ چی سەرزەوی و تاج و تەختی خۆی‌نە داوە بە وڵاتەکان یان (ئەرەبە هاوسیەکان) خو لە یەک ڕەگەز و تیرەن.

ئەم مەلایانە وا ئەوەندە بیریان تەسکە شۆڕشە حەق خوازیە کوردەکان لە سەدەکانی پێش‌دا بە تاوان باریان ناسیوە. و بوەتە هۆی بە فیڕو چوونی خوێنی هەزاران لاو کوڕ و کچ کوردی هەژار. ئایا ئەگەر ئەم جورە کەسانە خۆیان توزی غیرەتی کومەڵایەتی نیشتمانیان بێ و هەروەها زانای رامیاریان دەرک بکات حەق و حق خوازی و سەر بە خۆیی چ پێوەندێکی بە کافری و قەوم پەرەستی هەیەئەویش میللەتی وەک کورد کە بە ناڕەوا لەت لەت و دابەش کراوە و حەقی ژیانی سەر بە خۆی بێت بە واتای ئەوانە موسڵمانن بەس بۆ تورک و ئەرەب کامیان تا قوڵو ئەژنویان بە خوێنی کورد سوور نەبوە ئایا ئەوانە مەلای ئاینی وەک ئیوە دەم راست‌یان نیە کە بلێ بۆ چی بەس ناکەن کورد کوژی و ... کاری غەیرە ئیسلامیە و غەیر ئینسانیە بەلێ کوردی داماو تەنیا لە لایەکەوە

زەلیل و بەدبەخت نیە برێک بە نرخ رۆژ نان خۆر[1] و نەزان خۆ ماڵێ لە حکومەتەزاڵمەکان خراپ‌ترن ئێوە خۆتان کڵاوی خۆیان بکەن بە قازی بزانن ئەم کرمی خوماڵیانە چی دەڵێن و چەن شۆرش و بزوتنەوەێ کوردیان بە کارەساتە بە تاڵان و فیرِو نە ئەدا ئایا وڵاتە ئیسلامیەکان تەنیا هەنگاوێک خاک و ئاوی وەتەنی خۆیان بە وڵاتە دەرهاوسیەکان لە بەرڕەزای خودا نەبەخشتیوە ئەوەندە بە سیاسەت بایەخ‌یان داوەکە لە سەر خاک و ئاوی خۆیان دایم توشی کێشەو دوو بەرەکین. ئایا میللەتێک نو هەزار ساڵە و نزیک بە چل ملوین کورد لە سەرزەوینی خۆیان کە دابەش بووە هەر بە هۆی ئەم بێ سیاسەتی ئەم تاقمە بۆدواروژی خۆیان و ئایا حەقی سەربەخۆی ژیانی ئازادی دەسەڵات‌داری نیە وڵاتە هەفسەد هەزاری و یک ملوێن حەقی سەر بە خۆی هەیەبەڵام چل ملوێن کورد نە. ئەی بوچی مەلا و ئایەتوڵلاکان بەرێز ئێران هەشت ساڵ لە سەر ئاو و خاکی خۆیان جوانەکانی ئێران شەڕیان کرد چۆنکە زانیان ئاو خاک یانی نامووس و شەرەف وەلێ ئێوە نازانن. شێخ‌مەحمودی نەمر و قازی کە کوردیان بەخۆێ قەرزدار کرد و شێخ بارزان و شێخ سەئید و ... ئەمانە خۆئایینی بوون بۆچی رچەێ ئەوان ناگرن بەڵام حەیفە ئەوان لە کوێ ئیوە لە کۆێ ئەوانەێ وا پێ لە نێو خوێنی ئەو کەسانە ئەخەن وا سێدارەیان بە شانازی زانی چۆن گوتیان بۆ کوردستان سەر و ماڵ قابیل نیە ئەوانەی لە کەسێک شانازی ئەکەن وا لێهاتو بێت زور کەس تامی ئازادی و سەربەخۆی نازانن هەر

---

[1] -لە ئێران کاتی کە شورشی ئیسلامی بە ریبەری ئیمام خومەینی بریک لە شێخ و مەلاکان کوردەکانیان بەرەو هاندان بوو لاینگری لە شای خوێری هان ئەدات.

کاتێ لە هەر حکومەتی کە واکوردی تێدا ئەژێ بزوتنەوەی کورد سەر ئەدات ئەگەر چی بەیێن ئەو دوو حکومەتەوا کوردی تێدایە ناکوک بێت لە بەر ئەوە کە شۆڕشەکە سەر نەگرێت دەست بە یەک ئەکەن و ئیزن ئەدەن کە لە خاکی یەکتردا بۆ کوژاندنەوەی شۆڕش کورد پەلامار بدەن بەڵێ بیر کەینەوە چی بکەیێن هەر لە خومانەوە پیلانی شکستی سەیدڕەزای کورد بە دەستی برازاکەیٚ (سەیدڕەهبەر) یەکی لە فەرماندەکارامەکانی جەنگی ئەبێت بە ناوێ شێرە بەڵام سەیدڕەهبەر لە ژێرەوە دەستی لە گەڵ تورکەکانا یەک ئەبێتوە شێرە و خێزانی زەریفە خاتون سەریان لە لەشیان جیا ئەبێتەوە و بۆ تورکەکان سەریان ئەنێرێ و شاهین ئاغا بە دەستی سیخوەرێ بە ناوی خدری شەهید ئەبێ شاهین فەرماندەری بە هێز و لێهاتوو بووە و دیسان دڵ پاکی کوردی هەژار بۆ تورک. (کەمالیستی)

ژنراڵ دوگان پەیمانی ئاشتی بۆ سەیدڕەزا ئەنێرێ و ئەویش دڵ لە دەسیان ئەخات و بەرەو ئەرزەنجان ئەیان بەن و لەوێ کە کەماڵ ئاتاتورک لە دادگای نیزامی حکومەت دەستووری ئیعدامی سەیەید ڕەزا و هاوڕیەکانی و کوڕەکەی ئەدەن و لە تاریکی شەو سەید رەزا وکوڕەکەی لە سێ دارە ئەدرن و تەنیا سەیدڕەزا دڵێ خوێنی من و هاوڕێکانم بێ تۆڵە نامێنێ و ئایا بە کوشتنی سەیدڕەزا ئاژاوەێ حەق خوازی کورد کوتایی هات (بە سپاسەوە بۆ کاک ئەحمەد شەریفی). کە ئەم بابەتەی لە گوڤاری ئاوینە لە چاپ درابو.

جا لێرەداکەمالێستیەکان دڵیان بۆ ئیسلام سووتا و وتیان سەیدرەزا موسوڵمان نیە و لە منداڵی یەوە لە کلیسا پەروەردە بووە. بۆ سەرپۆشی کردنی ئەو شۆڕشە و ئیدامی سەید

ڕەزا وتیان سەید ڕەزا دەست پەروەردەی شەیتانە لە بەر ئەمە سزای کوشتن بوو ...؟!

شێخ‌ئەبدول قادر کە رابەری هێزی کورد بوو پێشنیاری جوانەکانی کوردی بەتاڵ کردەوە وتی ئەمە بۆ ئێمە ناموسلمانیە پشت لە تورک کردن لە زەمانی جەنگدا و هەروەها دەست بۆ چەک بردن و جەنگ لە گەڵ تورک بۆ سەر بە خۆیی کوردستان چۆنکە تورکەکان لە گەڵ کافر (یونان) لە جەنگە و ئەمە لە شانی کورد نیە و نامەردیە و ئاتاتورک قەولێ حەتمی بە کورد داوە بۆ خودموختاری بەڵام‌هەر ئەم شێخە گەورە بە دەستی کەماڵ ئاتاتورک لە سێدارە درا[1]؟؟!!

شێخ‌ئوبەیدوڵلا زۆر زۆر بە سەربەخۆیی کوردستان دڵگەرم بو کە ئەجنەبێکان دەرمانی برسیەتی و قاتی کە لە ساڵی ١٤٨٧ زاینی رووی داوە بە گەردنی کوردستانی لەت لەتی ئەزانی و فەرموویە ئەم دەردە دەرمانی حکومەتی کوردیە (نەک لەت‌لەت بوونی) ئەبێ سەربە خویی بێت تا خەڵک بە دڵێ گەرمەوە دەردەکە چارەسەرکات و من دەزانم کە میللەتی کورد ئاواتی کوردستانی گەورە لە دڵیا ریشەی داکوتاوە و ئەم شێخە بەڕێزە بە هوێ نەزانی بڕێک لە چەک دارەکانی ئەو جورە لە دڵیا ئاوات بووە بە دێ‌نەهات و هەر لەم کاتە شۆڕشی شێخ‌ئوبیدوڵلا بوو بە قاتی و قڕی لە کوردستانی گەورە کە لەو زەمانەوە بڕێک لە برسا مردن هێشتا ١٣٧٤ بڕێک وا تەمەنیان لە سەرەوە لە بیریان ماوە و مەشهوورە بە دەورەی گرانیە، لە سەر وێردی زمانی کورد ئەگەر چی بڕێک لە توژێنەرانی

---

١- تورکیا و یونان چەند جار شەریان کردوە و هەر جار بە یارمەتی کوردەکان تورک سەر کەوتوە.

سیاسی دەلێن شێخ‌ئوبیدوڵلا هۆی قاتی و قڕی ئەو دەمە بووە...

هەر کوردێک بەرەو سیاسەت (رامیاڕی) هەنگاوی ناوێت دەزانی کە هەر دەورە و ڕۆژگارێک‌دا ئینگلیز هەیەیانی داهاتووی کوردستانی گەورە و سەر یە خۆیی ئەبێ ئینگلیز بە رەسمیەت بیناسی تا دەوڵەتە ژێر دەسەڵاتەکانَ وەک ئێراق ـ تورکیە ـ و سووریە لە هێرش و پەلامار بە سەر کوردەکان دەستیان بە سرا بێت غەیر لەمە ئەم چوار حکومەتەبۆ کوشت بڕی کورد لە یارمەتی‌دان بەیەک هیچ دریغی یکیان نەبووە و برای هاوپشتی بۆ گیانی گەلی کوردن و پیرەژنی فەرهادکوژی روسیە لە سەربەخۆیی کوردستان پێ ناخوشە ئەگەر لە ناو حکومەتەکەش بووە رەخنە دەکەن هەر وەک لە هەر داخوازی کورددا لە نێو رێبەرەکانی کورد بۆ سەر بەخۆیی و چۆنیەتی کوردستان چ برا کوژێک لە کوردستان رووی داوە ئەگەر لیی بکۆڵێنەوە دیارە دەستی ناپاکەکان لەو کارە وەک تورکیا و ئێراق کە لە ناو جەرگەی خەبات کوردستان خودی کوردەکانِ بە گیانی یەک کەوتون ئەم ئاردە ئاوی فرەیّ دەوی (کتێبی جنبش ملی کُرد) کریس کوچرا تەرجومەیّ کاک دوکتۆر یونسی کە بە فارسی گێراویتەوە دەڵێ ـ رێبەرانی کورد هەر لە ئەمیر ئەمینی ئەلی بەدرخان و کامل بدرخان تاکوو ئەبدول‌قادرکوڕی شێخ ئوبیدوڵلاو ممدوح سەلیم سکرتێری و کوردستان و ... پەنایان بەو وڵاتە دەسەڵات‌دارەکان وەک ئینگلیز و فەرانسە بردوە بۆ یارمەتی‌وە بە شێوێک فروشتن کەمتر نەبوە چۆن کارمەندەکانی بریتانیا بەڕیچ وتوویانە کە ڕێبەرانی کورد ویستویانە بە قودرەتی ئێمە خۆیان بە شای کوردستان بکەن هەر وەک خەویّ کە دەیبینن بەڵام کورد بە ئەزموون

بۆی سەلمێندراوە کە سەربەستی و سەربەخۆیی رزگاری ئەبێ گرتنی بێت نەداتنی (گرتن لە کوێ) داپین مافی کورد لە کوێ یادی بەخێر ئەو رۆژە کوردستان هەر لە خۆرئاوا تاکوو خۆرنیشن لە با شوورەوە تا باکور قەلا و دژ و سەنگەر ئەمارەت کورد بووە یانی دژە سەختەکان و حکومەتەمەردمیەکان چیان لێ هات مەگەر غەیر لەوە بووەکە بە قوربانی دڵ پاکی و بێ سیاسیەتی بوون ئەلبەت نابێ لێرەدا ئینساف لە بیر بچێت گەلی کورد چۆن ئاومان لە جوگەیەکی پاک و راستەقینەدا چووە و یەک رەنگی کردەوەی زەردەشت نابێ لە بیر بچێ و ئەم ئاوە باکەم لێڵ بێت. گەلی کورد، کردار و رەفتار و پنداری نیک لە بیرمانە و لە ژیاندا ئەیکەین بە سەر باشقەی ژیانمان و لە سیاسەت کەڵک ناگرین ئەگینا کورد لە هەر کارێکدا دەتوانی بە سەر بەرزی کارەکە تەواو بکات چۆن کورد دڵ سوز و خاوەن بەزەیی‌یە.

بەڵام بۆ دوارۆژی مێژوو لە سیاسەت بەهرە ناگرێ چۆن ئاقیبەتی سیاسەت پاش رۆرەشی شتێ‌تر بە دوای خۆیەوە نایلن گێچەڵ و دەلەسە بە نامەردی دەزانی بۆیە لە سیاسەت بە دوورن ئازایەتی و دلێری = پیشەی ریشەی کوردانەیە بۆیە لە هەر بنەماڵەیەک دانەی گیانی بە دەم حەنجەر و گوللەی دوژمن دەرچووە و ئەگەر لە ناو جێگە بمرن خۆیان شەرمەسار دەزانێ مەگەر ئەوەیە وەک کەڵ لە سەر شاخانەوە گیانی دەر چێت خوێنی سووری بەرد سوور بکات و چاوی هەر باز بێت کە بڵێن وریایە نەمردووە و ترسێنەری دوژمن بێت. بۆ نموونە میرانی سۆران کە کورەکەی کەلوس بە نێوی ئیسمائیل گوتی لەسەر ئەم بەردە ئەویستم تاکوو خوێنم بەردەکە سوور بکات و هەر بۆیە

به میرانی سۆران ناو بانگی دەر کردوە.

ناکورد هەر لە کاریگەر تاکوو پزیشک و موهەندیس (ئەندازیار) و بازاڕی بگرە قەد بۆن و تامی کورد بوونی خۆیان نەچێشتوه. ئاخ بو ئەم بێ خەبەرانە ژن ـ پیاو ـ کوڕ ـ کچ ـ وێنەێ من زۆرن ئاتاج و موحتاجن حەتا بە چاوی بەزەیی پیٚمان ناڕوانن چۆنکە ئەوەێ بێبایەخ بێ قەڵەم بە دەستی کوردە لە زێڕ فرۆشی تا ماڵ فرۆشێ و ... بگرە دەڵێی کتێبەکانی لە بازاری ئازاد بە ئێمەێ دەفرۆشت تا قازانجی بە ئێمە بگات و من ناڵێم من لە ماڵی خۆم دانیشتووم خواردومە و نوستوم، ئەوانە بۆ خۆیان بە دەست رەنجیانەوە ماڵ و ژیانیان پێک هێناوە بە من بیدەن من مەبەستم ئەوە نیە، بەڵکو بە پای ئەوە وا بۆ ماڵێ دنیا تەقەلا و شەو نەخوونی ئەکەن لە پاڵێدا بۆ فەرهەنگ و زانستی خۆیان و لە مێژوودا بیرکەنەوە تەنیا گیرفانیان پڕ نەبێ و مێشکیان کای تێدا بێ ئەوانە بو کورد و کوردستان سەر و ماڵیان باخت کردەوە بە چاوی حورمەت و ڕێزەوە لەگەڵیان هەڵسان و دانیشتن کەن بە پێچەوانە و شانازی بەوانە ئەکەن ئەوانەێ وا ئێستا لە کوردایەتی خۆیان گێل ئەکەن دێر یا زوو شەنگیان لە سەر ئاو نەکەوێت و بۆ دوا رۆژمایەێ نەنگن بۆ خۆیان بنەماڵەکەیان، ئەوانە وا بە سەروەت و سامانی دنیا ڕێزو حورمەتیان هەیە لە کاتی مردنیان جگە لە نەنگ شتێ بۆ دوارۆژیان لە پاش مردنیان نامێنێ. برای کورد ئێمە کرمی نێودار نەبیین بەر لەوە کە کورد بێن ئێمە ئیسلام و دین و ئایینی ئیسلام و ڕێبەرمان حەزرەتی موحەممەدە.(د.خ) قورئان کتێب و سەرمەشقی ئێمەیە.

(بیر لە دوارۆژ بکەینەوە تا مەرگ بە نەنگ نەبێت).

# دەردێ وا دەرمانی بە دەست خۆمان ئەکرێت

لەکوردستانی لەت و پارە و بێ کەس‌دا شۆڕش گەلێ بە ناو حەق‌خوازی کورد؟! بەڵام کومونیزم و سوسیالیسم کە ئەیەویست لە پاڵێ حکومەتی کارگەری حەقی کورد بستێنن بەڵام‌کوردی بێچارە چەند رۆژی لێێ رەش بووە کە لە ژێر ئاڵای کومونیزم دەیەوە کەسانێ وا هێشتا خۆیان بە کورد نامەحرەمن وەک ئەوانە: ئەکسەریەت و تودەیی کە بە ئێران فروشی ناویان دەرکرد بوو.

خەیانەتی رێکخراوێ تودە چی کرد کە کەسێک تودەیی بە ناوی دلفانی لە گەڵ ساواک دەستی بەیەک کرد و لە بەندی‌خانەکان بو بە موخبیر کارەساتێ دڵ‌تەزێنی بەرپا کرد.

برێک کوردی تازه لاو ده‌یانه‌ویست کورد رزگار که‌ن به‌ڵام‌چاوتان رۆژ ره‌ش نه‌بێنێ به‌لایکیان به سه‌ر کورد هاورد که چی ... بنووسم.

ته‌نیا ئه‌وه ده‌ڵێم که ئێستا خۆیان هه‌ر ئه‌و کارگه‌ره وا بۆ نانی شه‌و موحتاجه ئێستا زیاتر به ده‌ستی توده‌ی و (ئه‌کسه‌ریه‌ت) خوێنیان ئه‌مژن ئه‌نباره‌کانی قه‌ن و برنج روون و ... برێکیان ساحێبه‌کانی توده‌ی و ئه‌کسه‌ریت دوێنێن ئه‌وانه واکورده‌کانیان سه‌رزه‌نشت ئه‌کرد و خۆیان به مه‌حره‌می کورد ئه‌زانێ و مه‌ردمی و خه‌ڵکی بوون ئێستاتریاک به ناوخه‌ڵک بڵاو ئه‌که‌نه‌وه چۆن توده خه‌ڵقی بوون هه‌ر ئه‌مانه ئێستا زۆربه‌یان ده‌وڵه‌مه‌نده‌کانی ره‌ده‌ی یه‌که‌من له شاره‌کانی ئێران، یانێ ئه‌وانه‌ی وا «لایێنگرانی چینی کرێکار» بون حه‌کایه‌تی مافی ئێوه له‌گیرفانی منه. به‌ڵێ کوردی هه‌ژاری هه‌ناسه سارد بیر که‌نه‌وه ئه‌وانه‌ی وا فیدای و توده‌ی بوون ئه‌مرۆ یه‌کی له ئه‌رز فرۆشه‌کانی خارجی و ده‌س فرۆشه ده‌وڵه‌مه‌نده‌کانی ئه‌مرۆژن و ده‌لاڵ کالای قاچاق وه‌ک رون، قه‌ن و زۆربه‌یان بونه‌ته ته‌لافروش و ... ئه‌وانه وا تا دوێنێ توده‌ی بوون، ئه‌گه‌ر کرێکاری رووبکالایان تا به زوان نه‌ی خنکێنن وشتێ ده‌غه‌ڵ تێکه‌ڵ و پێکه‌ڵ به مل‌یانه ئه‌ده‌ن به‌زه‌یێ و ره‌حم ناکه‌ن بۆ نموونه ئێمه قوربانی برێک له ساده‌ی لاوانی دڵ سافین له‌کتێبی ئه‌سنادی لانه‌ی جاسوسی ئه‌مریکا هاتووه که یه‌کی له سیخوران به سه‌ردان بۆ سنه له فیکرو بیری سیاسی له سه‌فه‌ره‌که‌ی‌دا ئه‌نوسی و ده‌ڵێ کورد سنه بوونته لاده‌ر و مود (باو) په‌ره‌ست و بێگانه‌په‌ره‌ستی له گیانیان ریشه‌ێ داکوتاوه له لاپه‌ره‌کانی‌تر داهه‌نگاوی به‌ره‌و ئه‌ولا دائه‌نێ و ده‌ڵێ ئه‌مانه سه‌رمایه‌ێ باشێکن بۆ بازی سیاسی چۆن زۆر خاوکاڵن قه‌د سنه‌ی

سیاسی نین و لە ڕێگای دینداری زۆر حاڵەتی دیفائی ئەگرن و لاوەکانیان مود پەرەستن و دەرونیان پوچەڵە لە رۆژی تەنگانەدا بۆ برای خۆیان بی پشتن وەیەکی تر لەکار بەدەستە سیاسیە ئینگلیزیەکان دەڵێ من تەواو شارەکانی کوردستان ئێران گوزەرم کرد تەنیا شاری سنە نەبێ هەموو شارەکانی کوردستان لە رژیمی شا بێزار بوون و لە دوایی هەلی بوون و جل و بەرگی خۆیان نەگوریووە بەڵام شاری سنە خۆیان لە بارەێ بەیتو باوی کوردیدا تەواو بێگانەن.

بڕێکیان لە ماڵەوە لە گەڵ منداڵەکانیان فارسی ئەدوێن. سنە چوون بووە بە لاسای خەڵکانی دیکە دەکەنەوە مەگەر ئەوە نیە کە لە رابردووی خۆت بێ خەبەریت یانی تۆ کوردیت لە بیر چووەتەوە بۆیە هەر ساتی لە دامینی کەسێکدا ئەژیت بۆیە خۆت نازانێ چی بکەیت گلەیی لە ناکورد ناکرێت، بەڵام سنە کوردە و کوردی دڵسوز لە گەڵ کوردی ناکورد پێکەوە حەشر و نەشر ناکرێت.

شێعری ماموستا موفتی پێنجوێنی نەمر:

لە سەر گلەیی لە برێک وا لە کەلەی پڕ لە سەوادی شێخ و سوفی یەکان دواون لە ئالەمی مەلەکووتیدا یا ئومەر یا حەیحەی شێخ، کەی ببێتە ئەوە بیر لە داهاتوی ژیانی سەربەستی :

هەتا کەی یا حسام‌الدین وسۆزی یا ئومەرتانە

ئەگەر وا بێ خەبەر بن بائیسی خەتەرتانە

هەموو دنیا ئەزانێ ئێوە هەر شێری نەفەرتانە

لە خوەو هەستن درەنگە میللەتی کورد خەوە زەرەرتانە

نەما ئەمرۆ لە سەر ئەرزا بە وێنەی ئێوە بێ مەحکوم

لە گەنج و جەوهەری خاکا بە جاری بێ بەش و مەحروم

زەلیلی جەبری ئێران و گرفتاری دەستی رۆم

دەسا تێکوشن ئەی قەومی نەجیب و بێ کەس و مەزلووم

بە گورجی ببڕن ئەو رێگە دوورەی وا لە بەرتانە

گەلێ چاتر لە ژینە ئافەت و تائوون و مردنتان

هەتا وا ناحەزی یەک بن لە بۆیەک رێگەی گرتنتان

بە هیچ نابێ هەتا وا بن لە یەک تاڵان و کوشتنتان

بخوێنن چونکە خوێندن بو دیفائی تیغی دوژمنتان

بەخۆڕایی لە دەستی بەرمەدەن ئەم خاکە شیرینە

کە تۆزی وەک جەواهیر سورمە و نوری بەسەرتانە

تەماشای سیبەری ئەم شاخ و کێوە لە سەر تانە

ئەگەر غەربی بزانی قیمەتی ئەم نگین و ئەم ئەرزە

لە دونیادا وڵاتی ئیوە ناوی تا فەلەک بەرزە

هەموو مسقاڵە خاکیکی دەوای سەد ئیلەتو لەرزە

بە بێ قەدری لە سەر یا مەروون حورمەتی فەرزە

گوڵالە سورەی ئەم کێوانە خویناوی جگرتانە

بزانن بەردی ئەم شاخانە ئەڵماس و گەوهەرتانە

بە بێ ئیلمی ژیاون دا خم ئیوە ئەوەڵی وەهلە

نەزانێ ژێر دەستی خەڵکی ئەزانم سوچی نائەهلە

ئەگەر هیمەت بیێ ئەمجا خەیاڵ و ئارەزو سەهلە

دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەی جەهلە

لە سایەی ئیلمەوە ئەمڕۆ ئیتر نەوبەی زەفەرتانە

خەیاڵی مودەئیتان گەر تاق و تەنیابن

لە هەر لابن ئومیدن دەسی لە ناودەسی کەن هەمو یار بن

سەری موفتی بو لە ندو بەرزە بەو شەرتەی کە ئازا بن

لە زبانی حاڵی ئەحمەد هەر دەڵێ قەومینە وریا بن

* * *

موفتی ئەمر بو میللەتەکەی خۆی (گەلی کورد) بە ئەداری و هەژاری ئومری بردە سەر و.شێعرەکانی دەڵێ هەر دڵ پەروش بەرکوڵ و جۆش دێنێ بەڕاستی کوا کوردی وا بە

گوێدابچێ هیندێ کورد بە رواڵەت لێزان. بەڵام لە کوردی و نیشتمان پەروەری هێندە بێ خەبەرن کە قەد سروەی وەتەن پەرەستی لە دەمارییان نەیداوە بەڵام‌موفتی دەڵێ بڕێک لە مەلاکان وا لە بارەی دینەوە شارەزان دەڵێێ برا تەنیا زانین لە ئیلم و ئیرفان تەقوا نیە ئەوان دەڵێن قورئانیان خوێندوە دەزانین لە فەلسەفەی دین شارەزان ئێوە کوردی‌وتن بو بە ئەرەبی تیکەڵ ئەکەن کوردی یا ئەرەبی یا فارسی یا تورک تو بۆبە فارسی ئەنووسی یا بە ئەرەبی. شەریعەت ئیسلام بو کوردی هەژار بە ئەرەبی باس ئایینی ئەکەن من دەڵیم چی تو چی دەڵێی و ڵلا قەد لە زمانی یەک تێ ناگەین بڕۆ هەروا بە ... تا مردن مەڵێ بە نار ئەسوتن بڵێ بە ئاگر ئەسوتن. مەڵێ کەبیر، بڵێ گەورە. مەڵێ ئینسان بڵێ مرۆڤ.

# فیلم سینمایی لە تلوویزیون

لە ئەم فیلمە رێبەرەکە (زاپاتامیلن) بو، بو تولە سەندی ئاژەڵدارەکان بۆ شستی بۆ من گرینگ بو کە ئەم حەق خوازە زۆر دڵسۆز و نەترس و دلێر بۆو بەڵام سیاسی نەبۆ هەر ئەوەی کە لە سیاسەت شارەزا نەبو کارسازیش نەبوو هێرشی جەنگی نەیتوانی بەرامبەر بە سیاسەت دەر بێت تەنها جەنگجو بوون کاتێ کە رێبەرەکەیان کوژرا و چون لە بارەی رامیاری وریا نەبون هەر کەشاوەرزەکان رویان کردووە بڕێکیان خائن دەرهاتن لە گەڵ ئەو بزوتنەوە وکاتێ کە هەلیان بو هەڵ ئەکەوت نەیانزانی کە چۆن کەڵکی لێ وەربگرن کە وا بو ئەبێ بۆ هەر بزوتنەوەی بەر لە هەمووشتێ بزوتنەوە سیاسیە پیروزەکانی جیهان بکەینە سەرمەشق و لە ئەوان فێر بین ئەویش بە وردە هەنگاوی مەترسیەوە بیر و باوڕ بە ئارمان و ئامانج پاکی دڵ گیان نەترسی هاوڕێ لەگەل مێشکی وا دەست بە چەک ئەکات

نەک دەست مێشک بە تاڵان بی‌بات و گیرفان خاڵی مێشک پڕلە سەوادی رزگاری و باوەرە بە دوا رۆژی بو نەتەوەکان نەک تەنیا خۆی سەر و ماڵی و مناڵی فیدای ریگەیٚ حەق‌خوازی بێت و بە شانازی گیان باخت کردن بزانن نەی تانیوە رێ دیسان دەست لە پا شۆڕتر بگەرێتەوە (وەرشکەست سیاسی) لێرە دوکتور جەماڵ نەبەز لە کتبیە جوانەکەی دەڵێ ئەگەر هێزی مێشک و هێزی چەک ئەگەر بیرو باوەڕی رەسەن بیان بزوێنێ رۆژی روون لە تاریکستان هەڵ دێنێ و لە ئەوەڵی کتێبەکەی وێنەی قەڵەم وێنەی چەک رۆیان کردووە لە یەک و بەو چەشنەکە باس کراماناى کردوەتەوە.

لە کتێبی خەبات لە رێگەی کوردستاندا نووسین «ن خەلفین» دەڵێ: کوردەکان زورتریان ناحاڵین لە ریگەی حەق‌خوازی خاک و میللەت و چارەنووسی خویاندا بێ خەیاڵن و زورشیان بێسوادن و ئەگەر ئەمکوردانە رێگەی قەڵەم بگرن بە ئامانجیان زوتر نزیک ئەبنەوە و هەر وەک لەچەکدا پرزو نەبەزن لە قەڵەمیش‌دا ئازایانە بە کار دێن. و زۆریان بێ ئوسولن یانێ زویاخی لە قسەو باس ئەبنەوە بێسوادی لە ناو کورددا یەکێکە لەم چارەرەشی کوردە هەژارانە بۆیە توش چەرمەسەری رۆژگارن، کە وا ئێستا دامێن‌گیری گەلی کوردە.

## «بیرورای دوکتور جەماڵ نەبەز»

دوکتور جەماڵ نەبەز لە کتیبەکەی‌دا لە قەوڵی حاجی‌قادری کویٚ دەڵی: لەفزی کورد بڵاو نەبو، گرد بوو. لە بەین ئێمەدا تیک چوو لە لاپەرەیٚ ١٠ زمانی یەکگرتوی کوردی

باس جیابونەوە زمان و هوێ یەک نەگردنی ئەم زمانە باس ئەکات و دەڵی لە جیابونەوە یا باس ئایین و دین پەرەی پێدان بووە و دوهەم کورد هوێ یەک نەبونی سەر بە خوێیە، چۆن هەرکوردی لە هەر وڵات و کیشوەرێ ژیاوە. زاناکانیان هەر بە شێوەێ زمانی ئەو حکومەتە وتار و بابەت فێرکردنیان بووە و وتار و بابەتیان نووسیوە. بڕێکیان تواو خۆیان لێ بێگانە کردوەتەوە بە تایبەت بڕێک کە بە کارمەند بوون بە بیرو باورێ تەسکیان خۆیان لە کورد بوون بێگانە کردوەتەوە. و چۆن زوانی فارسی بە کوردیەوە نزیکە لەم مەیدانەدا ئەسپی ئەدەبی و فەرهەنگی خوێ غار داوە کە سودی خوێ بردوە.

دیسان دوکتور جەماڵ نەبەز دەڵێ: یەزیدیەکان (ئیزەدیەکان) پەیڕەو ئایینی یەزید کوڕێ موئاویە نین و پەروەردەێ ئایینی کونی کوردین کە بەر لە ئایینی زەردەشت ئایینی کورد و ئێرانی بووە وە ئەمە هەڵەیە کە بڵێن ئەمانە دەست پەروەردەێ یەزید کوڕ موئاویەن. یەزیدیەکان هەر لە سەر ئەو باوەڕی کونێ ئێرانیەکان ماون. نابێ هەرکوردی لە هەر ناوچەیەک بژێت شێوە زمانی ئەو ناوچە بکا بە زمانی ئەدەبی.

ئەبی زمانی‌یەکگرتوی ئەدەبی کوردی کە هیچ پەوەندیک بە زمانی فارسی و ئەرەبی و تورکی نیە، و زمانیکی دەوڵەمەندو سەربەخۆی لەو شێوە زمانە ئەسپی فەرهەنگ و ئەدەب و مێژوو فۆلکلۆر غار بدات لە نێو دەراوسیەکان مقامی ئەوەل دینێ.

ئەگەر چی ئەسمەت شەریف وتویە کە هەر کوردێک لە هەر ناوچەیەک بژێت بە شێوەێ ئەو زمانە بوو نووسین و وئەدەب کار بکات. بەڵام دوکتور نەبەز بە توندی ئەوەی بەتاڵ زانیوە.

دیسان دوکتور نەبەز وتوویە پیاوی دەوڵەمەند بە کار و باری ئەدەبی هیچ کار و باری نەزانێت بە زوان ئەدەب و میراتی کورد نامەحرەمە.

دوکتور کەماڵ فوادیش لە سەر بیرورای دوکتور نەبەز بوە کە لە بارەیْ پیاوە دەوڵەمەندە بیْ خەیاڵەکان کە تەنیا بو خۆیان ئەژین. نوسیوسە کە دەوڵەمەند ئەگەر بە فەرهەنگ کورد بایەخی بدایەت ئیستا رۆژی کورد وانەبو.

دوکتور نەبەز و دەڵیْ: شێوە زمانی کرمانجی ژۆرۆ یا خوارۆ و بکەینە زمانی ئەدەبی نووسین و خوێندن کە دیسان لە بەر چەند هۆ نەبەز ئەمەیە دور لە راستی ئەزانی و دەڵیْ لەم دو شێوە زمانە هەم هاسان هەم دژوار تۆش ئەبێن و تۆش سەر لیْ شێواوی مان ئەکات ئێمە بو راجەتی خۆمان زمانێک لە ناوبچیْ ئەمە یانی فەوتاندن زمان. دوکتور نەبەز کە خۆی سەر باشقەی رێزمانە دەڵیْ: زمانەوان ئەو کەسەیە کە زمانی کوردی لە سەر بنچینەیْ زانستی زمانەوانی بەراوردکاری(علم‌الفات) یان ناخودای گشتی. زانستی زمانەوانی بێت[١] هێندی و جەرمەنی(ئاڵمانی) لە جورییک هاتنی و گورانی زمانی کوردی لە بارەیْ فونولوژی و شارەزایانی زمانە کۆنە ئیرانیەکان و نیوە راستی تازە وەک ئاڤستا ـ فارسی کۆن پارسی و پەهلەوی و بە لوچی و پەشتو لە بنەوچە و رچەڵەکیان لە گەڵ زمانی ئێرانی کۆنی ئاریایی‌دا یەکیکە ئەبی زمانەوان بەم زوانانە وا وترا شارەزا بێت و ریچەڵەکی بزانیْ و بە زمانی لاتین ئەبی تا رادیەک زانا بێت و لە مێژوو ئەفسانەش و

---

١- کە ئەم کارهش لە توانای کەمترین کەسێک‌دا هەیەلە کتێبی زمانی یەکگرتوی‌دا ئەم باسە هاتوە.

فولکلۆریش زۆر شارەزایی بێت. چۆن کوردەکان پەیوەندی دراوسیەکان ئەرمەنی تورک و فارس و ئەرەب و سریانی ـ ن پیویسته لەوانیش شارەزا بێت ئەو کەسه وا له وانەدا باس‌کرا توانایی بوبێت ئەتوانی شورەسواری مەیدانی زوانەوانی کورد بێت و لێرە تەنیا پرفسور کاک تەوفێق وهەبی نەبێ کەسیکی‌تر له کوردی زمانەوانی ناتوانین به قەڵەم بدەێن (لاپەڕە ١٩ دوکتور جەماڵ نەبەرز زمانی یەکگرتوی).

ئەدیب و مێژوونووس، هەر قەڵەم بەدەستی کورد ئەبی بەر له هەموو شتێ خۆی کوردانه بژیت دڵ‌ساف، ئازاو دلێر بێت کوردی پوش کوردی ویژ بێت نەک کوردی نیم کوڵ و نه برژاو کەچی سەیرە بڕێک به (شەبکه پانتول مانتو) خۆیان به قەڵەم بەدەستی کورد ئەزانن من له بەر ئەمانه دڵ و جەرگم ژان ئەکات و نامەوی خەڵات و بەرات به من بدەن و له کەسیش کینەو رەقم نیه بەڵام ئەمانه کە چارەنووسی گەلی کورد بەئەستۆ ئەگرن و بەم شێوەێ لیباس و رەفتاریانه چارەێ کورد رەش ئەکەن. ئەگەر وانین بۆچی خۆیان لێی دور ئەکەن یا ئەیانەوی دەستی خەڵکی پێداکەن خۆیان سەیرکەر بن؟ ئەگەر قازانجی بو

له کتێبی خەبات له رێگەێ کوردستاندا لاپەڕێ ٢٣ له بارەی خەیانەت دەرەبەگە (خوماڵیەکان هێزی بەر و بۆمی و پەرەپیدانی کوردەکانیان بۆ مافی خۆیان تێک ئەشکاند و نەیانهێشت پێش کەون. و دەرەبەگە کوردەکان بەڕاستی خوێنیان بو ناو سۆاڵک سپڵوەت چاکە و لەشیان بو بەر دڕندەێ کێوەکان له حکومەتەزاڵمەکان زیاتر خوێنی کوردیان مژیوە و دەست و رەنجیان (کوردەکان) هەر ئەم زوڵەکوردانه ئەیانخوارد و بو

خوێندن کاری و خوازبینی (دەربەگیەکان) ئیزنی ئەوانەیان نەئەدات دوارۆژ ئەبی گۆڕەکانیشیان لە خاکی کوردستان فڕە بدرێت تا گۆڕ بە گۆڕتر بن.

کاربەدستانی باڵوێزخانەی روسیا دەڵێن: ناوچە کوردنشینەکان زۆر هەژارن هەر کەس بێت ببینێ دەزانێ کە چۆن چەوساونەتەوە، سەرداره حاکمەکان و دەربەگیەکان وایان لە کوردستان کردووە کە توانایی جەنگ و تۆڵەسەندنیان نەبێت و لە کاتێ لێ قومایی دا بە هاواریانەوە ناگەن تا لە بیر کردنەوەێ سیاسی بو ژیان باش نەبن و (نووسەری خ .ت .ن .ن) زۆر جار خێزانەکانیان بەدیلی لە دەس دەرەبەگە کوردەکانەوە ماون لە قەوڵی (ریستوڤسکی): لە هەر وڵاتێ وا کوردی تیدا ئەژێت بە باشی دەرئەکەوێت کە حاکمەکان حەزیان لە ئاسایش کورد نەکردووە وکاتێ لە شارەکوردەکان بەرەو شاری ئەرەب یان فارس[1] یان تورک نشینی بچێت. مرۆڤ سەری سوڕ ئەمێنی کە یان کورد بێ کەس و بێ بەشە یان تاچە رادێەک بێ بەزەیێ و دڵ رەقن چۆن ئەمە وایە لە دەوڵەتی جیاواز لە شارەکانیان بە جورەێ باوڕ نەکرد نە؟

ئەم کوردە بەش خوراوە نە کەسێک لە کاتی تەنگانەدا لایەنی ئەگرێ و زۆر بی کەسن لە قەومێ یان لە دەوڵەتە ناودارە نفوزیەکان پشتیبانیان ناکەن هیچ، موئاملەیشیان پێ ئەکەن. لەکوشت وکوشتاریان رەحمی ناکەن. ئەم وتارە لە قەوڵی باڵوێزی رووسی وتراوە یەکێ لە کاربەدستانی بریتانیا دەڵێ: بەرتیل و دەمچەوری کردن و دزی نیشانەێ ئاشکرای ئیمپراتوریەتی ئوسمانی و ئێران و کاربەدستانی ئەوان بووە. و ئەمانە کاریکی ئیجگار

١- لە کاتێ رژیمی شای خائن وکورد فروش بە بێگانەکان.

کوشەندەی کردە سەرکوردی هەژار کە داوای حەق‌خوازی لە نێو دەرونیان بخنکێنن و باج‌دان و دەم چەوری کردنیان بە وڵاتەکانی‌تر ئەدا و ئێتر ئەوانیش بە پێ شێل کردنی مافی مرۆڤ کاریان نەبۆ. وەک: بریتانیا، ئەمریکا، رووسیە، چین، فەرانسە، ئاڵمان و هتد ...

ف ـ د ـ تیل دەڵێ: قایشی سپی لە سەر شان سەربازەکانی ئێران شۆر بوۆە و سەرباز تورکەکانیش کە ناحاڵی بون بە چاوی خۆم دیم کە داوای هیچ شتێ لە کورد ناکەن بەڵام پەلاماری هەمووشتێ ئەدەن و بە قونداخی توفەنگ بە سەر سینگی دایکە باردارەکان ئەیاندا و ئەوانیش منداڵەکەیان لە بار ئەچو. من خۆم سەربازێ تورکم گرد کە چی فەرماندەرەکە نامەێ تامی بو کوشت و بڕی کوردی بە من نیشان دا.

لە لاپەڕی ٢٦ خەبات لە ڕێگەی کوردستاندا ف ـ د - نیل، کە چوەتە شاری موسڵ بە چاوی خۆی دیویە کە کوردەکان دژی حکومەت بۆ سەر بە خۆی خەباتیان ئەکرد و لە دیلەکان لە بەر چاوی خەڵک بو چاوترساندی خەڵک ئەبەسترانەوە و بە خەنجەرێک لە بەر چەناکەیانەوە ئەیانکرد و لە دەمیان بە زیندوی دەر ئەهات بەم جورە کوردیان بو چاوترساندنی کورد بەم سزا سەختە ئەگەیاند.

ف ـ د ـ نیل وتویە: لە بارەێ ئێرانەوە دیم کوردێک بە زیندوی لە مەنجەڵێکدا کوڵێنرا (لە ناو قازان کوڵاندویانە) ئەمە وا بڕێک کورد دەڵێ بە من چی جوابی چیە بیرو باوەرێ چیە؟ ئەوانە وا گیرفان پڕئەکەن چی وڵامیان چیە؟ ئایا مردنیان مەرگە یان نەنگە؟؟!!

ئەورەحمان پاشای بابان بە ئازایانە و کوردانە سێ ساڵ بەرەنگاری لەشکری تورک

بووه تەنیا لە ئەنجامی ناپاکی دۆستەکانی تورکەکان توانیان زیانی پێ بگەیێنن. ساڵی ١٨٠٨ ـ ١٨٠٦ مەحمود پاشا کوڕی ئەوڕەحمان پاشا سەری باشی لە دوژمنانی کورد شێوان.

زانای رووسی دەڵێ: کاربەدەستانی تورکیا لە ئاژاوڵەنان لە ناو کوردەکاندا زۆر حەزیان ئەکرد تا پتر یەکتر لە ناو بەرن و زۆر جار هەوڵی ئاژاوەنان لە کوردستاندا بە وەسیلەی تورک و فارس روی داوە بە بیانوی پەلامار بو کوژانەوە دەستیان بە کوشتاری کورد کردووە گەرچی تەواوی نووسەرە بێگانەکان لە دڵ پاکی و میوانداری و رۆخۆشی کورد باسیان کردوە.

خەچاتور ئەبۆوڤیان دەڵێ: ئەگەر کورد بڵی ماڵەکەت ئەپاریزم ئەگەر بە بای گیانیشی بێت ئەی پارێزی و حاشای لێ ناکات ئەگەر کوردێ لە پیاوەتی دور بو ئەوە پێی دەڵێن زۆڵە کورد. یان لە نەهینەکان زبان بیەستیت ئەگەر خۆی بە کوشت داوە بەڵێنەکەی ناشکێنیت.

کورد هەرچەند خۆی برسی بێت ئامادەیی ئەوەێ هەیەتی نانەکەی بە دو بەشەۆ بکات تا وەک یەک برسی و تێر بن بەڵام‌بە داخەوە حکومەتەکان وردە وردە کوردیان وەک[1] کتێبی (ن ـ خەلفین) لاپەڕەێ ٥٤ دەڵێ هەم ئێراق و هەم ئوسمانیەکان کوردستانیان بە نەچیری خۆیان دا ئەنا و ئەو کوردانە خۆیان بێ‌خەبەر بوون ئێران و تورکیا بە بەرتیل‌دان بە سەروکە هوزە کوردەکان وایان ئەکرد کە دژی رووسیا کورد بە

١- خۆیان ناپاک کردوە ـ مەگەر کوردی زۆر تێگەیشتو لەبارەی سیاسیت.

گژیاندا بکەن کە چی واشیان کرد لە کاتێ شەڕەکان تورکیا و ئێران لە گەڵ رووسیەدا لە کورد لەشکریان دروست ئەکرد و لە ژێر فەرماندەری سەروک هوزەکانیان ئەیان‌نارده جەنگ لە گەڵ رووسیەدا بە قازانجی تورک و فارس و ئەرەب.

کورد بی‌دەغەڵ ئەبۆ بەقوربانی و بەڵاوەگەڕێن دوژمنی خۆی، خۆی بەکوشت ئەدا بوو کەسێک وا بە خوێنی کوردتینو بوو زۆر سەیرە بەداخەوە وا مێشکیان شوریابۆ پیاویان تێابۆ کە خۆیان بە میللەتی تورک یا ئەرەب ئەزانی نەک ئێرانی. لێرەدا دەربەگیەکان و شێخ و مەڵا ئایینەکان بێ تەقسیر نەبوون کە چی داگیر و دابەش کراون ئەبێ لە شوێن رزگاری خۆیان و ڵاتەکەیان بن نەک خۆیان بە دەستی خۆیان لە ناو بەرن.

یەکەم پەیوەندی کوردەکان لە گەڵ رووس ئەگەڕێتەوە بو ساڵی ١٨٠٤ لە کاتێ شەرەکانی رووس و ئێران (١٨١٣ ـ ١٨٠٤ دوای یەکەمین کەس ئێستادف سەروک لەشکە ری رووس نامەیەک بو (حوسەین ئاغای سەروکی) کورد هەنارد بوو. داوای لە حوسەین ئاغا ئەکات بێتە لایەنگری رووسیا بەو مەرجەکە هەموو مافەکانی بپارێزێت و لە ئێران پشت کات کە چی حوسەین‌ئاغا وڵامی نامەکە بە جوابی مەنفی ئەداتەوە. رووسیا لە ساڵی ١٩٠٥دا زۆر تەقەلای داوە کە کوردەکان بەرەو لای خۆی راکێشی لە پاش هەموو هەوڵیکی رووسیە هاتە سەرئەوەکە لە شەڕەکانی ئێران کە لە گەڵ رووسیا و تورکیا لە گەڵ روسیا کوردەکان بیِ لایەن بن.

پ ـ ی ـ ئەڤریانوڤ: دەنووسی ئەمان ویست کە سەرکەردە کوردەکان قایل بکەین بە مەیلی خۆیان ببن بە هاووڵاتی روسیا و هەرچیی‌کیان هەیەبویان بپارێزن هەوڵمان ئەداکە

ئاژاوله و هەرا بەرز نەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵمان ئەدا کە جوڵانەوەکانی چەتەگەرێ کەکوردەکان ئەیان کردە سەرمان خومان لێ بپارێزین.[١]

لە شەڕەکانی رووسی و ئێران ١٨٢٨ - ١٨٢٦دا لە شەڕ رووس و ئێران و کوردەکان خۆیان هەڵ قورتانە ناو ئەو شەڕە. ئەڵبەت سەرکەردە کوردەکان شتێ بە ناوی کوردستان بوێان بەرچاونەبو تەنیا حێله و هۆزبازی گیرفان پر کردن دەربەگیەکان لە کارا بو بە داخەوە یان سەردەستەی کورد لەو سەردەمە تاڵانکەر و یان دەربەگ بوون. کورد ریبەرێ سیاسی یان لە ساڵی ١٨٢٨دا نەبو.

بەم جورە ئێرانیەکان شەڕەکەیان خستە ناوچەیێ کوردستان و کەوتنە پەلاماردانی لەشکری رووسی هەر وەک چۆن ئینگلیز هەوڵیدا ئێران و رووس ریک نەکەون ئیرانیش هەوڵیدا رووس و کورد رێک نەکەون و بەشی لە خاک و کورد کەویتە ژێر دەسەڵاتی رووس. ئێران حازر بە داگیر کردن خاک و ئاوی بو. بەڵام بۆ سەرکەوتن کورد پێ ناخوش بۆ تەنیا لەکورد زیاتر لە هەموویان ئێران ترسی هەبۆ بە تووپ و تفەنگی ئینگلیز و مەشق پێ کردن کوردەکان سیاسەتی ئینگلیزیان بە ئێران سەلماند و بەم جورە ئاگری شەڕ بو چەندەمین جار کەوتە کوردستان. و ئاگری ئەم شەڕە سەرتاسەری کوردستانی داگیر کرد.

جاسوسەکانی رووس دەڵێن: ئێمە زانیمان کە تورکەکان بویان هەڵ کەوتوە و بە کردەوەی دڕندەدانەیان و قین و رەقی زوریان لە دڵەوە بۆ کوشتنی کورد بو لە بەر ئەوە لە هێرش بردن بو سەر تورکیا ئێمە پارێزمان کرد چۆن تورکیا دەست بە جێ پەلاماری

---

١-ئامۆژگاری تورکیا بۆ هاندانی دەرەبەگەکان بۆ تاڵان کردن نەک بۆ حەق خوازی کورد.

ئەهاوردە سەرکوردەکان و ئێمە بیانومان بە دەست تورکەوە نەدا. کاتێ ئێمە سەرکەوتین (رووس) چۆن تورکەکان ناوچەی هەکاری و بادینان و رەواندوز و بوتان یارمەتی تورکیا (ئەستەمول) نەیانداو لەم شەرە کوردەکان بی لایەن بوون و کوردەکان لە ریزی سوپای حەسەنئاغادا لە شەری رووس جارجار یاری رووسیان ئەدات چۆن زەوینەکانیان کەوتووە کورەی جەنگەوە بە هەر لای بای بهاتبایە رویان ئەکرد. کاری تورک باشتر بوایە ئەهاتنە ریزی ئەوانەوە و بۆ ئیمەیش هەروا بۆن[١].

کار بە دەستی رووس دەڵی: ئێمە بە سەرکەردەی کوردەکان بە هەزار چیرفوتنس (پارەی رووس) پیشنیارمان کرد بە مەرجێ کە کوردەکان یارمەتی تورک نەدەن. ئەوان پارەکەیان لە ئێمە قەبوڵ نەکرد بەڵام بەڵێنیاندا کە یارمەتی تورکەکان نەدەن وتیان ئێمە بەرتیل ناخوێن. بەڵکە لە بەر ئەوە تورکەکان تازە لە ناوچە کوردنشینەکان تاڵان و کوشتارییان کردووە کە وا بۆ کورد راستەقینەیە.

ئەمین پادشا و حوسەینئاغا ـ سلێمانئاغا سەرکەردەی ناوچەی زیلان و موش سپیدکی لە سەر بەڵینەکەی خۆیان مابونو ئەمەش بووە سەر کەوتنی گرینگ لە ناو رووسەکان کە دا دەنگی دایەوە.

لێرەدا بومان دەرئەکەوێت کە کورد لە ناوەراستی سەدەی نوزدهەمدا بوو تورک و فارس و رووس سەری دانەنواندوە بەڵام سەروکەکانیان رامیاری نەبوون لە لایەکی

---

١- خەبات لە ریگای کوردستاندا ل ٥٨ لە هەمان سەرچاوە ل ٥٩ کە بێ فایدە نیە باسەکە کورت بکرێتەوە.

تریشەوە ئەوەمان بو دەرئەخات کە کورد نەخێرێ لە تورک دیوە نە لە ئەرەب و نە رووس و نە ئەوانیش بەزەیان بە حاڵی کورددا هاتووە هەر کام لەوانە کورد بۆ دەمقەزا و قەدری خۆیان و بۆ ئامانجی خۆیان بووە کە کەمتر لەگەڵ کوردا بە جەنگ هاتوون بەڵام ئەمانە نەبوو کورد دڵ بسوتێنن و کوردیش لەم شەڕ و هەرادا لە بڕێک جار خوێ بە بی لایەن زانیوە ویستویەوە لە ژێر دەسەڵاتی ئوسمانی و ئێراق خوێ رزگار بکات.

لە مێژەوە کورد بوو رزگاری خوێ لەگەڵ تورک وئەرەب خەبات ئەکات نەک ئەوەێ چەتەگەری بێت. میرئەحمەد کە لە نەوەی سەلاحەدین بووە راپەرێنی رەواندوزی دەست پێ کردەوە لە ساڵی ١٨٣٧ ـ ١٨٣٥ ویستویە تەواوی کوردستانی گەورە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خوێ و ئیستقلال بگرێت. کەچی بەداخەوە هەر کورد ناکورد نەی هێشت.

کتێبی بزوتنەوەێ کورد ل ٢٣ دەڵێ: بو لە خشتە بردنی کوردی هەژار کە بە ناوی برای دینی و ئایینی چیمان بە سەر هات.

ئەم هەموو باوەرمانە بە دوژمن ئەوەیە کە بە ناو برای ئایینی و دینی لە پاش رەشیدپاشای لە ساڵی ١٨٣٧ حافیزپادشا کە جێ ئەوەی گرتەوە (حافیز پادشا جێگەێ رەشید پادشای گرتەوە) خەڵاتی دانا بۆ بوسەر و گوێ و لووت و پەنجە بڕاوی کوردەکان خەبات لە ریگەی کوردستاندا ل ٧١، تورکەکان پاش دروست کردنی گۆمێ خوێناوی لە کوردستاندا توانیان «پاسور» بگرن. تورکەکان سیاسەتی خەراپ و ناباریان لە گەڵ دەرەبەگیەکان گردتبو. پیشەوە چۆن دەرەبەگیەکانیان گرتبوو و نوکەرە تورکەکان بوون ئەوانیان بە گرتن و بەردان تا دەرەبەگیەکان نەهێڵین کوردە هەژارەکان لە خۆیان جم و

جۆڵی نیشان بدەن لە سەرزەوی و زاری خۆیان بە بەدبەختی کە چی لە کاتێ بەرداشتی گەنم پەلاماریان ئەکردە سەریان و دەستیان بە کوشتو بڕی ئاژەڵدارەکان (کەشاوەرزەکان) ئەکرد و بەم چەشنە بە سیاسەت (پیشی، پیشی) لەگەڵ دەرەبەگیەکان ئەبردە سەر. ئەم هەموو چەرمەسەری لە کوردستاندا راپەڕین و بزوتنەوە بۆ حەقخوازی کورد بوە بەڵام والی کوردستان کە دروست ئەبولە راستیدا چێوی دەستی حکومەتەکان بۆ بە موچیاری ئینگلیز و بە تایبەت وڵاتە ئیمپراتوریەکانی جیهانەوە نەک تا ئێستا هەنگاوێ راستیان بو کورد هەڵ نەگرتووە تەنیا بۆ توجارەت سیاسی و باجدان و خراج و موئاملەیێ سیاسی شتێ‌تر ناکەویتە بەر چاوکە وابۆ والیەکانیش هەر لەو سەردەمە تا ئێستا کاریان مائموریەتی بووە نەک خزمەت؛ لە ساڵی ١٨٢٣ کە تورکیا و ئێران لە سەر خاکی کوردستان شەڕیان بو ئێران بۆ خاکی خۆی و تورکیا بۆ داگیرکردن، ئەڵێ: ئەسخەر ئەمینی کارناسی سیاسی لە رۆژنامەی کەیهان کە لە مانگی ٤ تا ٦ لە ١٢ دانە وتاری تەفسیری سیاسی لە بارەی کوردەکانەوە بێ کەتمان باس کردووە مرۆڤ سەری سوڕ ئەمینێ.

مەگەر ئەم کوردە چیە وا تورکیە لە موسادی ئیسرائیل بگرە تا ئەمریکایش دەمچەور بێت بۆ لە ناو بردن کێشەی کورد. تورکیا باجێ زۆر ئەدات بە ئوروپا کە رەفتارە دڕندانەکەی لە گەڵ کوردەکان نەکەوێتە ناو مەسەلەیێ مافی مرۆڤایەتی ئەم کارە بە حەسیب مەسەلەی ناو خوێ بە قەڵەم بدرێ و پارە و باج زۆر بە موساد ئەدات تا بە جاسوسەکانی تورک دەرس فێر کردنی رەخنە لە ناوکوردی «پ.ک.ک» کات و ئاژاوە لە

ناو کوردەکان وا له ئێراق که تارادەیەک سەربەخۆییان هەیە و مەسعود بارزانی به گیانی «پ.ک.ک» هەڵ خرێنێ بو سەرکوت کرتنی کوردەکان به دەست برای خۆی(کورد).

بەڵام له مێژووی کورد له رێبەره سیاسیەکان کەم بووه وەک ئەبدوڵلا ئوجەلان.پر هێز و سیاسەت و تەشکیلاتی پر بەرەنگاری که ئەمریکا به ماهواره شوێنی پێشمەرگەکان به تورکیا نیشان بدات. ئەلی ئەسغەری ئەمینی دیسان دەنوسێ: رێبەری ئەبدوڵلا ئوجەلان بانتر لەوەیه که ئەمریکا و میت و موساد بتوانن رخنەی تێ بکەن.سوپاسی کاک‌ئەلی ئەسغەر ئەمینی ئەکەین که بێ کەتمان و تارەکەی نووسیوه و هەروەها له ئازادی قەڵم له ئێران ئیسلامی.[1]

---

١- (له روژنامەی کیهان) له ١٢ بەش باس « پ . ک . ک » کراوه.

# سەرنجێ گشتی بۆ کورد و کوردستان

گەلی کورد کە لانی کەم بەڵام روون دیاری کراوە کە میللەتیکی نۆ تا هەشت هەزار ساڵە لە سەرزەوینی ئێران ئەژیت. لە ساڵی ١٩٠٠دا کە سەرەتای چەرخی نوزدەهەمدا کە هێشتا کوردستان لەت‌لەت و فوارە نەبو هەر تارادەیەک بو خوێ ئەژیا چۆن زوربەێ حاکمەکانی ناوچەی کوردستان کورد بوون ئەگەر چی ئەوانیش تیری قەزابون و بڕێکیان بیر و هوشی سیاسی‌یان نەبوو ببونە بارمتەی بیگاری لە تورک و ئەرەب خرابتریان خزموکاری ئەوان بوون بەڵام ئەم میللەتە مێژوویە لەم شاخوداخەو ئاوخاکە نیشتە جێ‌یە و مێژووی رۆنی هەیە، بالورەێ دایکە جەرگ سوتاوەکان لاوندنەوەی سوار چاکی ... شاهیدی قەزا و قەدەری کوردە لە مێژووێ تاڵدا دیارە و رۆنە و لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە لە مێژووە ژیانیان لە گەڵ چەرمەسەرێ و رەنج تێکەڵ بووە.

ئێستا کورد نزیک بە سی ملوێنە و هیچ مەرزی و سنووری دیاری کراوی لە بەێن خۆیدا نازانێ تەنیا پارچە پارچەیە ئەمیش بە ناڕەوا لەتە لەتە بوەتەوە و بۆ سەر بەخویێ یەک گرتن نزیکەێ سێ تا چوار ملوێن کورد هەر لە سەر مافی رەواوی خوێ کوژراوە ئەویش بە سووتاندن تا کیمیاوی (شیمیایی) و ماڵ وێران و سەری گەردانی بە جێگەێ خوێ و چەن رێبەرێ مەزن کە لە سەر تولە خۆیان بە فەن و فێل لە سێ دارە دراون و ... و ئێستا ئەم حەق خوازیە دیارە لەم ماوەی چەند سەد ساڵە بە کوشتو بڕو تەڵەکە و پیلانو فێل هێشتا هەر رۆژ بە رۆژ گەشە پەیدا ئەکات و کورد بو حەقخوازی خوێ سۆرتر بووە.

کورد خەوی خوش لە چاوی داگیرکەرەان کە کوردستانیان داگیر و دابەش کردووە نەیان هێشتوە بە دڵی تەخت لە کوردوستاندا بێگانە و نامۆ تیدا ئەرز ئەندام پیاوەتی کات جا ئەگەر چی دوسەد ساڵی تریش هەر داگیر کەر بە کوشت و بڕدڵی خوێ خوش بکات کورد دایمە دڕکی چاوی داگیرکەرانە چۆن بیر ناکەنەوە و سوتاندنی ماڵ دەربەدەری و چەرمەسەری لە بیریان ئەچێتەوە چۆن ئەتوانێ ئەو بڵیسەێ شۆڕش حەقخوازیە تەواوی سەر تا سەری کوردستانی گرتوە چۆن دایئەمرکێنن زۆر سەێرە باشتر ئەوەیە بێنە سەر ئەقڵ و لە قسەێ چەندانە کوردی زۆڵ و ناکورد دەرەبەگی نەخەڵەتین کوردستان لە مێژوودا شاهیدە قەد نامۆلە خاک و ئاوای ماڵی خوی قەبوڵی نەکردووە و ناکات. و تورک و ئەرەب لە گەڵ کورددا هیچ پێوەندی رەگەزی و میللیان نیە. کورد لە گەڵ فارسدا یەک رۆحن لە دو بەستەدا.

لە لاپەڕەی ٨١ ن ـ خەلفین دەڵێ تەنیا ناکوکی نێوان کوردەکان توانی شکەست بە

بزوتنه‌وه‌ی به ده‌رخانی گه‌وره بدات ئه‌گینا موحه‌مه‌د پادشا که رابه‌ر و والی موسڵ نه‌ی‌ئه‌توانی به ئاسانی ئه‌م حکومه‌ته تێک بدات و هه‌ر ئه‌م دو ده‌سته‌یی و ناکوکیه سیاسه‌تی ئوسمانی بو. باڵوێزی رووس چه‌ن جار داوای له ئوسمانی کردووه و زۆری بو تورکیه هێناوه بو شه‌ڕ له گه‌ڵ کورده‌کان.

رووسه‌کان حه‌زیان ئه‌کرد شێخ ئوبیدوڵلا په‌لاماری ئێران نه‌دات و کورده‌کان ئێران زۆر خوشخاڵ بوون بچنه رکێفی شیعه‌کان[1] و شێخ ئوبیدوڵلا پاش شکستی له روسیا روزه‌ش پیْ‌دا رویشته مه‌که له‌وێدا مرد. (دور له وه‌ته‌ن)

سیاسه‌تی شێخ ئوبیدوڵلا وای ئه‌کرد که گه‌لی کورد به چاوی حورمه‌ته‌وه بۆ ئه‌م پێشه‌وا ئایینه بروانن رێزی لیْ بگرن. سیاسه‌تی ئه‌و ته‌نیا ئاوات و ئامانجی رزگاری کورد له ژێر ده‌سه‌ڵاتی روس و تورکیه بو که چی بو به قوربانی رووسیا که موئامله له گه‌ڵ تورکیه کرد.

هیچ کام له‌و کرده‌وه دڕندانه‌کانی تورک و ئێراقی بیْ بایْخ نه‌یتوانی کار به سه‌ر داخوازیه حه‌ق خوازیه‌کان کورد بکات و نه‌یانتوانیوه کوژانده‌وه به بزوتنه‌وه که به ئه‌نجام بکه‌ن بویه که دیسان کورده‌کان خۆیان کو کرده‌وه و په‌لاماری داگیرکه‌رانیان ئه‌دا. گه‌لی کورد هه‌تا ئێستاش هه‌ر له سه‌ر ئه‌م ریْ و شوێنه‌یْ خوی ده‌روات. جوڵانه‌وه‌ی رزگاری گه‌لی کورد هه‌رگیز ژێر ناکه‌وی. (له کتێبی کورده‌کان له ساڵی ۱۸۸۰ نووسینی

---

۱- چون ته‌نیا ئێراق و تورکیا و سوریا و روس خاکی کوردستانینان دابر کردوه و مه‌به‌ست له داگیرکه‌ران ئه‌و چوار وڵاته‌یه. کوردستانات سه‌رزه‌وین ئیرانه.

جەلیل جەلیل).

میرانی سۆران کە میر موحەممەد لەگەڵ ئوسمانی رێک نەکەوت [1] بە پیلانی فەن و فێل بووە هۆی روخاندنی ئەو حکومەتە. مەلای کوێر بە ناوی مەلا خەتی کە دەمچەوریان کرد و ئەویش فتوای‌دا ئەگەر هەر کوردێ لەگەڵ ئوسمانی شەڕ بکات تەلاقی ژنەکەی ئەکەوێت.

بەمجورە پیلانی لەشکری ئوسمانی بە ئەو حکومەتە بەهێزەکە لە شەڕدا نەیتوانی بەم جورە مەلای کوێری کردە چێوی دەستی خۆی و بە ئاواتی خۆی گەێشت.[2]

---

١ - مەبەست ئوسمانیەکان بو تەسلیم بوونی حکومەتی میرانی سۆران و داگیرکردنی ناوچەیَ رەواندوز بووە.

٢ - لە کتێبی میرانی سۆران.

# شۆرشەکانی کورد بۆچی سەر نەکەوتن

لەو رۆژەی بزوتنەوەی سیاسی کورد دەستی پێ کردووە ئەوە هەموو شۆڕشەکە بەرپا کراون بە چ تاوانی سەر نەکەوتون دیارە هوێ گەورەێ هەبووە کە نەیهێشتوە سەرکەون ئەو هویانەش ئەمانەن.

١ ـ نەبونی پارتیکی پیشڕەوی شورشگیری ریکخەری پروگرام و پەیرەوێکی هەڵ قوڵاو لە ناوچەگەری بەرژەوەندی گەلەوە.

٢ ـ بوونی پیاوانی ئایینی و ئاغا و دەرەبەگ کە بە پەی پی ویست پشتگیری شۆڕشی نەتەوەکەیان نەکردەوە لە جیاتی پشتگری بە پێچەوانە دەستیان لەگەڵ دوژمنانی کورد دژی شۆڕش نەتەوەکەیان دەکرد بەرامبەر بە وڵاتەکەیان.

٣ ـ پارچە پارچە بوونی کوردستان و بچڕاو بونی نیشتمان و پەیوەندیکی نیشتمانی

لە نێوان شوڕشگێڕەکانی کوردستاندا نەبوونی بیروباوەڕی یەکیەتی بو رزگاری ...

٤ ـ یەکەیەتی دەوڵەتەداگیرکەرەکانی خاکی کوردستان و هەروەها فروشتنیان بە نەوت و بارودوخی سیاسی وڵاتە ئوروپایەکان بە تایبەت روسیای (رۆڕەش) و ئینگلیز و ئیمرپریالیسم پیرەکە مەشهور بە پیری کەفتار و پشتگیری داگیرکەرەکان بولە ناوبردنی بزوتنەوەکانی شوڕشەپاڵەوانەکانی کورد لە هەر ناوچەیەک کوردستاندا هەڵگیرسابی...

٥ ـ زوری چەک و تفاقی جەنگی دوژمن و سەر کەوتنی لەم روەوە چونکە داگیرکەرەکان وا زۆر درەندانە پەلاماری وەحشیانەیان ئەکردە سەر کوردستان و بێبەزیانە لە ژن و ماڵ و منداڵ و پیر و جوان بۆ کوشتن‌یان دەستیان نەئەترسان بەڵام کوردەکان لەم بارەوە چونکە جەنگ ئەکەوتە ناو خاکی کوردەوە ناچارکوتاییان ئەکرد لە هەلەکاندا. بۆ بنەبڕ کردنی ماڵ و خیزانی و خزموکەسوکاری پیاوژنە شوڕشگیرەکان بۆ دڵ شکاندنی پێشمەرگە. بو نموونە شەری بارزانی لەگەڵ حکومەتی دەورانی قاسم.

٦ ـ نەبونی یارمەتی دەرەوەی و نەبونی دەزگای پروگاندە و ناساندنی کورد بە بێگانە لە وڵاتەکانی دەرەوە بە تایبەت لایەنە ئازادی خوازەکانی جیهان و نەبونی هاوکاری سیاسی و پشتیوانی گەلانی جیهان بۆ بزوتنەوە شوڕشگێرەکانی کورد و کوردستان.

٧ ـ بوونی کومەلێک لە چاوچنوکان و چڵکاوخورەکان کە بو پارە هەمیشە ئامادەن بو خزمەت و خۆ فرۆشتن بە بێگانە و یارمەتی دانیان لە دژ نەتەوەکەیان کە ئەمانە ستەمکارترین ستەمکەرانی مێژووی گەلی کوردن و مایەیێ نەنگی کوردن چونکە ئاو بە ئاسیا و دوژمن ئەرێژن و چاپلوسی و چەور زوانی و ... خو بە زل زانین. یەکێکە لە دەردە

گرانەکانی گەلی کورد.

٨ ـ نەخوێندەواری له بارەی مێژو و فەرهەنگ و هەروەها قەدغەبونی باسی رامیاری کورد و پەرە پێدان بە دابوونەریتی و فەرهەنگ له کوردستان و هەروەها بێگانە بوون له بنە و بنچینەی گەل له خۆی بارێ گرانە.

٩ ـ ناکۆکی ئەشایری و تیرەگەری له ناو کوردەکانا بەگ و دەرەبەگ و مالک خوێنمژ کە له هیچ زوڵمو ستەمی ئەربابە زەمینداره‌کان بە حەدێ بووەکە خویانیش کورد بوون و نەقڵ له «بای ڤ ـ دیبل» و «ن ـ خەلفین». خەیانەتی مالک و ئاغاکانی کورد کەمتر له خەیانەت و کوشتوبڕی حاکمە داگیرکەرەکانی کوردستان نەبووە. له ئەسڵدا هەر ئەوانە کوردیان له حەقخوازی بێبەش کرد. ئەوەندە سزاو و سەرانە و باج ... له کوردەکان سەندوەکە نیوەی دەسترەنجی کوردەکان کە بەرەنجی شانی کەشاوەرزەکان بە دو نیوە زیاتر بە دو بەشییان ئەکرد جگە له بێگاری و... بابمێنێ. روویان له دنیادا رەشتر بێت لەوە سەیرتر؛ ئەگەر رایەتی بیویستا یا بوک بێنی یا کچ بە شوو بدات دەبواییە بە پرس و رەزامەندی مالک بوایە، یان ئەگەر کەسێک سێ جار سڵامی مالکی نەکردبایە شەو له تەوێڵە حەبسی ئەکرد و هەوسار کردن یەکێ له کار ئامیەکان بووە. ئایا ئەمانە حەق نیە ئێستا خۆیان هەوسار بکرێن؟ له ژێر دار پشت شکاندنکاری یەک له هەزارە ئەم ناکوردە زۆڵەکوردانە مالک و ئاغاکان بووە، لاشەی پیسیان بۆ بەر سپڵۆت باشە. ئەگەر رایەتێ له دەستی ئەوانیش شکایەتی بکردایە له سەر حەق خۆی بویایە بە تاوان بار ئەناسیان و له پاسگاکانی حکومەت دەستیان بە دەستی کەرەوە ئەبەستەوە بگرە هەر ئەو رایەتە

بیانکوشتایه تا که‌سێک‌تر دژی مالک رانه‌وێستێ. پیاوه ژاندارمریه‌کانیش حه‌ڵقه له گوێی ئه‌وان بوون. شای سته‌مکار هه‌وسار له سه‌ری مالک بو ئه‌ویش هه‌ر سیاسه‌تێ بو له به‌ر ئه‌وه کورده‌کان ئیتر هه‌وای بزوتنه‌وه به سه‌ریان نه‌دا به‌ڵام هه‌مو شتێ له باریکی بچڕ ئه‌بێ ته‌نیا زوڵمه که له قه‌ویه‌تی ئه‌بچرێت. مافی ره‌وای کورد به زۆر زه‌وت کراوه.

تا ئێستا که بۆمان ده‌ر ئه‌که‌وێت هیچ که‌س به‌زه‌یێ به حاڵی گه‌لی کورد نه‌هاتووه نه وڵاته داگیرکه‌ره‌کان ره‌حمیان هه‌یه‌و نه دراوسیه‌کان. چونکه ئه‌وانه به نه‌وت و پاره قورپیان پڕ ئه‌که‌ن. لاپه‌ڕه‌کانی مێژوو روونیان کردوه‌ته‌وه به‌ڵگه و سه‌نه‌دمان هه‌یه ئه‌ی براکان ئه‌ی ئه‌وانه‌ی وا شه‌و به بێ خه‌م کورد سه‌ر ئه‌نینه سه‌ر سه‌رین ئه‌گه‌ر وا بێ خه‌یاڵ بن حاشا ئێوه له نه‌وه‌ێ ئه‌م خاکه نین. له کتێبه‌که‌ی خه‌بات له رێگه‌ی کوردستاندا (جنبش ملی کورد) بزوتنه‌وه و سه‌ر چاوه‌کانی دوکتور بله‌چ شیرکۆ له کیشه‌ێ کورددا ئه‌ڵێ: مه‌سه‌له‌ی کورد سه‌ر به خۆیی کوردستان هه‌ر له روی سستی و فرِ و فیڵی ئینگلیزه‌وه به ئه‌نجام نه‌گه‌یشت له مه‌دا کورده‌کانیش خۆیشیان بێ ته‌قسیر نه‌بوون و به‌شدار بوون و ئه‌توانین بلێن که تاتونی ئه‌بێ له کورده‌کان خۆیان بگرین چونکه ئه‌گه‌ر کورده‌کانی به‌ش‌کراو به تورکیه له‌و کاته‌دا ئاتاتورکیان یارمه‌تی نه‌ئه‌دا و له گه‌ڵ شێخ- مه‌حمود رێک ئه‌که‌وتن زیاتر مه‌سله‌ی سه‌ر به خۆیی کوردستان ره‌نگ و بۆی به خۆیه‌وه ئه‌گرد و هه‌روه‌ها ئه‌بێ ئه‌م زوردار و سته‌م گه‌رانه به کورد و ئیران ئه‌وه بزانن رۆژگاریان هه‌روا درێژه ناکێشی تا ئافره‌تانی کورد به‌نه‌یزه و خه‌نجه‌ر هه‌ڵدڕن. چونکه کورد دێر یا زوو ئه‌وانه‌ی که له خه‌وی غه‌فڵه‌تدان که له دابونه‌ریتی و هه‌روه‌ها به ته‌واوی مه‌سه‌له‌ی

كورد له دڵ و ده‌رونیان نه‌ماوه تێ ئه‌گه‌ن له داهاتودا بیر كه‌نه‌وه و بێ ده‌نگ نامێنن گه‌لی كورد چه‌ند هه‌زار ساڵ پێش به‌ر له ئه‌وه‌ی تورك یا ئه‌رب خوی ماقوڵ بێت له كورده‌وه فێر بوون و بۆ نموونه به‌ڵكه مێژوویه‌كان شاهیدن بو ئه‌م ئیدیایه كه له ژێر زه‌وین و مۆزه‌خانه‌كانی وڵاته ئه‌جنبیه‌كان ئاسه‌واری كه له ته‌مه‌دون و فه‌رهه‌نگی ئه‌م میلله‌ته ده‌رئه‌كه‌وێت كه وا بو بیرله رابردوكه‌نه‌وه و به كوردبونی خۆیان شوكرانه‌ی پێ بكه‌ین.

میلله‌تی كورد ئه‌بێ مێژوومان به‌ر چاوی خۆمان بخه‌ێن و سه‌ر گوزشته‌ی كورد بو ئێمه ده‌بی په‌ندو ده‌رس بێت ئه‌و شتانه كه بزوتنه‌وه‌ی كوردستانیان هه‌ڵگرساندوه ئه‌وانه‌ی كه بزوتنه‌وه‌ی كوردیان دامركاند و كام به چ هۆیه‌ك و بێ سیاسیه‌تێك كورد و سكرتیری كورد شۆڕشه‌كانی پوكاوه‌ته‌وه ئه‌مانه هه‌مووێ بكه‌ێن به سه‌ر مه‌شقی داهاتوو راستیه‌كی ته‌جروبه و ئه‌زمونی سیاسی و هه‌روه‌هامێژووی كورد و كوردستان ئێمه ئاگامان لێ بێت و هه‌ر كوردی چ له كاسب و توجار و كارمه‌ند و چینی لادێ‌كان هه‌مووێ ئه‌بێ بۆ سه‌ربه‌خۆیی كوردستان به هه‌ستێكی كوردانه و مێشكی پڕ له سه‌ودای ئێرانی گه‌وره به‌شداری بكه‌ین. به‌ڵام برێك لاده‌ر و بێ بار هه‌یه‌كه به‌ڕاستی خۆیان زۆر خوێری و بێ هه‌ست و نیستن و ده‌ڵی باری ئینسانی و مرۆڤ له ئه‌وان نیه نه ته‌نیا كوردستان با دنیاش تاڵان و وێران بێت ئه‌وانه نه ته‌نیا له ریزی مرۆڤ دا نین، به‌ڵكه له زۆم‌ڕه‌ێ تاوانبارانن. ته‌نیا خه‌ریكی گیرفان پر كردنن له راستیدا هیچ نازانن پێ‌ناسی خۆیان ون كردووه و یان ئه‌وێ كه له داب و نه‌ریتی خۆێ له بیریان چوه‌ته‌وه هه‌ر بۆ ئیشوكاری ژیانی ناموباره‌كیان ته‌شكو نه‌نگیان لێ دێت. ئه‌وانه له راستیدا نه‌زان و له بنه‌ماڵه‌یه‌ك

باش و فه‌رهه‌نگ په‌روه‌ردا چاوی نه‌کردووه‌ته‌وه یان به قه‌وڵی پیشنیان له سه‌ر سفره‌ی باوک و دایکیان گه‌وره نه‌بوون و یان بنه‌ماڵه‌که‌یان جێگه‌ی بایه‌خ نین ئه‌وانه بۆچی له داب و نه‌ریتی باپیرانیان ته‌شکیان هه‌یه ئه‌گینا زۆربه‌ی مێژوونووسه‌کان بسپوران له فه‌رهه‌نگ و نه‌ریت‌دا ده‌ڵێن له نێو هه‌موو نه‌ته‌وه‌کانی دیکه‌دا ته‌نها کورد تاڕادیه‌ک ره‌سه‌ن خوی و فه‌رهه‌نگی پاراستوه له پاش ٢ هه‌زار ساڵ به ناڕه‌وا گوڕیان بۆ هه‌ڵکه‌نده‌وه و زینده‌به‌چاڵیان کردووه به‌ڵام چۆن سینگ کورد جیگای پاراستن بووه هێشتا خه‌وشی لێ نه‌نیشتو. ئه‌وانه وا له بنچێنه‌ی خۆیان حاشا ئه‌که‌ن به شیری بێگانه گۆچ کراون لێره‌دا باش وایه چه‌ن وه‌سیه‌تی ماموستاکانی نه‌مر بخه‌ینه به‌ر چاو.

ماموستا قانع فه‌رمویه‌تی:

شیره پاکه‌که‌ی دایکت نه‌خۆی به‌درۆ

رۆڵه سه‌د ئامان نه‌م‌که‌ی ره‌نجه رۆ

❋ ❋ ❋

من له خاکی پاکی کورددا رواوم

به شیری پاکی کورد گۆچ کراوم

❋ ❋ ❋

وە مامۆستای پایەبەرز شێرکۆ بێکەس فەرمویەتی:

گەرچی هێندێ کەس خەریکی ورگ وگیرفان پڕ ئەکەن

شەو بە بێ خەم لە بۆ کورد سەر ئەنینە سەر سەرین

هەر سەرین و سەرسەری حاشا نەوەی ئەم خاکە نین

* * *

یان شاعیری فارس دەڵێ:

هەرکەس ندارد نشانی از پدر، گرفته است مادرش از جای دگر.

* * *

هەرلە سەرەتای مێژووی گەلی کوردەوە زۆر بوون لە جەنایەتکارانی خۆماڵی کە بۆنەتە هۆی دواکەوتنی میللەت چۆن دڵسۆزی زێد و نیشتمانی خۆیان نین ئەگینا میللەتی وا لە شەش هەزار ساڵ پێش‌دا خاوەنی کەلەپوری نەتەوایەتی بێت چۆن دەبێ ئار و نەنگیان بێت دەیان جار کەوتونەتە بەر گێژ و لولی چەرخی رۆژگار. دیسان چەرخیان لە چەمەر بڕیوە و رۆژگاریان تێ پەڕ کردووە و تەنگو چەڵەمەی رۆژگارانی سەختی خۆی بڕیوە و لە هەموو دەورانێکدا هاتونەتە روی بساتەوە خۆی بە حەماسەی پیاوەتی و ئازایەتی نواندوە لە جوامیری ئازایەتی بە ناو بانگ بووە و بایەخی

زۆر به نامۆس داوەو خوپەسنەندی له ناو کورددا زۆر کەمە

هەروەها دەزانین فەرهەنگی هەر میللەتی پێناس ئەو میللەتەیە له جاران چاک ترو پاکتر پارێزگاری له هەموو ئاکارەکانی کوردی بکەین تا زیاتر له بەین نەچێت.

ئەوکاتە وا قەومی کورد له سەر روی روزگاردا ناوونیشانی بوو پادشای ئاشوریەکان پاش مردنی خوێ بە کوڕەکەی ئەسپێری کە قەومی ماد تەختوبەتی تو لێک ئەدات[1] له بەر ئەم هەرەشە سالمانازار فەرمانی داگیر کردنی وڵاتی ماد ئەدات و پەلاماری دڕندانە له وڵاتی ماد ئەکات هوخشتەرە شای ماد بە وینەێ رەزمی پارتیزانی ئەچێتە ناو قەڵای ئاشورەوە و تەخت و بەختی ناو قەڵای ئاشوور و ئەو شای خوێنخوارە بە سەریدا ئەروخێنێ. دیسان لەم بارەوە بیرورای جیاواز هەیە کە بەم جورە باسی کراوە پادشای ئاشوور له ڕەقا قەڵاکەی خوی ئاگری لێی بەردا و خوێ ماڵ و سەروەت و سامان و منداڵی خستە ناو ئاگرەکە هەموو دارو دەستەکەی سوتیان و ئەو دەوڵەتە بە هێزە چوە ناو ئاگری قار و کینەوە، ئەگەر مێژووی و دەسەڵاتی حکومەتی ئاشوریەکان له لاپەڕەکانی مێژوو بدەینەوە ئەو کاتە دەزانین بەرامبەر چ حکومەتی ماد بەربەرەکانی کردووە و حکومەتی وا ئیلام و بابل و میسر باجدەری بووە چون دەسەڵاتداری حکومەتی وڵاتی ماد توانیویە سەری ئاشوور له خوار بکاتەوە. بەداخەوە گەلی کورد له رابردووی خۆمان زانستی باشمان نیە ئاکامی ئەو نەزانینە وادەکا خۆورەوشتی بێگانە فێر بین ئایەتووڵلا

---

١ ـکە لە ئیلمی ئەستێرەناسیدا پیان وتووە. چون لەو سەردەمە له ئیلمی ئەستێرەناسی و تالعناسیدا باو بوە و بە پادشای ئاشوریان گەیاندوە.

مەردوخ دەڵێ: لە برێک قەوم وا داگیر ئەکرێت. خەڵکی نەزان رەوشت و رەفتاری ئەو داگیرکەرانە فێر ئەبن و بگرە خۆیان هەر وەک داگیرکەر رەفتار بکەن لێرەدا ئەگەرچی باب و باپیرەکانمان رۆداوەکانی مێژوویان لە سینگی خۆیان پاراستووە و بە ئیمەی کوردیان گەیاندووە پاش شەش هەزار ساڵ گۆرانی و داب و نەریت و مەقام و بەیت و بە سەر هات کە بەشێکی لە ژیانی گەلی کورد بوە پشتاوپشت بە کورد گەیشتووە ئەوانە لەم ئاو و خاکە پەروەردە کراون بونەتە کەڵە پیاوانی مێژوو.

ئەوانە وا لە بنەماڵەی دەرەبەگیەکان هەڵ کەوتوون چڵ کاوخۆر و مەردەزەند و بێ‌بار و خوێرین لە ناو پیاوانی دلێر شەرمیان لێ دێت کە بڵێن ئیمەش مەردین. مالکەکان وا زەوێ و زاری کوردستانیان تاڵان کردووە زەبری کارییان بە کورد گەیاندووە ئەم مل پان و بێ رەسەنانە خوێنی کوردیان مژی، بوونە دەوڵەتمەند تا پزشک و موهەندیس کە چ هەنگاویکیان بۆ کوردیان هەڵ نەگردووە. ئەم مالک و دەرەبەگانە مایەی نەنگ و دواکەوتنی گەلی کوردن کرم و زالوون بو کورد کە ریشەیان هەڵ بچرِا لە ناو خاکی کوردستاندا.

برێک پیر قەراڵ و کەفتار لە مالەکان بە چاوی خۆیان دیان کە رایەتەکان چۆن هەی‌یان لێیان کرد بە ریسوایی فرەوە هەڵاتن هەر ئەم زوڵە کوردانە فەرهەنگ و ئایینی بێگانەیان بۆ وڵاتی کوردستان هاورد. لە دوارۆژدا گەلی کوردستان لە سەر هەر قەبر و گۆرێ مالکی وا زاڵم بوون ئەبێ کەلەی شەیتانێ دابنرێ بەو شێوە وا جنوکە بێت تا ئاوێنەی ئیبرەت بێ بۆ پاشماوەکانیان ...

پیاوانی مێژووی کوردستان وا سەرو ماڵ و منداڵیان لە ڕێگەیّ نیشتمان باخت کرد.
سمکۆ کە کوڕەکەیّ بە دیل کەوتە دەستی تورکەکان و تورکەکان گوتیان ئەگەر شەمئون ئەرمەنی بکوژیت کوڕەکەت رزگار ئەکەیّن کە چی درووپان لە گەڵ کرد بەڵام ناوی لە مێژووی شەرەفنامەی کورد بۆ هەتاهەتایە لێڵ نابێ بۆ کورد ژیاو بۆ کورد مرد کاتێ کە (سۆنی) ئینگلیزی پێشنیاری پارە بە سمکۆ ئەکات، سمکۆ دەڵێ شێخ مەحموود پارەیّ پێ داوم، ناوی من کوردە من خۆ فروش نیم، کوردی لێ قەوماوم تورکەکان ژنمیان کوشت، کوڕەکەمیان بەدیل برد ئێوە لە گەڵ تورکەکان بە کورد موئاملەتان کرد. حکومەتی شێخ مەحموودتان تێکدا وئێستا بە پارە من ژیر ئەکەنەوە. من مێوانی براکوردەکانم و کورد قەد سنوور نەناسی ئەم دیوو ئەو دیو ماڵی برای خۆیانە ئێوەیّ خەیانەتبار سنوورتان بۆ کورد داناودا بەشتان کرد بە تورکەکان و ئەرەبەکان و فارسەکان. کاتێ لە شنۆ بۆ وتووێژی سمکۆ لە گەڵ پیاوی حکومەتی بۆ ئاشتی لە بەر دڵسافی و خۆش باوەری، پێی دەڵێن هێشتا ئەمیر نەهاتووە لە کاتی دەرهاتنی سمکۆ ئەیدەنە بەر دەسترێژ و بەم نامەردیە شەهیدی ئەکەن. ئەم پیلانە لە لایەن خائین و خۆفروشەکاننەوە کرا، تورک و ئەرەب و وڵاتە ئوروپایەکان دایم لە گەڵ کورددا درۆیان کردووە.

کەچی کاتێ یەکی لە گەورەکانی ئێرانی بە دیلی ئەبێت دەڵی ئەمە نامەردیە من ئێستا بیکوژم. بەڵام من دەزانم ئەم کابرا ئاخری خۆم ئەکوژێت ئەگەر وایش چی بۆ بەنامردی شەهیدیان کرد. و خۆی بە کابرای رووسی دەڵێ خوای ئەم کوردە هەژارە بتانگرێت.
جەعفەرئاغای برای کەمتر لە سمکۆ نەبوو ئەو پیاوە دڵسافە بە سوێند خواردن ئەمیر

ئینتزام گەڕۆس کە دەڵێ بە قورئان لە روی سەرزوی من خەیانەت بە تۆ ناکەم ئەم خۆفروشە نەنگ‌ناوە ئەمیر ئینتیزام بە چاڵ کەندن لە ناو ماڵەکە جافر ئاغا ئەکەوێتە نا وچاڵەکە و لەوێ دەستریژ ئەکەنە سەری ئەویش گیانی فیدای بیروباوەری ئەکات و ئەمیر ئینتزام دەڵێ: من سوێندم خوارد و لە روی زەوی‌خەیانەتی پێ ناکەم، بەڵام ئەمە ژێر زەوینە.

مینورسکی مێژوو نووس و پسپوری مێژووی کورد دەڵێ: من بە چاوی خۆم دیم کە حکومەت زۆر لە جافر ئاغا ئەترسا. خەڵکی کوردیش زۆر خوشیان ئەویست و بە چاوی رێزو حورمەتەوە بە جافر ئاغا شانازیان ئەکرد چۆنکە هەر چی دەستی کەوتبایا بە سەر هەژار و فەقیرەکاندا بەشی ئەکرد.

دیسان مینورسکی دەڵی: بە چاوی خۆم دیم کە هەشت سواری کورد کە پاسەوانی جافر ئاغا بوون چاویان نە ئەپتروکاند و دوای چاو پێ کەوتنی رۆداوەکە بە رادەیەێک غیرەتیان نواند کە من لە ژیانی خۆما قەد لە بیرم ناچێتەوە کوردەکان ویستویانە ژێنراڵەکە بکوژن بە جێگەی جافر ئاغا، لە شاری تەوریز کە گەمارۆیش درابوون و چەند کەسیشیان کوشت لە شاری تەوریز هەڵاتن و لە کونای دووکەڵدانی سۆمپاوە دەرچون و خودی تورکەکان لە ناو خۆیاندا دەیان گوت ئایا ئەمە ئازایەتی نیە شەش دانە کورد بە دوو جەنازەوە لە شاری گەمارۆ دراودا دەربچن؟!

ئەمیر ئینتیزام: کە لە کوردەکانی گەڕووسە بە خەیانەت بزوتنەوەێ کوردی کوژاندەوە.

مینورسکی دەڵی: کوردەکان شل و شێواووبێ ئەقل نین بەڵام تواناێ تەواوی

ئەوەشیان نیە کە روشنبیری و زانیاری خۆیان پەرەیْ پێ بدەن و بەرەوپێشیْ بخەن.

وەرگیڕی کتێبی نووسینی مینورسکی (حەمەسەئید حەمە کریم) دەڵێ: هویْ خوروەشتی ئەو سەروکانە وابووە کە وایان زانیوە باری چاکە و پێشکەوتوانە تەنها لە راهێنان ئامادەکردنی سەربازیە و لە شەڕدا سەر ئەکەون. بویە کورد لەکوڕی روشنبیری دا زۆر کزن. بڕێک لە سەروکە هوزەکان کوردی دەرەبەگەی بوون و لە بەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان خوێندن و روشنبیری سیاسیان ئەخستە پشت گویْ کە وا بوو بەر لە دەست بە چەک دان مێشک شەرتە نەک دەست بە چەک بێ، بزانی بۆ چی. لێرەداچەند بەیت لە مامۆستا شائیرە نەمرەکان ئەخەینە بەر چاو:

گیان فیدای دەست و قەڵەم بێت ئەسپ و زینم بۆ چیە
تاقەڵەم هیمەت بکات برنەو کرِینم بۆ چیە

«مامۆستا بێکەس»

* * *

چەپ گەردی گەردوون گەران کوشتمی
نەزان پەرەستی بۆ نان کوشتمی
هەر چەوسانەوەی بێ حەسانەوە
ئەی مردن لە کوێی ژیان کوشتمی

«مامۆستا هەژار»

* * *

لەکتێبی داب و نەریتی کوردەکان مامۆستا بایزدی دەڵێ: هەر میللەت و قەومی وا زۆر و هێزی بە سەر میللەتی دیکە بگری هێندێک لە فەرهەنگ و داب نەریتی بەسەر ئەو میللەتەدا ئەسپێنرێ و بۆ لابردن و تێکەڵ کردنی ئەو میللەتە داگیر کراوە هەروەها بڕێک لە تەمەدون و قسەو جل و بەرگی و هەڵسان و دانیشتنی ئەو میللەتە حاکمە فێر دەبێ و هەندێکان لەو میللەتە داگیر کراوە،بە چەشنی داگیرکەر دەرتێن و بگرە ئەگەر لە مێژووی خۆیان نەزان بن. و بەیت و باو خۆیان لە بیردەچێتەوە و داب و نەریتی بێگانەی داگیر کەر جێگایان پڕدەکاتەوە و بڕێکیان هەر وەک خودی داگیرکەر بۆزێد و نیشتمانی خۆی ئازار و ئێش دەگەینن بەڵام ئەگەر ئەو میللەتە لێهاتو زانا بێت لە میرات و فەرهەنگی خۆیان پاوسەوانی دەکەن لە هیچ دەور و رۆژگارێکدا خۆیان و میللەتیان و فەرهەنگیان لە بیرناچێتەوە بگرە بۆ پەرە پێدان تێ ئەکۆشن لە هیچ هەوڵ و تێکۆشانی بو سەربەرزی گەل و وڵاتی خۆی ناوێستن ، و بە ئەو پەڕی گیان بەخت کردن لە ئامانجی خۆیاندا بو گەل و وڵاتی بە شانازی ئەزانن.

حەمەسەئید حەمە کەریم وەرگێڕی کتێبی کورد کە مینورسکی نووسیویە دەڵی: خۆو رەوشتی ئەو سەروکانەێ (ئەرباب مالکیان سەروکە هۆزەکان وایان زانیوە باری چاکە پێشکەوتوانە تەنها لە راهێنان و ئامادە کردنی سەربازیدایە ئەمیش لە بەر بێ سیاسەت بوونی گەلی کوردە لەبارەێ پەرەپێدان و پێش خستنی رۆشنبیری کوردە.)

مینورسکی دەڵێ: ئەمە رایێ من نیە و هۆی سەرەکی نیە بۆ ئەو مەسەلەیە کە هەمور سەرانسەری کوردستانی گەورەوە لە ئەو سەردەمەدا کورد بۆ سەربەخۆی تێ کۆشا بێت

چونکە هۆی سەرەکی ئەوە بووە کە دەرەبەگیەکان لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان تاکوو ئەم نزیکانەش بە دەستی ئەنقەس نەیان هێشتووە جەماوەری گەلی کورد رۆشنبیر بیێ و پێش بکەووی و چاو بکاتەوە و لە زووردارى چەوسێنەرێ ئەوان بگەن بە زانیاری و رامیاری ئیتر خەڵکەکەیان بە شەڕ و شۆڕ لە ناویەک دوو بەرەکی و ... و خەریک کردووە و بەم مەسەلەیەلە سەرحەق خوازی یەکگرتوێ دوور بخەنەوە هەروەها لە پێشکەوتن‌دا.

مینورسکی دەڵێ: بە چاوی خۆم دیم سمکوێ بە ناو بانگ کە تەفەنگەکەێ لە قەوانەێ فیشکەکەی بە چڵێداردا کرد و ئەلەریەوە لە دەوری پانزدە هەنگاویەوە تەقەێ لێ کرد و ریک دای لە ناوراستەکەێ.

دیسان مینورسکی دەڵێ: کێو و چیاو دوڵی کوردستان نیە کە داستانی شەڕ و شوڕێ تیا نەبێ هەر شوێنی راسایی و هەموار بێت سوارەێ کوردی تێدا پەریووە جێگەێ کەڵەپیاوانی کوردە، شین و رۆ رۆ دایکە جگەرخوێنەکانە شاهیدی کارەساتی دڵ تەزینە. کوردەکان لە ناوجێگا مردن بە ئار و نەنگی دەزانن. دەڵێن وەکو کەڵ ئەبێ سەر لە سەری شاخ و بەرد بکەوێ و لێزمەێ خوێنی گەشی لەشی بە سەر ئاو و خاکا بڕوات نەک بە بەش خوا و چاوی بەزەیی لە ناوجێگا مردن. کوردەکان گیان بەدەم شمشێر وگوللە بە شانازی ئەزانن ئەم قەومە دیارە قەومی سەر شۆڕ ترسەنوک نیە تەنیا دڵیان ساف و دڵ‌نەرمن بەڵام لێها تو بە جەنگن.

وەوەرگێری کتێبی مینورسکی دەڵێ: خۆزگە مینورسکی ئەوەشێ بنووسیا کە کورد وڵاتانێ وا بەلای خۆیانەوە لایەنگری حەقوقی بەشەرن ئەمانە بە (قەومی کورد)

توجارەت ئەکەن و هەر ساڵ ئەگەر جیرە و هەڕەشەی کورد نەبێت هەر وڵاتە باجسێنەکان لە برسا ئەمرن چۆن ئەبێ دەمی ئەوان چەور بێت تا داگیرکەرانی خاکی کوردستان خەوی راحەت لە سەر سەرین بکەن.

هەروەها لانی کەم بۆ هەمووێ کوردێ دەرکەوتووە کە مافی کورد ئە بێ بەسەندن بێت نەک داتن کەچی بە داخەوە هێشتا بڕێک بە تەماێ بە قەوڵی فارسەکان (زەرد ئالو، بیا گەلو) ئەگەر کورد شۆڕشەکەێ شێخ ئوبەیدئوڵلاوا لە کتێبە مێژوویەکاندانووسراوە سەرنجی بدەێن بۆمان دەر ئەکەوێت کە چ بە سەرهاتێ بە سەر ئەم کوردە دڵ سافە هاتووە.

کاتێ کە شۆڕشەکەی شیخ ئوبەیدوڵلا تێکشکا ئوسمانیەکان بە شێوەیەک دڕندانە کەوتنە گیانی کوردەکان و جیا لە سوتاندن ماڵ و جەنایەت بە سەر ژن شۆڕشگێڕەکان. و ئەوانەی وا لە گەڵ شێخدا هاریکاریان کردبوو پاش قوڵبەست کردنیان ١٠ و ١٥ ئەیانخستە ناو کیسەێ گەورە و ئەو خەڵکە بە زیندووی ئەخرانە دەریا هەر ئەو جینایەتە ئوسمانیەکان کردیان والەم دوایەدا سەییرەزا فەرموی لە قیامەتدا. رەسولوڵلا لەئنەت ئەکات کە ئەگەر نەچین بە فریای برای موسڵمان تورکیا لە دژی یونان ئەگینا دووا رۆژ لە قیامەتدا جوابی ئێمە چی دەبێ و دەڵێ، ئیمە ئەبێت یارمەتی ئوسمانیەکان بدەێن.

دەرەبەگە کوردەکان هەر بە یەکەم هەڕەشەی ئێران و تورکیا پشتی شێخ ئوبەیدئوڵلایان چۆڵ کرد و دوا جار خۆیان کوردە حەق خوازەکانیان بۆ بەدرەقەێ خۆیان و خۆشیرینی قوڵبەست ئەکرد و تەسلیمی داگیر کەرانیان ئەکرد یان بێکارە لاش خۆرەکان کە لە بۆ

دابین کردنی ژیانی ناموبارەکیان ئەچوونە ناو ئەرتەشی ئێران و ئوسمانی و بە خزمەتی نیزامی دەرئەهاتن بە شێوەیّ نامرۆڤانە ئەکەوتنە گیانی براکوردەکانی خۆیان و لە داگیرکەرەکان خراپتر زەرەر و زیانیان بە کوردەکان بۆ سەر ماڵ و نامۆسیان بوو، بو نموونە لە کتێبی راپەرینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠دا لە لاپەڕەیّ ١٤٢ یەکی لە فەرماندە نیزامیەکانی ئێران کە کوردی سنە بووە ناوی حەسەن ئەلیخانی موتەسەریفی بووە بەم جۆرە ئەم جینایەتەیّ لەو زوڵە کوردە ئەگرێتەوە و دەڵێ: حەسەن خانی موتەسەریفی سۆێند بوو هەمزە ئاغای مەنگور ئەخوات کە ئەگەر خۆی تەسلیم بکات خەیانەتی پێ ناکەم و ئەیبەخشم ئەویش بە سوێندەکەیّ باوەڕ ئەکات و خۆی تەسلیمی ئەکات.

ئەم لە خوا بێخەبەرە و پشیلە (حەسەن ئەلیخان) سەری هەمزە ئاغا لە لەشی جیا ئەکاتەوە و بۆ دیاری و خۆشیرین کردن هەناردی بوو تاران کە لەم دوایەدا بە سوپر زوڵ ناوی دەرکردبو. ئەمەیە ئاوێنەیّ باڵانمای بڕێک لە ئەرتەشیەکانی کورد و یان ئەگێرنەوە کە نەمر پێشوای کورد، دانەی دەرجەداری سنەیّ خەڵکی گەڕەکی قەتارچیان ئەچێت دەسماڵ لە بان چاوی پێشەوای نەمر ئەبەستێ ئەویش ئەفەرموی کە تۆ سنەیی نیت؟ لێرەدا کوردی سنەی واگیان و ماڵیان لە ڕێگای کورد باخت کردەوە پێکەوە حەشر و نەشر ناکرێن.

پێویستە کە ئەوە لە بیرمان نەچێ کە هەمزە ئاغای مەنگوڕ کەڵە پیاوی کورد بووە کە شان بە شانی شۆڕشەکەی شێخ ئوبێدوڵلا خەبات ئەکات و پاش تێک چوونی شۆڕشەکەی کوردستان ئەو خوێن گەرمە جەنگی پارتیزانی ئەکات و ترس و لەرزی زۆر

ئەخاتە گیانی لەشکری ئێرانیەوە. بوێە حەسەن ئەلی‌خانی موتەسەریفی سنەیی بۆ هەتا هەتایە ناوی بەسەر شۆڕی خۆفروشی دەرئەکات و ئێستاش لە سەر وێردی زوانی کوردەکان هەیە ئەگەرکەسێ زۆر خاێن مل شۆر و پیس بێت پێ ئەلێن: ئەڵی نانی حەسەن ئەلی‌خانی موتەسەریفـی خواردوە.

گەلی کورد بە مافی رەوای خۆێ ئەزانێ بویەناچیتەژێر رکیفی تورک وئەرەب، نەبە کۆێخایی کردن حکومەتەداگیرکەرەکان، هەر وەک شێخ مەحموودی نەمر فەرموی ئەگر منیش بمرم کورد حەقی خۆی و تۆڵەێ خۆی ئەستێنی چۆن مافی خویەتی بەڵام ئەمدا بەش کردنە بە حکومەتەدراوسیەکان تا رادێەک زۆر و زوڵم و ستەم جوربەجوری بە سەری کوردا داسپاندووە کە لە تورکیا گەیشتووە بە ڕادیەک کە خۆیندن و نووسین و قەدەغەێ جەل و بەرگ و داب و نەریتی کوردی ئەمانە هەمووێ هوێ زاڵم بوونی ئەم حکومەتەداگیرکەرانەیە. لە کاتێکدا نە سەرزەوینی کورد و نە کورد خوەێ تورک نەژادن ئەمەکارەساتێ بە زۆرداسپێنراوە و هەستی کوردێ نەتەوایەتی کە لە دڵی کورد دایە جم و جوڵی نیشتمان پەروەری ئەخاتە مێشکەوە و ئێستاش تورکیا بەو هەمووێ و پیلان و فن‌فێڵەوە نەیتوانیوە ئاگری ئەم شۆڕشانە دامرکێنی و لە شوێن دابەش کردنی خاوەر میانە (روژهەڵاتی ناوەڕاست) بە شێوەێ رەسمی کوردستان بە چوار یا پێنج حکومەت و وڵاتدا دابەش کرا و لەو سەردەمەوە دەس پێ ئەکات و بوو ئەوەلێن جار بەدرخانی گەورە هەوڵ‌وتە قەلای‌دا. بو سەربەخوێ کوردستانی گەورە.

حکومەتەداگیرکەرەکان لە کاتێ تەنگانەدا زۆر لە خۆیانەوە نەرمی و قەوڵ و رووی

خوشیان به کورد ئه‌دات و به جورێ که نوێنه‌رانی کورد بۆیان جیگه‌ێ دڵخوشی و موتمانه بۆتا پایه‌ێ حکومه‌ته که‌یان توند ئه‌کرده‌وه پاش له ژێر قه‌وڵ بڕیاری خۆیان ده‌رئه‌چۆن و به بیانو درو و هێرشیان ئه‌کرده‌وه سه‌ر کوردستان. دیسان سه‌ر له‌نوێ شه‌ڕ ده‌سی پێ ئه‌کرد.

یه‌کی له‌و کاره‌ساته وا گه‌لی کورد توۆشی بوو له ده‌ورانی حکومه‌تی تازه‌ێ ژنراڵ ئه‌بدولکه‌ریم قاسم بوو که له پاشان تووشی شه‌ڕو کیشه‌ێ گه‌وره له نێوان به‌ئسێ و کورد روی داوه کاتی‌وا نه‌مر بارزانی له رووسیه‌وه هاته‌وه،(قاسم) به رووێ خۆشه‌وه ناوچه‌ێ به‌ر بڵاوی له ئیختیاری بارزانی نه‌مر دانا و پاش ئوتومبیلی شه‌خسی و بڕێک پاره بو یارمه‌تی خه‌رج و به‌رج پێ‌دا و سه‌روک بارزانی به دلێ خۆشه‌وه که ئیتر ئاشتی که‌وتۆته کوردستان و کوردی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئیراق به مافی خۆی گه‌یشتووه پاشان بیری له کورده‌کان تورکیا کرده‌وه که ئه‌وانیش بۆ مافی خۆیان وه‌ک کورده‌کان ئیراق‌دا کوشی ئه‌که‌ن به داخه‌وه ماوه‌ێ ئه‌و دڵ خوشیه ته‌نیا ساڵێ درێژه‌ێ بوو.

لێره‌دا باش وایه که له کوردی به ناو زۆشبیره‌کان گله‌یی بکه‌ین که ئه‌گه‌ر ره‌خنه له سه‌روکه شورشگێڕه‌کان کورد ئه‌که‌ن بۆچی خۆیان ته‌نیا بو رۆژێ خۆشی پێان وایه که هه‌تا هه‌تایه سه‌ختی ته‌واو بووه و ئیتر هه‌موو شتێ به ته‌واو بوو ده‌زانن.

درک کنیان ـ کوردستان و کورد ـ ته‌رجومه‌ێ جواد هاتفی ل ٦٦ ـ ٦٥ نوسیویه ره‌وڵی ئه‌و ئاشتیه که‌ره‌نگه بوو کورد به قازانجی کورد ته‌واو ببوایایه به داخه‌وه هه‌ر ئه‌و چینه رۆشن بیره کوردانه هه‌م له ده‌ستی سه‌رۆک نه‌مر بارزانی سه‌ندیان و خۆیانش نه‌یاتوانی

بۆ ئەو کارەیّ وا کردیان کە لە تیّدا دامان.

نووسەری کتێبی کوردستان و کورد درک‌کنیان لە لاپەڕەیّ ۶۹ دەلیّ من لەگەڵ یەکیّ لە کمونیستەکان کە بە سەر لەخواریکەوە دیم ئاوای دەگوت: دڵم ئەیەویّ کە ئەوانەیّ وا خۆیان بە ڕیّەر ئەزانن ئێستا گیرم بهاتبایە تا لە پاشی ئەو خەیانەتە واکردوویانە بە نەوت بمژندا و بە زیندووی ئاگرم لە بەر بدایە تا بە سزای ئەو کارە ساتەیّ خۆی بگات. (مەبەست لە کوردی بەناو روشنبیر بووە)[1]

پاش تیّک‌چوونیّ ئاشتی لە نیّوان سەروک بارزانی و قاسم. دیسان ئاگری شەڕ داگیرسا. لەم بارەوە دیسان درک‌کنیان لە لاپەڕەیّ ۸۰ دەڵیّ کوردەکان لە خۆیانەوە جەنگی پارتیزانی باشیان نواند و زاڵ بۆون بە سەر سەربازە ئەرەبەکان و توانیان چەک و تفاق زۆر بگرن و پیاوە کوردەکان وا لە ناو نیزامی حوکومەتی بۆون هەر شەڕ کەوتە نیّوان کورد و ئەرەب خۆیان کیّشاوە لە حکومەت هاتنە ریّزی برا کوردەکانیان و لەم بارەوە حکومەت تووشی نگرانی و ناهومیدی لە کورد بوو و سەربازە ئەرەبەکان نەیانتوانی لە کەژ و کێوەکانی کوردستان شەڕ بکەن بە شپرزەیّ پاشەکشەیان کردووە و پاش ئەوسەر کەوتنە قاسم لە وت و ویّژی رۆژنامەیّ ناتوانی لەشکەرەکەی وشکستی خۆیّ لە ناچاری بەحیسابیّ ئینگلیز و ئامریکایّ دائەنیّت و کوردەکان بە هەڵخراوی ئەو دوو حکومەتەدائەنیّ کە چی خۆیشی دەزانی دروویە. بەڵام لە دڵتەنگی خۆی داخی دڵی وادەر کردووە لە زۆربەیّ شەڕەکان نیّوان ئەرەب و کورد لەو سەردەمە چارە و ئاقیبەت

---

۱- درکنیان کردستان کورد وەرگیّر جواد هاتفی.

ئەرەبەکان هەر بەرەو پەژارە ئەچون لەم کاتەدا کوردەکان لە بەر ئەوە ڕێزیان لە حوکومەتدا نیابێت نوێنەریان بەرەو بەغدا هەنارد بەڵام حکومەت بە بێ شەرمی نوێنەرانی لە پادگان «ئەل ڕەشید» خستە بەندیخانە لێرە ئەو شێعرەی ماموستا قانع نەمرمان دیتەوە بیر کە دەفەرموێ:

دڵپاکی لە گەڵ ئەقرەبی چزدار هەتا کەی

هەڵ گرتن و ماچ کردنی ڕەشمار هەتا کەی

* * *

پاشان دەستوری بومباران ناوچەکان کوردستان لە لایەن حکومەت سادر ئەکرێت وە لەشکری زەوینی بەرەوکوردستان هێرش ئەکەن بە هەڵوویست کوردەکان ڕو بەرو ئەبن و توشی زەرەر و زیان ئەبن و پێشمەرگەکان ئەیاندەنە بەر ئاگر وگوللە کاتێ کە حکومەت ئەم هەواڵەیٚ پێ ئەگات و بوی روون ئەبێتەوە کەکوردەکان ئەتوانن لە خۆیان هەڵوویست نیشان بدەن ئەکەوێتە پیلان کردن. لێرەدا دیسان گەلی کورد لە بەر پیلان دەرنایێت.حکومەتناچار لە هەرکاری نامرۆڤانە دەست نا ترسینێ چۆن قاسم خۆی بە ئەرەبەکان وفادار لە قەڵەمدا بوو. ئەو حکومەتە وەحشیە لە کاتێکدا ئاواییە کورد نشینەکان ژن و منداڵی دەر ئەکردو هەمووێ ئەوانی ئەخستە بەر لەشکەرەکەوە تا ئیتر ئەوان دەست بترسێنن لێرەدا پێشمەرگە دەست و دڵی شل ئەبوو ئەوانیش تاوانیان نەبووە چۆن ژن و منداڵی کورد کوشتن لە بەێنا بوو ئەو حکومەتەدیسان هەر ئەو ژن و منداڵەیٚ ئەداتە بەرگوللە و لە ژێرتانک و تووپ دانەیان دەرنەچون. هەر خوایٚ ئەوکوردە هەژارانە

بۆکە قاسم لە ناو خوێن خۆیا تلیاتەوە.

راسپورت: دەبێرکول نەتەوە یەک گرتووەکان، لەو کردەوە وەحشیە و دڕندانەیە نارەزایەتی دەکات و ئاندرێ گروومیکو وەزیری دەرەوێ شەورەوی لەو کردەوەی ناجوامیرانە و نامرۆڤانەی لە ئێراق تورە دەبێ، پاش ئەو هەموو کردەوە نامرۆڤانە جێگەێ سەرسوڕمان لەوێەکە فەرماندەێ هێزی نیروی هەوایی ئێراق لە کەماڵی بێشەرمی و بێحەیایی لە وت و وێژی رۆژنامەیی‌دا دەڵێ: ئێمە بە یارمەتی وڕێنمای خەڵکی ناوچەێ باکورێ ئێراق[1] توانیمان جەردەکان و دزەکان لەو ناوچەدا کوتایی بە ئومری ئەوکەسانە بێنین.

ئەم حکومەتە داگیرکەرەانە پاش ئەو هەموو کورد کوشتن و ماڵ وێرانە کردنە لە ڕادیو و رۆژ نامەکانیان بە بێئاریەکەوە دەڵێن کوردستان لە ئەو جاسووسانەی ئیمپریالیست پاک بووەتەوە و ئێستا حکومەت خەریکی ئاوادان کردنەوەێە و خەریک پروژەێ کارخانە درووست کردنە. ئەمەێە چارەڕەشی کورد. ئەمەتە دەڵێن کە بە مەترەڵوز ئەمانکوژن و بە سێو ژیرمان دەکەنەوە بەڵام کوێر خوێندویانە ئەم کوردستانە دیر یا زو لە ئەرەب و تورک پاک ئەبێتەوە و ئەبێتە گورستانی داگیرکەران.[2] زۆرکەسی دز و چەقوکێش کە لە شارەکانی غەێر لە کوردستان هاتون بەناوی خزمەت کردن و پارێزگاری لە کوردستان بە پیاوە ماقوڵ و ئیدارە بووە و کوردەکان وادوو ئەوەندەێ ئەوان زانایی و

---

١- درککنیا. کورد و کوردستان.

٢- کوردستان دابەش بە ئێراق.

ئازایی شارەزایی یان بووە ئەبوایە کە ئەو چەقۆ کێشە کە پیاوی حکومەت بو ئیزنی بداتێ بۆ کارگەری رۆژانەی ئەو بە نوێنەر حکومەت بەئسیە.

دەیجا چۆن گەلی کورد کوشتنی بە خەلات نەزانی کە لە زێدو نیشتمانی خۆی بە شاریی دەرەجە ٢ حیساب بکرێ وەک فلستین دووهەمی پێ هاتبو. زۆر لە رێگای رزگاری ئەم کوردستانە خوێن رێژراوە و فرمێسک دایکە جگەر سووتاوەکان ئاهی باوکە رێش سپیەکان بێ تولە نامێنێ درووستە لەم بەسەرهاتە کوردیش هەریەک بە جوری ئاویان بە ئاسیاوی دوژمن کردەوە و ئەگەر چی رەنگە لە رێگەی نەزانیش بێت جگە لە خائینەکان و جاسووسەکان کە سزایان تەنیا کوشتن ئەبێت[1] لە چواردەی مانگی ژوئیە حەسەن ئەلبەکر لە بێحەیایی و بێئاری دەلێ: تا دە ملوێن لیرەی ئەسترلینگ بۆ نۆسازی ئەو شوێنانە واکاولیان کردەوە کە لە لایەن بارزانیەکانەوە وای بە سەر هاتوە ئیمە بوجەی دیاری کراومان بوێ تەرخان داوە.[2] بەلام هەر ئەو داخە بۆ ئەو حوکومەتانە وا بەم چەشنە ئەیانەوەی کورد دلخوش بکەن یا بیخەلەتێنن ئەوە یان لێ روون بووەتەوە کە ئەگەر کوردستان بیکەن بە گولستانەوە گەلی کورد هیچ دلی پێ خوش ناکات هەر بە بیگانە و داگیرکەریان دەزانن و هەر هەلیکیان بوو هەلکەوێ لە داگیرکەر تێ هەل ئەدەن چۆن داگیرکەر دەستی ناپاکیان بە خوێن کوردەکان ئیراق سوور بووە گەلی کورد هیچ کاتێ بوردمان کیمیاوی و توفەنگ بە سینەی ئافرەتان لە بیریان ناچێتەوە گەلی کورد دێر یا زو

---

١- کردستان و کُرد ـ درک‌کنیان

٢- درک‌کنیان

ئەو لوقەمانە وا بە خوێن کورد بێگانە قورتی داوە لە حەڵقی داگیرکەرەان دەری دێنین بە سزای ئەوکردەوە نامرۆڤانە خۆیان ئەگەن ئەمە مێژوو روونی کردەووتەوەکە هیچ گەلێک بۆ دایم ژێردەستە نەبووە و سروشت حەق ئەستێنی جا وایان بە سەر کوردا هاوردبێ لە دوژمن چاوەنواڕی چاکە خۆخەڵەتاندنە ئێراقی جاهیل و نەزان کوردەکانی بەهاوە دەستی ئیسرائیل لە رۆژنامەکان بە خەڵک بناسێنێ بەڵام گەلی کورد لە درێژای مێژوودا نیشانیداوە کە لە تەنگانەشدا یارمەتی لە زالم نەخواستووە، ئێستا هەر حکومەتی یان میللەتی بێت تا چ بگات بە ئیسرائیل و...

ئێراقی بێڕەحم لە هیچ فەن و فێڵێ بوکورد دریغی نەکردوە یەکی لە و پیلانەی وا دایم بوێ خەو ئەبێنن شەق کردنی باکوور و باشووری کوردستان بوو بەڵام هێزی کورد زو لەو پیلانە تێگەیشت و ئاش بەتاڵی کردووە بەهەڵوویست و دەرخستن پیلانەکانی بەئسی تەنیا سەرشورێ زیاتر هیچی تری پێ نەگەیشت بەڵام ئەمە بوو گەلی کورد شکست نیە ئەگەر دوژمن توانیبێت کە لە بابەتی سەرکەوتن و داگیر کردن کوردستان بە هێزو لەشکری خویەوە بە لایەنگری دەیان حکومەت حەقکوژ و هەروەها دەرکەوتن حکومەتی لە گەڵ بزوتنەوەێ گەلی کورد چۆن پارچە پارچە بوونی یەکیەتی لەو کەندو کوسپەێو باڵ شکاندنی کورد لەت لەت بوونی کوردستان لە ئێران کە پیلانی ئینگلیز پیری کەفتار رۆژی وایان لەبیر بووە کە لە ناشایستەی شاکانی ئێرانی بووە کە لە ئێران ئازیزدا جیایان کردەوە هەر وەک منداڵی وا لە دایک ببرێتەوە و جیاکردنی کوردستان لە ئیران وایە. ژن و منداڵ کەوتە ژێر تانک و هەروەها لە بەر تانک و لەشکەر دوژمن بەمجورە ویستی تا

کوردە چەکدارەکان بە دەستینیان و بە زۆر هێناویانە ناو لەشکری داگیرکەر ئەویش لەبەرەوە تا بە تیرهاویشتن پیشمەرگە ئەو ژن و منداڵانە بکوژرێ هوێ دەر کردن کورد ئەمانەن ئەگینا گەلی کورد بە شێوەێ لە شەڕو جەنگدا شارەزایە کە ئەگەر دە ساڵی پەیاپەێ شەڕبکرێ بە هەمووێ وکەل و پەلی نیزامی دوژمن تواناێ بەربەرەکانی لەگەڵ کورد دا نەبووە و نیەتی.

جا هوێ ئەسڵی دەس نەپاراستن دوژمن لە ماڵ و منداڵ ئەو پێشمەرگەیانە و یارمەتی ماڵی حکومەت حەقکوژەکان ئەویش هەر بەو حکومەتە وابوو کوژاندنەوەێشورش کورد یارمەتیان داوە بریار توزێ ئەم لاێنگرە وا مافی گەلانی حەقخوراو فەراموش ئەکەن بە لاێ خۆیانەوە بە ناو ئازادی خواز پێشکەتون و جاریکیش بو کورد ویژدانیان ئەزابی ئەوانی بدات کە بە خوێن رژتن مەزلومەکانی جیهانی سیهەم بە ناو تەمەدونیان پەیدا کردووە کە ئەم تەمەدونە وای کردووە کە بوو سەگ و پشیلە چ ریز و حورمەتی دائەنن و سڵاوی لێ ئەکەن و لەگەلیا نان ئەخون کە ئەمە پێ دەلێن موتەمەدن و فەرهەنگ چەرخی بیستم!؟.

ئاخر لیرەدا پرسیارێ دێتە پێش کە چۆن لە ئوروپا پەیغمبەرێ هەڵ نەکەوتووە چۆن هەر ئەم قارەی خاوەری ناوەڕاستە پەیغومبەرە مورسەلەکان پەیدا بوون. لیرەدا ئەم قارەێ ئوروپا ماوەی ٦٠٠ ساڵە کەشف بوە و میللەتی وەحشی بوون. ئەگەر چی پێشە و فەن دەزانن و بە جیهانی ئاسایش زیاتر بە فەن شەڕ کردن خزمەتیان کردەووە بەس بۆ چێ نەیان توانیوە بەو هەمووێ فەن و پیشەوە ئاشتی و بەرابەری بخەنە نێوان میللەتان و

لانی کەم ناوبردن ترسی مرۆڤ لە مرۆڤ، کە وایە ئەمانە تەنیا ماددی بیر دەکەنەوە بوێە دایکێ یان باوکێ کە لە ئورووپا ئەولاد گەورە ئەکات پێ دەڵێن بی‌زەحمەتساڵمەندان یان پێمان خۆشی نیە کە پەزیرایی‌تان لێی بکەین ئەمە تەمەدون و فەرهەنگی ئەو حوکومەتانەیە، وا تا ئێستا کورد بە تەمایٚ ئەو میللەتە و حکومەتە بێت کە مافی ڕەوای کورد بە شێوە و رەسمی بناسێنن.

ئەمن تەنیا بەر پێ خۆم نابینم لێرەدا من بیری کتێبەکانی نەمر موحەمەد قوتب ئەکەوم بە داخەوە نابێ لێرە باسی ئەوە دەردانە بکەین چۆن لەم کتێبە مەبەست لە سەر کورد و کوردستانە کە لە لەق و پوێ تا ئەم جێگا ئێزن ئەدات بەڵام من لە سەر ئەو باوەڕم کە خەڵکی جگە لە ئێران کورد ئەبێ بە هیچ حکومەتی پشت نەبەستی و هیچ قەومی یان حکومەتی حەق کورد نادا نێو دەستی کورد. گەلی کورد بوچێ تا بە ئەم رۆژ کارەساتێ وا بە سەریا هاتووە. تەنیا هیتلر بە یەهودی کرد. ئەگەر رژیمی خوێن‌رژ بەغداکورەیٚ مرۆڤ کوشتنی نەبوو خو بومبی کیماوی درووست کرد مەگەر مەوادی ئەو بومبە لە ئورووپا بەرەو ئێراق نەهاتووە بە سەر کوردی بێ‌کەس دای‌رژاند. کاری‌وا ئەم حوکومەتە لەگەڵ کوردا ئەیکات بیرەوەریەکانی هیتلرە بەڵام هێتلر یەک دانە بوو یەک حکومەت بوو سەر نیوەیٚ جیهان بەڵام گەلی کوردی بێ کەس و بێ دڵسوز هەر حوکومەتێ کە بە سەر کوردا حاکمە هێتلری ونازی بو کورد بوە حکومەتی ئینگلیز کەل و پەلی نیزامی بە ئێراق ئەفروشت و ئەمریکا و ڕووسیش لە یەکتر سیبقەتیان ئەگرد بوو فروشتنی چەکەمەنی نیزامی هەر لەوکاتە وا ئێراق لەگەڵ کورد شەڕی ئەکرد ئەگەر ئەوان لەبیری کوردبوون‌یان

دەیان زانی کە ئێراق بوو گەلی کورد ئەویش یەک بەشی کورد کە دو بەشی تری لە ولاتانی تر بەو جورە بە زمانی خۆیان قسە کردن قەدەغە بۆون[١] جا گەلی کورد بە سوێند خۆاردن بوو بێ تاوانی ئەم روو رەشانە باوەڕ کات، یان بە تانک چیفتن و کڵاش و تووپ و مەتەرلۆزی، درووست کراوی ئەو حوکومەتانە هەر ئەو کەسانە وا بو باوک و دایکیان کەمترین بایەخێ دا نانن ئەگەر ئێراق یان هەرکام لەم حکومەتەنیا بە چاولیکدانی لەو حکومەتە خاوەن نفوزەکان بە هەرە شەی ئەوانە وا بێ پەروا دەتوانن بە هەر کردەوەێ نامرۆڤانە دەست بە هێرش و پەلاماری زەوینی ئەشکنجە و ... هەر چەند گەلی کورد بەو هەمووێ و کارساتەوە هێشتا هەر چەرخی لە چەمەر بڕیوە و ساتێ شمشێری نەکردووەتە کێلان و هەر روو رەشی بۆ خاینە چاوتیژەکان ماوەتەوە

مەبەست منێ لە کوردی بێ کەسی ئەوە نیە کە کورد هەژار و مەزلومە کەوتووتە بەش خواکردن بەو هەموو کارە ساتەوە هەر داگیرکەرەکان خۆیان لەتێدا ماون لە دەست کوردەوە چێ بکەن بوونەتە چێوێ دوو سەر سوتاوو و شکاو و خەوێ ڕاحەت لە چاویان ناسڕەوێ. کورد هیچ میللەتی یان حکومەتی لە کوردەوە لانیگرێ نەکردووە تەنیا بوو هەڕەشە کردن و بارمتە سەندن لە حکومەتەداگیرکەرەکان جار و بار ناوێ کوردیان بردووە ئەویش لە ئاخرەوە بە موئامڵەی بەینی خۆیان ئەو لاینگرییە پوچەڵ بوەتەوە. و هەر ئەو لاینگرییە بە زەرەری کوردیش تەواو بووە وەک شۆڕشی مەهاباد و شێخ مەحمود نەمر و ... و گەلی کورد زۆر لە کەس دارەکان پشت پەنای زۆرترە گەلی کورد ئەوەێ وا

---

١- سوریە ـ تورکیا.

خۆای گەورە فەرمویە گەلی کورد بە ئەمری کردووە و بەراوردیش بووە کە لێرەدا سوڵتان سەلاحەدین نە قەوم پەرەست بو نە نیشتمان پەرەست بە ناو وەک ئێستای حکومەتەکان کە دایم خۆیان لە گەڵ دراوسیەکانیش تۆشی کێشەی مەرزین و ...

بەڵام سەلاحەدین ئەگەر بیوستایە وەک ئێستای ئەرەبەکان بکردایە ئێستا لەکوردستان ئیتیحاد جەماهیر کوردەواری درووست کرابووە نەک ئیتیحاد جەماهیر شەورەوی و کەریم‌خان‌زەند کە هیچ جیاوازی بو کورد و ئەرەب، فارس و تورک دانەنا چۆن حاکمی ئێران بۆ جیاوازی نەتەوەی نەخستە پێشەوە.

ئەرەبەکان هەموو ساڵی تووشی کێشەی سنورن بۆ نمونە: یەمەن لە گەڵ ئەرەبستان و قەتەر و ... لە سەر خاک تووشی شەڕ و کێشەن بە ناو ئیسلامیشن. هەروەها کە باسم کرد کورد لەکاتێ دەسەلاتداری ئەزمونی خۆی داوەتەوە بۆ هیچ قەومێ یا میللەتی زەرەری نەبووە و بە چاوِ ڕیزوو حورمەتەوە لە گەڵ دەرهاوسیەکان ژیاوە. بەڵام ئەمانە تورک و ئەرەب و ... هەموویان لە گەڵ کوردا دروویان کردووە و درووده‌کەن. تەواوی مەئادن و ژیرزەوینەکان کوردستان تاڵان ئەکەن و نیوەیکیشی بە خەرجی ئەو ناوچە ناکەن خەڵکی کوردستان کە خۆی لە نەوت و هەروەها پرپیزترین مەوادی خوراکی تێدایە بەڵام کورد بوو بە دەس هێنانی نان پەرپوە شارەکان و کارخانەکان وا بەکانگاکانی ژێرزەوینی خاکی کورد ئەچەرخێ و دەرئامەدی ئەو کارخانە کە بە گیرفانی داگیرکەرەکان ئەچێت یان بە پارەکەی گوللە و بومب بوو گیانی کورد ئەکرن و کوردەکان لە جیاتی حەسانەوە لەو کانگاه قوربانی ئەو نیعمەتە ئەبن[1]. پیلانی‌تر کە حکومەتەکان وا لە سەرسفرەێ

---

۱- مەبەست لەکرِین کەل و پەل جەنگی بو گیانی کوردە.

کوردستانەوە ماقوڵ بۆون ئەیانەوی ناوی کوردستان بە تەواوی بفەوتینن بە کوردوستانی ئێراق دەڵێن (شومالی ئێراق» بە کوردستانی تورکیا دەڵێن ئاناتولی شەرقی بە کوردستانی ئێران دەڵێن غەرب ئێران[1] ئەم پیلانە تەنیا خۆیان پێ شەرمەندە بۆون چۆن گەلی کورد لە بەربەبانی مێژووە ئەو سەرزەوینە هەر بە ناوێ نەتەوە پێشویەکانی کوردەوە ناسراوە وە سەرزەوێنی کاسیەکان ـ گوتیەکان ـ مادەکان ـ مانایەکان ـ لولوبیەکان ـ کوردوخیەکان ـ و کوردستان شتێ کە بە درێژای مێژوو لە لاپەڕەکانی مێژوودا لاک و مور بووە جا چۆن ئەم لە خوو بێخەبەرانە پێان وایە بەم کارە سادتە دەتوانن بە شومی شەڕێ خۆیان بگەێن بەڵام هەروەها کە ماموستا قانع نەمر دەفەرموێ کە:

دەس بە دەس یەکتر گرن بۆ یەکتری وەک پشتیوان
تێ بکوشین بۆ ژیانی کورد و خاکی کوردستان
لاپەڕەی مێژوو ئەزانێ چۆن بوون شێرانی کورد
باسی بابا ئەردەڵان و زەندی و بابانی کورد
ئەرووپا نووسیویە بۆ تۆ، یەک بە یەک وەک داستان
تۆش بە چاکی ڕایگەیەنە، بۆ نەخوێندەی کوردەکان
قەف قەفی حەڵقەی کەلەبچەت هەڵبڕە وەک پاڵەوان
خوت و منداڵت بە کوشتدە بۆڕەواجی کوردستان

* * *

١ - تەنیا لە ئێران بە ناوچە کوردنشینەکان دەڵێن کوردستان و ناوی کوردستان ئازادە.

لە ناو گەلی کورد چەند وەک قانع هەڵ کەوتوە لە ناو ئەم خاکە پاکە پەروەردە بووە و چەندی تریان لەناو بردووە کە بێ شەک ئەم نا مرۆڤانە رۆژێک ئەبێ خۆیان بە پابووسی کورد بێن و لە داهاتوودا بۆ باب و باپیرانی خۆیان لەئنەت بنێرن کە چۆن بەم کردەوەانە لە گەڵ کورددا شەرمسار نەبوون.

لە لاپەڕەی ١٥٠ی کورد وکوردستانی درککنیان هاتووە: کە کوردەکان لە کاتێ شەڕدا نەیانویسیووە (سەدەکان)[1] برووخێنن چۆن بە سەرمایەی میللی خۆیان دەیانزانی لێرەدا چاوێ ئەم کەسانە ماچ بکرێ چۆن بەڕاستی باشترین شێوە و قسەیێ بووە کە وتراوە.

ئەگەر کورد لە کاتێ ئاوەدان بوونی کوردستان هەر لە ئەوانەوە دەستی پێ دەکا، بەڵام بەداخەوە چینی داهاتوو ئەوانەیان لە بیر چووە و سیمی بەرق شارەکانیان فرۆشت لە کوردستانی ئێران چەک هاوردن لە پادگانەکان، لە کاتێ روخانی رژیمی شای بێ کفن ئێران کوردەکان لە سنە چەکەکانی پادگانیان هاوردە ناو شارە بە کرین و فرۆشتنیان پێ ئەکرد کوردیان پێ ئەکوشت گەیشتینە سەروەت و سامان، برِیکیان بوون بە چەتە و ریگر تا کاتێ هێز گردنی حکومەت کە دزەکان دەس‌گیر کران. جا ئەمە زۆر سەیرە مەگەر ئەو دز وکاسب و چەکدارە و... هەر کورد نەبۆون مەگەر جەنگ و شەڕ لە کوردستان بەرپا نەبوو لەو کاتە وا شەڕ گەرم بوو برِێک زوڵە کورد سەرسەری بە نان فرۆشتن دانەی دە بەرابەر بای خۆی تا خواردەمەنی سەروەت و سامانی زۆریان دەست کەوت و ئێستا بە دولار

---

١- بەندگای ئاو.

کڕین و فروش ئەکەن چۆن بە قەوڵی خۆیان پارەی ئێران لە پریستژیان[1] کزدەکاتەوە یان ژنەکانیان هەر ساڵی ئەبێت تەواوی وسایلی ماڵیان بگورن چۆن بە قەوڵی ئەوان «مۆدی نەماگە» ئەمانەن وا پێان خوەش نیە لە کوردستان هێمنایەتی بێت. ئەمریکا هێرش بکاتە سەر ئێران لە کەماڵی بێ خەیاڵیدا ئەڵێن دەی بو چی یاکەسێ لە ڕیگای حەق خوازی ئاو و خاکیدا بکوژرێت دەڵین (ئەێ کوژیاگە نەیکرد باو بۆ خۆی فێر کاسبی چتێ بێت بەدبەخت ئاخر تۆ ئەتانی لە تەک ئامریکا چ بکەیی باوە خوشێ تێ لاییوە ناوی نەوەیی وە جواب ئەداتەوە بازار چۆنە)[2].

رووسیا و ئینگلیز کاتێ کە لە ساڵی ١٩١٤دا کوردەکانیان بە سەر تورکیا و ئێراندا بەش کرد و هیڵی جیای و سنووریان خستە ناو کوردەکان لەو کاتە چۆن دابەشی کردنەکەی کوردستان قازانجی رووسی تێدا نەبوو دیسان رووسیە لە گەڵ ڕێبەرەکانی کورد کەوتنە وتو وێژ و بزوتنەوەێ رزگاری کوردستان کەوتەڕێ بە داخەوە چۆن رووسیا و ئینگلیز بە بەرنامەیەکی ڕێک کەوتن ئەو شۆڕشە زۆر درێژەی نەخایاند و دیسان بزوتنەوەکە دامرکا ئەو شۆڕشە حەق خوازیە بەرێبەرایەتی سەلیمپاشا و بالولپاشا و بایەزید و ئەمینی پاشای موش، ئەمانە تورکیا لێ ترسا کە رووس هانی ئەمانەێ داوە. برێک جار رزگاری کورد بە دەست دەرەبەگەکانەوە بووە جار وا بووە هەمووێ دەرەبەگەکان دەستیان بە یەک کردەووە و بە ناوحەق خوازی کوردەوە تەواو بوو بە

---

١- شەخسیەت (کەسایەتی).

٢- ئەم بابەتە بە شێوەی سنەی نوسراوە مەبەست لە کوردی سەرسەرییە نەک کوردی سنە.

پێچەوانە وا نەبوو. دەرەبەگەکان واتە سەرۆکەکانی بزوتنەوەی کورد کە پەنایان ئەبردە بەر ئەوە دەوڵەتانە لە بەر ئەوە بۆ ناچار بۆون ئەوانیان بەو نموونەی کە جیهانیش بەدەست ئەو دەوڵەتانەوە بوو بەڵام هیچ یەکێک لەو بزوتنەوە نەک سودی بو کورد نەبوە بەڵکو بێ وێژدانانە دەستی ئەخستە ناو دەستی ئەو دەوڵەتە و یارمەتی‌دان بوو لە ناوبردنی بزوتنەوەی رزگاریَ خوازی کورد. هەر لە ئەم رێگاوە بگرە تاوانی ئەو خوێن رشتن گەلی کوردیان لە ئەستۆ دایە. سیاسەت ئەم جۆرە خەیاڵەی بە فلسێک ناکرێت. جا چی تیدایە ئەگەر بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردیان چەند سەرۆکێکی کورد لە قوناغیکی تایەتیدا پەنای بردبێتە بەر ئەمەیان ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە. کوردستان لە سەدەی نوزدەهەمدا تەواوی کەوتە ژێر چەپۆکی دەوڵەتە هەرە گەورەکان و بە دەسەڵاتی ئاسیای رۆژ ئاواوە.

کورد ئەگەر دام و دەزگایەکی تایەتی بو خۆی دامەرزێنی، میپلەتێکە شانازی بە خۆیەوە ئەکات و ئازادی خوازو جەنگاوەرە نە سوڵتانەکانی دەوڵەتی ئوسمانی و پادشا زاڵمەکانی ئێران و نە بریتانیای پیری سیاسەت کە بۆیان نەکرا کورد بە تەواوی بخەنە ژێر سایە و رکیفی خۆیانەوە بەڵام هێزە کونەپەرستەکان نە جارێک و نە دوو جار کوردیان بوو نیاز و چاکەی خۆیان هەڵ ئەفریوان. ئەمەش سەرچاوەی دەردی سەرییەکە بۆ گەلی کورد و ئەو میللەتانەی کە لەو دەوڵەتانە ئەژیان. سەدها ساڵ کوردستان لە ژێر چنگی ئیمپراتوریەتی گەورەی دەرەبەگی دا بوو. لە بەر ئەوە نەیتوانی و پیی نەکرا مەرکەزێک رێک بخات جا با ئەو مەرکەزە گەورە بێت یان بچووک بۆ خۆی پێک بهێنێ. و شەڕو

هەرای ناو خۆیی خێڵەکان و ئەو شەڕانەی کاربەدەستانی کە بو سودی خۆیان دایان ئەگرسان و ئاگرەکەیان گەش ئەکرد و کاتێ کە کورد لە یەکتر دزێ، تاڵان و چەتەگریان ئەکرد، حکومەتەکان لە سەر دابەش کردنی کوردستان شەڕیان ئەکرد و پەنایان ئەبردە دەوڵەتە خاوەن نفوزەکان و کوردە چەتەکان بۆ گیرفان پڕکردنی خۆیان پەلاماریان ئەدا سەر چینە جوتیارەکان کە لە هیچ شتێ ئاگایان نەبوو هەر ئەو لە ناو خوو بە گیان یەک کەوتوی کوردە کاری کوشەندەی کردە سەر بزوتنەوە تازە پا گرتوی کوردەکان و تازە تێگەیشتبون کە کوردستان دابەش کراوە. هەر ئەو چینە جۆتیارە کوردە لە بەر چەتەگەری کوردەکان سەری خۆیان هەڵگرت و روویان کردە دەرەوە و هەرچێ ئەوانەی تری کورد هەژار و نەدار بۆون لە دوخێکی هەژارین و بێدەستوری دائەژیان لە بەردەر هێنانی نانی شەویان ناچار بە نانە لەم پەیرەوی دەرەبەگەکان دەرئەهاتن‌شان بە شانی ئەو نەهاتینە تەنیا کوردەکان لە بیری سیاسی و ڕوشنبیری یەوە رۆژ بە رۆژ لە کوردایەتی بێگانە ئەبۆون تەنیا لە بیری ئەوە بۆون کە چۆن گیانی خۆیان ژن و منداڵیان بپارێزن و هەر ئەم کارە ساتە وای کرد کە ناچار کوردەکان لە دابەش کردن و کوردستان بیر لە پارچەپارچە بوونی کوردستان کەنەوە کە وردە وردە بە شێوەێ بەردەدەر دێن هەر ئەم راچە لە کیانە ئاگری خستە دەروونیان وردە وردە هاتنە جم و جوڵی داخوازی کوردستان تا سنوورەکان بشێونەوە، بەلام بوو چۆن پیلانەکان لە ژێرەوە نەقشەێ خۆیان پیادە کردبوو بەلام کاری وای کرد کە کوردەکان بێنە خۆیان و دژێ ئەو دابەش کردنە هەڵویست نیشان بدەن و لە سەرەتای سەدەێ نوزدەهەم بۆوە گرێ کوێرە یەک بوو ئیمپریالیستەکان و تورکیا و ئێراق و

لەو رۆژانەدا شوێنکی ئاشکرای لە سەر کێشەی جیهانی بە خۆیەوە گرت ئەمڕۆش کێشەیٚ کورد زۆرکێشەیەکی تێژی چارە نەکراوە. و لە ئەنجامی شەڕی جیهانی یەکەمدا گەلێک گوڕانکاری دیموکراتی بە سەر کوردستاندا هات و بەڵام بەزەرەری کوردە کە وەک مایەیٚ نەتەوەیی مایەوە حەتا لە مافی خودموختاری‌یش بێ بەش بووە. بەڵام پاش ئەم هەموو چەرمەسەری و نالەبارییە ئەمڕۆ کوردستان دۆخی تارادەیەک بە لای باش‌دا داشکاوە. جا ئەمڕۆش هەتاکۆ لە مێشک پواوەکان و کونەپەرەستەکان هاتوونەتە سەر ئەوەیٚ چی بکەن کە کێشەکەیٚ کوردستان و چارەنووس کەیٚ بە بێ کورد خۆی قەت یەکەلا ناکرێتەوە ئەو شتانەی وا پەیوەندی بە کێشەی کوردە و لە مەیدانی سیاسەتی جیهانی‌دا هەبێت ئاوریکی تایبەتی تەواو لە بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردەکان دراوە تەوە ئەو دوژمنە ناحەزانەی کورد و کوردستان هەولیان داوە دژی گەلی کورد و میللەتەکانی‌تری رۆژهەلاتی ناوەندی بەکار بهێنرێت.

باله سەرەتای سەدەیٚ شانزدەهەمەوە کوردستان لە نێوان ئێران و ئوسمانی دابەش‌کرا بەڵام هیچ کاتێ و ساتێ ئەو سنوورە لە نێوان کوردەکان بە شێوەی رەسمی نەناسراوە و دایم لە جەنگ و شەڕ بۆون لە سەرەتای سەدەی شانزدەهەمەوە گوڕانیکی گەورە بە سەر مێژووی کوردا هات‌و لە ساڵی ١٥١٤ کاتێک کە سوڵتان سەلیمی یەکوم (یاوز) لە شەڕی چالدیراندا بە سەر هێزی شائیسمائیلی سەفەویدا سەر کەوت لە ئەنجامی ئەم شەڕەدا رۆژ ئاوای خوارو و ناوەڕاستی کوردستان کەوتنە ژێر دەستی ئیمپراتوریەتی ئوسمانی و تەنیا ناوچەکانی رۆژ هەڵاتی کوردستان بۆ ئێران مانەوە.

ئەم دابەش کردنەی کوردستان لە نێوان دوو دەوڵەتی مەرکەزی بە هێزو دەسەڵاتداردا[1] دوخی میللەتی کورد و کوردستان لەو دو سەدو پەنجا ساڵەی دواییەدا باش نەبووە چونکە ناوچەکان کەوتە بەر هێرش هێنان و داگیرکردن و کوشتن و وێران کردنی بە فەرمانی هولاکۆ تەیموری شەل و قەرەقوینلوو ئاق قویونلوەکان، کوردستان بووە مەیدانی شەڕکوشتاری بێ وەستان. گەلی کورد لەم شەڕو هەراوە بە یەک چوونانەدا لە برسیەتی و ماڵ کاولی بەو لاوە هێچی تریان بۆنەئەمایەوە دەوڵەتی ئوسمانی و ئێرانیش سوود و کەڵکێکی ئەو تویان دەست نەکەوت لە سەردەمی سەدەی نوزدەهەمدا گوڕانێکی تری بنەڕەتەی بە سەر دوخی سیاسی ناوچەی کوردستاندا هات ئەوە بۆ لە کۆتای سێ یەکی ئەو سەدەیەدا و لە ئەنجامی شەڕەکەی نێوان ڕووسیا و تورکیادا سنووری رووسیا تەواو لە سنووری کوردستان نزیک بۆوە و بەشێک لە کوردەکان بووە ژێر دەسی ئیمپراتوریەتی ڕووسیا.

شکاندنی سوپاکەی تورک لە قەفقاز و چەند شوێنکیدیکە بە گشتێ لەوە ئەچوو هەموو رۆژ هەلاتی ئەنادۆڵ بەدەست دەرەبەگە کوردەکانەوە بێت هاتوو چۆ کردن و هەواڵ هێنان و بردن لە نێوان بەغداو ئەستەمبووڵ دابچڕرا.

هەر پاش ئەمە سۆڵتان موحەمەد دوهەم بڕیاری داپێش هەمووێ شتێک حیساب لەگەڵ کوردەکان پاک بکاتەوە ئەوە بوو لە ساڵی ۱۸۳۴دا بیست هەزار سەربازی تورک بە سەرکردایەتی رەشیدپاشا بە ئاگرو ئاسن کوردستانیان تەنی. ئەمە دوهەم جار بوو بە دڵ

---

۱- کیشەێ کورد ـ نووسینی ـ لازاریف

ره‌قی‌یه‌کی وه‌ها له ڕاده به‌ ده‌ر وا له‌ کوردستان بکرێت. پاشان کورده‌کان لابران و هه‌تا مافی ئه‌وه‌شیان بۆ نه‌هێشته‌وه‌ نه‌ته‌وه‌کانیان شوێنیان بگرنه‌وه له‌ بزوتنه‌وه‌ی جیا بوونه‌وه‌ کورد لادران.

سوڵتان دوهه‌م به‌ سه‌رزاری وا ده‌رئه‌که‌وت کوردستان بۆ ماوه‌یێک هێمن بوو بێته‌وه‌ و کورده‌کان چاوه‌ڕوانی هه‌لی بۆون که‌ قه‌ره‌بوی ئه‌و کوشت و کوشتاره‌ بکه‌ونه‌وه‌ و تا به‌ ئوسمانی بسله‌مێنی. کار هه‌ر له‌وه‌دا نه‌بوو کورده‌کان سه‌ر بۆ ده‌وڵه‌تی ئوسمانی شوڕنه‌که‌ن و ده‌توانن به‌رامبه‌ری تورکه‌کان ڕاوستن و له‌و ڕاده‌یه‌دا له‌ ڕاپه‌ڕینه‌ ڕزگاری خوازه‌ هه‌ره‌ گه‌وره‌کانی کورد ده‌ستی پێ کرد ئه‌وه‌ش ڕاپه‌ڕینه‌که‌ی یه‌زدان شێری ئاموزای به‌درخان پاشا بوو که‌ له‌ کانوونی یه‌که‌می ساڵی ١٨٥٤دا داگیرسا. یه‌زدان شێری شکاندنی سوپای ئوسمانی له‌ قه‌فقازیشدا به‌ هه‌ل زانی و ڕاپه‌ڕینه‌که‌ی یه‌زدان شێر له‌ ماوه‌یه‌کی کورتدا ناوه‌رۆک و سروشتێکی جه‌ماوه‌رانه‌ی په‌یداکرد جگه‌ له‌ ئه‌شێره‌ته‌کانی خواره‌وه‌ی ڕۆژ هه‌ڵاتی له‌ ناو دۆل و باکوری ئێراق یه‌زیده‌کانی سنجاریش هاتنه‌ ڕیزی یه‌وه‌ ئه‌وه‌ی مایه‌ی سه‌رنج ڕاکێشانه‌ ئه‌وه‌یه‌ ئاسوریه‌کان و هێندێک له‌ ئه‌ره‌به‌کانیش پشتگریان کرد. یه‌زدان شێر په‌نای برده‌ به‌ر رووسیاو داوای یارمه‌تی لێ کرد. به‌رامبه‌ر به‌و یارمه‌تی‌دانه‌ به‌ڵین بوو دژی ئوسمانی بوه‌ێستێ به‌ڵام له‌ لایه‌ن رووسه‌وه‌ پشت گوێ خرا هوێ بناغه‌ی سه‌ر نه‌که‌وتنی شۆڕشه‌کانی کورد بوو ڕزگاری کوردستان له‌و ماوانه‌دا ئه‌وه‌ بوو ڕاپه‌ڕینه‌کان له‌ سه‌ر بناغه‌یه‌کی سیاسی و کومه‌ڵایه‌تی و ئابووری دانه‌مه‌رزابۆون. ئه‌م هۆیه‌ی مه‌رجێکی گه‌وره‌ی سه‌رکه‌وتنی هه‌موو کاره‌ سه‌ره‌کیه‌کانه‌ هه‌ر ئه‌مه‌ش بووه‌ هوێ

ئەوەێ کوردەکان نەتوانن لە دەوری بیروڕایەکێ نەتەوەیی کۆ ببنەوە و یەک بگرن.

رووسیا دەستیکی باڵای لە ژێر خستنی راپەرینەکەێ شێخ ئوبەیدوڵلادا هەبوو، چۆن کومەڵگای کورد لە ناو خوێدا تا رادیەکی زۆریش لەم رۆژانەدا و لە بنەڕەتدا سروشتێکی ئەشیرەتی هەیە. وررووسیاش بۆ جیاوازی و ناکۆکی برێک لە سەرۆکە کوردەکانی بە رەو لای خۆی راکێشا و پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان پەیدا کرد توانی کورد بە دو شەقەوە بکات.

# «کۆماری کوردستان ١٩٤٦»

بەر لە دەس پێ کردنی ئەم بابەتە، ئەوە بڵێم کە لە جمهووری کوردستان (١٣٢٤ هەتاوی بەرانبەر بە ١٩٤٦ی زایینی) ئەگەرچی مرۆڤی سەواد دار کەم بووە بەڵام بێ سەواد و با وێژدان و دڵ ساف زۆری بوو و لەم سەردەمەدا خوێندەوارێک وا دڵ و دەروون پڕ لەفەن و فێڵی بازاریە جێگایەکی ئەوتوی نەبو.

جا ئێستا بە داخەوە سەرنج ئەدەینە ئەو سەردەمە وا بەراستی ماوەیەک بوو گەلی کوردی چەوساوە دەورەی شادی و خۆشی بووە!؟

لە ٢ی رێبەندانی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاوی، بەرانبەر بە ١٩٤٦ی زاینی، وێڕای ئەوەی کە لە رۆژی پێشوودا بەفرێکی زۆر قورس باریبوو بەڵام لەم رۆژە خۆرەتاوێکی گەرم و بەتین بوو کە دەتگوت: «بەهار هاتووە»، بەڕاستی لە ژیانی کوردی چەوساوە و بەشخوراو

ئاوا ڕۆژ ی لە کۆماری کوردستان بە ڕێبەری کەسایەتێکی گەورە وەکوو پێشەوا پێک هاتبێ لە بەهار بەهارترە، ئەویش بەرهەمی خوێنی ئەو شەهیدە سەر بەرزنەیەوا لە زستان گوڵی هیوا دەپشکێنن.

لەو ڕۆژەدا هەموو شاری مەهاباد سەرانسەر بە ئاڵای کوردستان ڕازاوەتەوە و لە ناو ئەم هەموو کۆمەڵەکە بە شێوەیکی ڕێک و پێک لە نزیک ماڵەکەی «قازی محەمەدی نەمر» دەکن چۆمی مەهاباد کۆبوونەوە، پێشەوای نەمریان بە قەراوڵ و هێمنی هێنایە گۆڕەپان و مەیدانی چوارچرا و لەوێ پێشەوا هاتە سەر سەکۆلانی کە بۆ ئەم کاتە مێژووییە تەرخان کرابوو، لەوێ ڕاوستا.

لە بەرەوە بڕێک کوڕ و کچ و ژن و پیاو بەجل و بەرگی جوان و ڕازاوەی کوردی ڕاوستا بوون، هێندی پیرەژن لە سەر بانان چاوەڕوانی ئەم ڕووداوە مێژوویە بۆون و وایان‌دەزانی کە ئێتر لە ژێر چەپۆکی بێگانە ڕزگار بوون. بەڵام بە داخەوە تەمەنی ئەم شادی‌یە کورت بوو و ئەم بەهارە بوو بە زستانی قات و قری گەلی کورد.

ئەو خەڵکەێ کە هۆو هەوێنی بنەڕەتی پێک‌هاتنی بزوتنەوەێ دیموکراتی کوردستان بوون، هەر لە پیاوە ناو دارەکان و سەرۆک خێڵەکانی مەنگوڕ و کورک و زازا بە جل و بەرگی کوردی و بە شێکیان بەپۆشینی جلی ڕۆژئاوایی کۆڕەکەیان ڕازاندبووەوە. دەستەیەک لە کوردەکانی کوردستانی باشووریش لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بۆون و نوێنەرانی بارزانی کە جلی تایبەتی کوردیان لە بەر بوو بە چاوی چاوەنواڕی و دڵی خۆش و دەم بە پێکەنین ڕاوستا بۆون و کوردە شکاکیەکانیش بە جورە جلی تایبەتی

کوردی له نوێنەری کوردەکانی تورکیا ـ که له راستیدا کوردی ئێران بۆون ـ بەڵام هەواڵنێری کوردستانی دابەش کراوی تورکیا بوون، له نێو جەماوەرەکە دیار بوون.

قازی نەمر له سەر بەرزەڵێنەکە به دەنگی نەرم و ئارام و له سەر خۆ، پڕ له باوەڕی خۆی ئاوا هاته قسه و باس؛ «گەلی کورد گەلێکی تەنیایه و له راستیدا نەتەوەیەکی زۆر بێکەسن و هیچ حوکومەتێک سەر به خۆیی و رزگاری کوردی پێ خۆش نیه. سەرزەوینیان به ناڕەوا داگیر و دابەش کراوه و له کەمترین و بچووکترین مافی رەوایان که بریتیه له مافی چارەنووسی خۆیان بێ بەشن.

میللەتی کورد چاوی کردوتەوه، هاتووه به خۆیا و ئێستا لەم رۆژەدا کورد ئاڵای کۆماری کوردستان بەرزۆ دەکەین و ئەمه به مانای سەربەخۆیی و رزگاری گەلەکەمانه. ئەرکی سەرشانی هەر کوردێکه که خۆی له حەنای دوژمنانی کورد بەرپرس بزانێ». له ناو هاواری شادی و چەپڵە لێدانی دانیشتووان و ئامادە بووان، پێشەوای نەمر ماڵئاوایی له هەموو جەماوەر و کەسانی ناوەندی رێکخراوی پارتی دیموکرات کرد و هەروەها سوپاسی هەستی گەلی قارەمانی کوردی کرد که به خوێنی لاوەکانیان ئاڵای بەرزی نیشتمانیان شەکاندەوه به جوانی بەرزیان کردەوه و ئەو نەمرەیان به رێبەری خۆی هەڵبژارد.

پاشان ئەبای شۆڕ و لەباوکەوتووی خۆی له بەر دەر هێنا و به رێزێکی زۆرەوه لەگەڵ ئەمامەێ سپی که پێشاندەری رێبەرایەتی بۆ دەقی کرد و نایه لاوه و «ئونی فورمی» رووسی که له تەورێزەوه بۆی هێنابۆون لەبەر کرد.

قازی محەمەدی تەنیا ئەو ڕۆژە جلەکەی لە بەر کردوو باسەکەی تەنیا پانزدە چرۆکە درێژەی کێشا و لە نێوان باسەکەی لە یارمەتی‌دانی سوڤیەت[١] لە بابەتی ماڵی و نیزامیەوە سوپاسی کرد و لە براێانی ئازەری بۆ وەرگرتنی مافی خۆیان پیرۆز بایی کرد و هەروەها گوتی:«براێانی ئازەری و کورد ئەبێ پشتیوانی یەکتر بن».

کاتێ کە قازی نەمر بە قسەکانی کوتایی هێنا وهاتە خوارەوە بە نیشانەی شادی و خۆشی، سێسەد چەکدار هەر یەک پێنج گوللەی شادی‌یان دەر کرد و هەر مرۆڤی بە وێژدان ئەگەر ئەو ڕۆژە بوویا قەت نەیدەویست ئەو خۆشی و شادیەی گەلی کورد ببێتە شێوەن و ماتەمین و کەس نەیدەوێرا پەیامی برایەتی و ئاشتی خوازی قازی لە مەڕ یەکیەتی و یەک گرتن گەلانی ناوچە لەکنی یەکتردا لە بەر چاو نەگرێ.

بەڵام کاتێ کە نەمر قازی هاتە خوارەوە زیڕ و بەگ ڕۆیشتە بان سەکۆلانەکە و باسێکی سەختی هاوردە پێشەوە و بە قسەی تاڵ و تێژی خۆی بۆ شێخ ئەبدوڵلای ئەفەندی گیلانی پەلاماری بردوو گوتی: «ئەم شێخە لە بزوتنەوەی کورددا هیچ ڕەوڵێکی نەبووە» و بە سیخوری ئینگلیزەکانی ناساند و بەم قسانەی کۆمەڵە خەڵکەکە ئاژو واژ بوون، بەڵام دیسان قسەکانی زیروبەگیان بەتاڵ زانی و هێمنی کەوتەوە نێو کۆمەڵەکە.

شێخ ئەبدوڵلا ئەرتەشی ئێراقی بەجێ هێشتبوو و هاتبووە ناو بزوتنەوەی میللی کورد و ئەگەرچی باوەڕی بڕیەک لەکوردەکان وابووکە ئەو لە ئینگلیز پۆوڵ و پارە وەر دەگرێت و لەگەڵیانا هاریکاری دەکا، بەڵام لەوکاتە هاتبووە ڕێزی لایەنگرانی بزوتنەوەێ کۆماری

کوردستان.

ئەو رۆژە شادی و خۆشی لە دەرو دیواری شاردا ئەباری و دەنگی دەهۆڵ و سورنا بۆ کاتێکیش نەبڕایەوە و هەڵپەڕکی و سەمای کوردی سەرنجی هەرکەسێکی بە لای خۆیەوە را کێشا بوو و هەموو کوردێک وایدەزانی کە رزگاری و سەر بەخۆی‌یان لە باوەش گرتووە و نابێ لە بیر بچێت کە لەو کاتەدا رووس چ رەوڵیکی هە بووە.

رووس لەم کاتەدا بە چاوەدێری خۆی کۆماری کوردستانی یارمەتی داو کوردەکانیش لەم کردەوەێ رووسە رازی بۆون و هەروەها لاوانی کورد بۆ تێپەڕکردنی دەوەری نیزامی رۆیشتنە«باکوو» و لەوێ چوونە فێرگەی پوولیسی بۆ پاراستنی کۆماری کوردستان.

هەروەها هەزار و دووسەد قەبزە چەکی جورراوجور ودەزگای چاپ و هەشت دەزگا کامیوونی بارکێشی نیزامی لە لایەن رووسەوە بۆکوردستان هات و پاشان پێنج دەزگای‌تر بەوان زیاد بوو.

گەرچی کوردەکان داخوازی تانک و تووپیان کرد تا لە کاتێ پێویستدا لە گەڵ هێزی ئێران بۆ شەڕبەرگری لێ کەڵک وەر بگرن بەڵام رووسەکان هیچ کات ئەم تووپ و تانکانەیان نەهەنارد و رەنگە هەر لە هەوەڵێشەوە لە گەڵ کوردا روو راست نەبوون.

قازی نەمر لە گەڵ کەریم ـ ی وەزیری فەرهەنگ بۆ هەڵبژاردنی لاوی ئازاو لێ هاتوو کەوتنە راوێژ و لاوانی رۆشنبیر و خۆیندەوار لە شاری مەهابادا گەیشتنە شەش سەد کەس و هەوەڵین جار چل کەسیان رۆانەێ رووس کران و باوک و دایکیان کە دەیانزانی ئەم کارە بو هێز و ئەرتەشی کوردە گلەییەکیان نەبوو و ئیزنیان پێ دان.

لە راستیدا ئەمە هەر فەن و فێڵی رووس بوو کە تەمەنی کۆماری کوردستان کوتایی پێ هات و بە داخەوە هەموو ئاواتەکان لە دڵ دامرکاو رووسەکان لە بەر ئەوەی دەسەڵاتیان بە سەر کوردستانا بێت و ناوی رووس کەم رەنگ نەبێتەوە لە هەموو شوێنێک لە کوردستان رەخنەیان کردو و پزیشکەکانی نەخۆشخانەکانی مەهاباد رووسی بۆون و ئەگەر کارێک پێش بهاتبایا دەبوا لە دوکتۆر (سەمەدۆفی رووسی) پرسیار بکریا با.

بیروڕای حکومەتی کوردستان وا بوو کە هێمنایەتی و ئاسایش و ئەمنیەت لە پێش هەمووشتی بکەوێتە کوردستان. لەم لایشەوە کە لە سەقزەوە بەرەوە دیواندەرە و سنە کوردەکانی مەنمی کەو تبوونە گیان کوردەکانی ناوچەیێ لەیلاخ و سنە و ئەم مەنمی و گەڵواخی و کوردەکانی شێخ ئیسمائیلی هەموویان لە تاڵان و چەتەگەری براکوردەکانی خۆیانا بۆون و بێ ئەوەیێ بیرلەوە بکەنەوە کە ئەبێ یارمەتی ئەو هەریمە بدەنوا بە خوێنی کورد بە بەرهەم هاتووە، کە چی وەکوو کرمیدارخۆر بوون.

مالکی بانە حەمەرەشیخان زەرەرو زیانی زۆری بە کۆماری کورد گەیاند، چۆن ئەو تەواوی ئاواییەکانی دەوروبەری بانە و سەقز و سەردەشتی تاڵان دەکرد و کوردی ئەو ناوچەیە بە برسی و هەڵوەدایی جێ دەهێشت.

لەو هەموو گیروداره بڕیار درا کە دەستەی دەوڵەت پێک بێنن و سەرۆک وەزیریان بووە«حاجی باباشێخ» خەڵکی بوکان کە دۆستی رەزا شایش بو.

ئاموزای نەمر قازی،«سەیف قازی» بووە وەزیری جەنگ و جێگری قازی و وەزیری فەرهەنگ بووە «مەناف کەریمی» و وەزیری دەرمان بووە «سەیمحەمەدی ئەیووبیان» و

وەزیری کار و باری دەرەوە بووە «ئەورەحمان ئیلخانیزادە» وەزیری دارایی بووە «ئەحمەدی ئەڵلاهی» و وەزیری کار بووە «خەلیل خەسرەوی» و وەزیری پووس و تیلگراف «کەریم ئەحمەدیان» و وەزیری تەجارەت بووە و «مەحمود وەلیزادە» وەزیر بووە.

جگە ئەمانە چەند کەسێکی تر، (مەلامستەفا بارزانی و ئەمرخانشکاک و رەشیبەیگ هەریەکی کاری خۆسەرانەیان نەدەکرد) و هێمنی و لە سەر خۆیی راستی. نەمر قازی کاریکی کرد بوو کە ئەم حوکومەتە جێگای خۆی لە ناو دڵی خەڵکی کوردستان بکاتەوە و مێژووی کورد مەگەر «هوەخشتەر» و «دیاکو» ئاوا پێشەوایکی بە خۆیەوە دیتبێ.

بە داخەوە ئێمە هێشتا نازانین کە کردەوەی چاکی ئەو پێشەوا چی بووە. زۆربەی هێزی کورد لە بابەتە جورراوجورەکانەوە بە قووە و راوێژکاری بارزانیەکان ئەگەرا، چۆن لەم کاتەوا کۆماری کوردستان پێک هاتبوو کوردەکانی دابەش بە ئێراق تووشی چارەرشی و دەربەدری بۆون و دەیان هەزار کوردی هەژار کەبریتی بۆون لە ژن و منداڵ و پیر و جوان لە پیران شار دانیشتە جێ بوون و مەلامستەفایش هەزار پێشمەرگەی هاوردووە نێو ئەرتەشی مەهاباد.

کە چی مەلامستەفای بارزانی هاتە نێو کۆماری کوردستان و لە پاشان بە خەیانەتی ئەمریکا و ئینگلیزی و رووس پەی دەبا و ئەمانە بەراستی داوێک زیاتر بۆ کوردی هەژار نە بووە و هەر بە وتەی قازی نەمر: «کورد تەنیا و بێ کەسە» بەڵام ئەگەر یەکگرن و یەکیەتیان بێت هیچ حوکومەت و هەریمێک ناتوانێ زوڵمی لێ بکات و ئەتوانن خۆیان

هەموو ئامانجەکانی حکومەتی دژ بە کورد بشکێنن.

لە ماوەیەکی کورت لەپاش هەڵبژاردنی سەیف قازی بە وەزیری جەنگ هەنگاوێک گەورە بۆ رێک خستنی ئەرتەشی بە هێزی کۆماری کوردستان هەڵگیردرا و لەم بابەتەوە کۆماری کوردستان زانی کە نابێت پشت بە ئەشایر ولادێنشینەکان ببەسێ، بۆئەوەی کە ئەوان لە شوێنی نانی خۆیانن، و لە بەر ئەمە ویستیان ئەرتەشێک پێک بێنن کە بۆ دایم بەردەوام بێت و چوار ژینراڵی کورد بە ناوەکانی «رەشی‌خانی بانە و سەیف قازی و مەلامسەفای بارزانی و ئەمرخانی شکاک» و برێک لە کوردە شۆرشیەکان کە لە کاتێ شەردا بەشداریان کردبوو دەرەجەی سەرهەنگیان گرت لەم کاتەدا بەنهێنی کرملین بووە نوێنەری رووس لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و خەریکی ئیمزاکردنی پەیمانێک بوو کە ئیتر رووس کاری بە کوردەوە نەبێت و لە کوشتن و تاڵانی کوردیش تۆرە نەبێت.

ئێرانیش ئیمتیازی نەوتی باکووری‌دا بە رووس و باڵوێزی رووس و قەوام لە ژێرەوە و بە نهێنی ئەم بریارنامەیان جێبەجێ کرد، چۆن حکومەتی ئێران باجی باشی بە رووس دا بو و دەمی رووسی چەور کرد و بە چەکی نیزامی و هێزی گەورەی چەکدارانیەوە و لەشکەرێکی زۆر کەوتە پێشرەوی لە کوردستاندا و لەم کاتەدا ئەگەرچی ئەرتەشی کۆماری کوردستان بەهێز بوو، بەڵام کورد لە سێ لاوە هێرشی پێ کراو بەو رادەیە هێزو توانای نەبوو بەر ئەو هێرشە گەورە بگرێ.

ئەگەرچی ماوەی چەن مانگ شەربوو و کوشتار و زەرەری زۆر کەوتە ئەرتەشی ئێران و هێزی کورد لە خۆی قارەمانیەتی و شەرێکی بێ وێنەێ نواند بوو، بەڵام بە داخەوا

کوردەکان پێیان وابوو کە رووس یارمەتیان ئەدات و کاتێ کە داوای چەک و شتێ تر لە رووس دەکەن یەکێک لە کاربەدەستانی رووس دەڵێ: «لە دەسەڵاتی ئێمەدا نیە».

ئەوسا نەمر قازی بۆی دەرکەوت کە لە نێوان ئێران و رووس دەس بەیەک کراوە و ئێتر لە کورد پشتیوانی ناکرێ.

کوردەکان لە قاراو هێرشی گەورەێ ئەرتەشی ئێران بە تەواوی تێک دەشکێنن و ناوی کورد و هیمەتی پارتی دیموکرات زۆر بە ئازایە تی و دلێری دەنگ ئەداتەوە و برێ کوردی‌تر دێنە ریزی جەنگاوەرەکان و بەرەوکرماشان دەکەونە رێ تا بە شەرێکی قورس کرماشان لە دەسی بێگانە ئازاد بکەن و بیکەنە بەشی کۆماری کوردستان.

لە بیستی مانگی (مەی) ۱۹۴۶ی زاینی بەرانبەر بە ۱۳۲۳ی هەتاوی تاقمێک بۆ شناسایی هێزی کورد لە سەقزەوە کە فەرماندەکەی سنەیی بوو بە نێو سەروان خەسرەوی بەرێ کە وتن کە هەم سەروان خەسرەوی کوژراو هەم ئەوانیتریش ترس و لەرز کەوتە گیانیان و بەو چەشنە شپرز بوون.

لەم کاتە ژێنراڵ (رەزم‌ئارا) فەرماندەیی شەڕدەگرێتە ئەستو کە نزیکەێ پێنج هەزار چەکداری لە ژێر دەسەڵات‌دا بووە و لە پشتیوانی فڕوکەێ جەنگی و تووپ و تانک قازانجی بردووە.

ئەمانە ئەیانەوێت کوردەکانی بەین سەقز و سنووری ئێراق بەنەبەر هێرش و پەلامار کە سێزدە هەزار کەس بۆون و دیار بوو کە ئەمە هێزی گەورەی کۆماری کوردستانن.

پێویستە بڵێن تا ئەمرۆ کوردەکان لە سەرانسەر جیهان‌دا لە شەڕ و بەربەرەکانی ناویان

له سەر زمانان بووه و له نێو هەر نەتەوەیەک له رۆژ ئاواو رۆژ هەڵاتدا لەم باسە بیریان کردووه.

ئەمه بۆ هەمووان جێگای سەر سوڕمانه که کورد له کاتێ سوواری و ئەسپ بە غاردان توانیویه چەک بەکار بێنی و دوژمن شکست بدا و هێشتا ناوی سوارەی حەمەرەشی خان ویردی زمانی هەموو کەسێکه و سوارەی کۆماری کوردستان رچەشکێنی شەڕه نالەبارەکان له گەڵ داگیرکەران بووه.

لەم کاتەدا زۆرتر له سەر چریکەکانی مەلامستەفا بارزانی باس دەکرێ و کارامەیێ ئەوان فرەتر بووه. بۆ ئەوەی که ئەوان دەورەی چریکی شەڕیان دیتبوو.

هەروەها پیلان و فێڵیزیاتریان له شەڕدەزانی و تا دوژمنەکەیان بە بەردەس نەهاتبایا تەقەیان لێ نەدەکرد و پاشان بە چەشنێک هێرشیان دەکردە سەر دوژمن که رۆژی رووناکیان دەکردە شەوی تاریک.

تا هیرخانی سمکۆ کوڕێ سمایل سمکۆ لەم شەرە دلێری و چالاکی چاکی له خۆی نوواند و هەموو دەسته و سوارەکانی کورد له ژێر رکیفی کۆماری کوردستان پەلاماری ئەرتەشی ئێرانیان دەدا تا ئێران بەو باوەڕه گەیشت که توانایێ بەربەرەکانی له گەڵ کوردەکانی نیه و تەنیا بە سیاسەت و رامیاری ئەتوانی له دڵی خاوین و سافی کورد کەڵک وەر بگرێت و چارەێ خۆی له ناو فێڵبازیدا دی و هەر بەو رەوڵەیە توانی ئەم کۆماره بڕوخێنێ.

لەم بارەوه ئێران پێشنیاری وتوێژی داو کوردی ساکار و دڵپاک بە پێشنیارەکەی

وەڵامی بەڵێنی دایەوە و بێ ئەوەی کە ئاکامی بێ لە ژێرەوە هێزی لەشکری ئێران دیسان ئامادە بوو کە شەڕی ئاخری خۆی بە ئاکام بگەیێنێت، پێشنیاری ئاگربەسی نیوە و ناتەواو لە لایەن کوردەکانەوە قەبووڵ کرا و لەم دەرفەتە بوو کە جیرە و کەل و پەلی شەڕهاتە هانا و یارمەتی ئەرتەشی ئێرانەوە پێ گەیشت.

لە وت و وێژەکەدا سەرهەنگ دووهەم «ئیزەد ئەبدوڵ ئەزیز، سەرگورد ئیبرایم سەلاح و سەرۆکی ستادی ئەرتەشی کۆماری کوردستان» حازر بوون وادەی سەربەخۆیی و خۆدموختاری بە کوردەکان دراو بە داخەوە ئەمە پیلان و حیلەیەکی زۆر گەورە بوو کە پشتی کۆماری کوردستانی دەشکاند.

ئەگەرچی لەم وت‌و وێژەدا بڕیار نامەیەک لە چەن ماددە رێکخراکە بۆوێنە منداڵانی کورد تاپۆلی پێنجمی سەرەتایی دەتوانن بە زمانی زکماکی خۆیان بخوێنن و بنووسن، بەڵام هیچ ئامازەیەک بە خۆدموختاری کورد نە کرابوو.

لەم کاتە کە کۆماری کورد لە کات و سات سەخت و دژوارەکانی خۆی بە سەردەبرد دەرکەوت کە ئاگر بەس بە مانای لابردنی گیر وگرفت و چارەنووسی کورد نەبووە و تەنیا دەرفەتێک بووە بۆ پێک هێنانەوە و ساز کردنی لەشکری شکست خواردۆی ئێران و لە راستیدا تەنیا دڵخۆشی کورد لەم ئانەدا یارمەتی رووس بوو کە چی ئەوانیش بەنهێنی لە گەڵ ئێران رێک کەوتبوون و لێرەدا تەنیا بۆ ئێران مەترسی لە هێزی بارزانیەکان مابو.

ئەگەرچی بەم چەشنە کورد تووشی تەجارەت بوو، بەڵام قسەکەی پێشەوای نەمر هاتە دێ کە.وتی کوردی تەنیا و بێ کەس ئەگەر خۆیان یەکگرتوو بن پشتیوانی بێگانەیان کە

تەنیا بۆ ئامانج و قازانجی خۆیەتی ناوێ.

سەرهەنگ میرحاج و بڕێک لە بارزانیەکان بەو رایە گەیشتن کە هێرشێک هەموو لایەنە و تۆند بە کار بێنن تا خاکی کوردستان لە ئەرتەش و سیخوری دوژمن پاک کەن و بڕیاردرا کاتێ کە هێرشی هەموو لایەنە دەکەن نابێ دەرفەتیان پێ بدرێ تا هێز و توانای خۆی دیسان ساز بکەن.

لەم بابەتەوە گەلی کورد زۆر دڵ و رۆحیەیەکی بە هێزیان بوو و هیچ کات یاس و ناهومیدی دایانی نەدەگرت و ئەگەرچی ئەرتەشی ئێران زۆرتر زەرەرو زیانی دیتبوو، بەڵام هێزی بە هێزتر لە کوردان بووە و لەبارەێ ئەم کارە ساتە دەبێ بڵێن کە گڕەی شۆڕشی کورد تەنیا بەدەس رووس کوژیاوەتەوە و لەم بابەتەوە ئینگلیز و ئەمریکایش لە سەر لێ شێواوی کورد دەستی و ئالایان هەبووە.

کاتێ کە نەمر قازی سەرانی کۆماری کوردستان بانگ دەکا، دەفەرمووێ: «من سێ رێگا لە بەرتان دادەنێم، تا ئێوە یەکێکی هەڵبژێرن، یەکم ئەمەیە کە هێزی کورد گوێ بە رووس نەدات و هێرش بباتە سنە. دووهەم ئەمەیە کە تەسلیمی حکومەتی ناوەندی ئێران بۆون و سیهەم ... و لەمبارە بیر کردنەوە و هەڵبژاردنی هەریەک لەم سێ بیرورایە دەخەمە ئەستوێ ئێوە کە کامی هەڵبژێرن».

حاجیبابا شێخ لە باسی شەڕەوە لێ دواو برێکتریان لە سەر پاشەکشی بڕیاریان داو بەم چەشنە دەیانتوانی لە گەڵ دەوڵەتی ئێران بە شەڕ بێن بەڵام رای قازی محەمەدی نەمر لە سەر ئاشتی و هێمنایەتی لە رێەی دیپلوماسی بوو.

ئەگەرچی کۆماری کوردستان لە ئاوا رەوڵێک کە دەیتوانی هەموو گەلی کورد دژ بە ئێران راپەڕینێ و هێرشی بباتە سەر سنە، بەڵام بەداخەوە بە پێی هاتنی سەر کونسولی رووس بۆ کنی قازی ببووە هوێ ئەوەی کە لەشکری کورد هێرش بۆ سنە نەکات.

لە راستیدا ئەم پیلانە وەها بوو کە کوردەکانی شاری سنە و دەورو بەری بۆ هێزی کورد پێکەوە ریک نەکەون، ئەگینا ئەگەر وا نەبووایا رەنگە چەرخ بە باری تر بسوڕیا و خەباتی گەلی کورد رەنگ و شێوەیەکی تری بە خۆیەوە دەگرد.

گەرچی لەم ماوەیەدا بە ئاگر بەس و ئاشتی کوتایی هاتبوو و بەڵام مەناف کەریمی بە پەلە لە سەردەشتەوە فەرمانی ئاگر بەسی بە کوردەکان داو لەو لایشەوە لە سەقز سێ نەفەر بە ناوەکانی حاجی‌بابا شێخ و هەژار و حاجی محەمەد بۆ وت‌وویژ ئامادە بوون.ئەم سێ کەسە تا ئاخر بە دەستوری تاران لە سەر ئەم رایە بۆون تا شارە مەرزیەکان لە دەس کوردەکان بێت و ئەم فێڵ و فەنە زۆرتر لە خۆخەڵەتان شتێکی‌تری بە دوا نەبوو.

پێشەوا لە سەر ئەم باوەڕە نەبووە کە رژیمی کورد دەبێ ببێتە ترسێنەری خەڵک و بەردەوام بە خەڵک دەیگوت: «ئەبێ رەفتار و حەرەکاتێ ئێوە وا بێ کە نوێنەری چاکی کورد بێت و هیچ کەسێک نابێ لە ژێر ناو حەق‌خوازی کورد لە کەسی دیکە باج وەربگرێت و بە مرۆڤ ئەستەم کات. دەبێ کردەوەی ئێوە نوێنەری راستەقینەێ ئەم گەلە بووێت تا خەڵکی کورد زۆرتر بچنە ریزی بزوتنەوەکە و دەبێ لە بیری نەبەین کە ئێمە بێ خەڵک کارێکمان بوو ناکرێت و ئەم بلێسەێ حەق خوازیە ئاوات و هیوای لە مێژینەێ هەرکوردێکی خاوەن راو بە شەرەف بووە و هەر دڵسوزێک دەبێ هەست بە بەرپرسی ئەم

میللەتە بکات بۆ پاراستنی ئامانجەکانی گەلی کورد ئامادە بێ».

ئەمەیە ڕێبازی پێشەوایەک کە هەموو کردەوەکانی خۆی لە بەر ڕەزامەندی خەڵک بوو و ژیانی خۆی بۆ ڕزگاری میللەتەکەی دانا و تا پای سێدارە چوو، کەچی سەری لەم ڕێگایە دانا و وەها بوو کە دەیگوت: «من سوێندم خواردووە تا ئاخر لەگەڵ ئەم میللەتە بم» و بە هەموو سەرۆک وەزیرەکانی گوتی: «ئێوە لە شار بڕونە دەر، من لەگەڵ ئەم گەلە دەمێنم».

بۆ ئەوەی ئەرتەش و هێزی داخ لە دڵی ئێران بە دڕندانە هێرش نەبەنە ناو شاری مەهاباد خۆی تەسلیمی ئەوان کرد تا خەڵکی هەژاریش کەمتر لەناو بچن و بۆ ئەم هۆوە لە سبەیانی تاریک و ڕووندا لە گەڵ براکەی و ئاموزاکەی لە ڕێەی ئامانجە پیرۆزکانی نەتەوەی کورد لە سێدارە دران و ئەمیش هەر بە ئیزنی ڕووس و پیلانی ئێران بوو.

نەمر قازی پاش ڕۆیشتنی بۆ تاران سەرگەردان ماوکاتێک کە دەگەڵ قەوامی سەرۆک وەزیری ئێران و ژینراڵ ڕەزمئارا ڕۆیشتنە باڵوێزخانەی ڕووس باڵوێزی ڕووس بە تۆڕەییەوە بەهانەی ئەوی گرت کە کردەوەتان لەگەڵ تورکەکان خراپ بووە و شتگەلی تر کە قازی بۆی دەرەکەوت کە ئەمە خەیانەتە و دوارۆژ ی کورد و چارەنووسی کورد نادیارە و تەنیا لە ڕووی ڕەحم و بەزەیی وڵاتە بێگانەکان، ئەویش بە دەم دەتوانین بڵێن: «ئێوە تاکەی بەم قەومە سەر سوڕی دەکەن و لە ماف و حەقی خۆیان بێ بەشیان ئەکەن».

قەوامی حەوت خەتیش ئەمەی بۆ دەرکەوتبوو کە دیپلوماسی ئێران دەتوانێ بە ئیمتیازیداتنی نەوت دەمی ڕووسەکان ببەسێ و بۆیە ڕێەی حیلە و فێڵبازیی گرتە بەر.

لێرە دەبێ ئاماژە بکرێ بەبێ لوتفی مامش و مەنگوورکە لەکوردەکانی ئازا بۆون بەڵام بە هوێ کەمتەرخەمی سەرۆکەکانیان پشتی کۆماری کوردستانیان خاڵی هێشت و داخەکەم نەیاندەزانی کە رووسی رووڕەش ئەوانی بە نەوت موئامیلە کردووە.

گەلی کورد بە تایبەت شۆڕشگێرانێ کورد، هەمۆویان چاوەرێ رایٚ پێشەوا بۆون و کاتێک بۆیان روون بوو کە ئەم کارە ساتە دڵتەزێنە رووس بە سەریانی هێناوە، ئیدی بۆ هەمیشە لە رووس قینیان هەڵگرت و ئێستاکەش ئەگەرکەسێک ئەمەگ نەشناس و پیس بێت پێ دەڵێن: «وەکوو رووسەکانت پێ هاتووە» یان «لە رووسەوە هاتووتە دنیا».

هێندی لە کوردە چەکدارەکانیش ویستیان بەرە و ئێراق هەڵ بێن، بەڵام ئێوارەیەک سەرۆک وەزیرەکان لە خانووی پێشەوای نەمردا کۆ بوونەوە و پاش ماوەیەک تەگبیر و تێفکرین تەماداری بیروڕای قازی محەمەدی نەمر بوون و ئەویش بە وشەیٚ سەر لە خۆی و بە هێمنی هاتە وتار وگوتی: «وا چاکە ئێوە بڕون، بەڵام من لەگەڵ خەڵکی مەهاباد ئەمێنم و سوێندم خواردووە لەگەڵیانابم و ئەمە بزانن کە ئەگەر حکومەتی داگیرکەر من بگرێ رەق و کینەی خۆی لە سەر من خاڵی دەکا ئەدی لە سەر خەڵکی بێ تاوان دەگەڕێ و بۆیە من مەجبورم لەم شارەدا بمێنم»[1].

بە راستی ئەوانەیٚ وا درێژە بە رێبازی قازی نەمر ئەدەن دەبێ ئەم ئامانج و ئارمانەیان بێت و ئەم کارە مەزنە قەت لە بیر نەبەنەوە.

هەرچەن کە تاقمێک گەورە لە کۆ بونەوەکە گوتیان: «ئەگەر تۆ بمێنی و گیانت بکەوێتە

---

۱- جمهوری کوردستان نوسین (ویلیام ایلکتون جونیر) وەرگێر م ـ ی.

مەترسی، ئێمە حازرین لە جێگەی تۆ راوستین»، بەڵام نەمر قازی ئەمەیٚ قەبووڵ نەکرد و بەم چەشنە قازی دوایی بە جەنگ هێنا و تەسلیم بە دوژمن بۆون و ئینجا کاتیٚ کە لە رووسی روورەش لەمبارەوە پرسیار کرا، ئەسەدوف گوتی «ئەی خۆشەویستان مەگەر ئەوە نازانن جیهان پرە لەم بازیە سیاسیانە و ئێوە ئەندامێکن لە جیهان. ئەڵبەت منیش بۆ بەخت و چارەنووسی ئێوە پەژێوم».

رۆژێک دوای ئەوەی کە قازی نەمر و سەیف قازی و حاجیبابا شێخ و چەن کەسێکیتر تەسلیمی ژینراڵ رەزمئارا بوون، ژینراڵ لە نەمر قازی پرسیاری کرد کە: «بۆچی کوردەکانی ئێرانت بۆ جیا بوونەوە لە ئێران هانداوە». و نەمر قازی لە وڵام فەرمویٚ: «ئەم پرسیارە چاکە لە رووسی براتان بکریٚ و بۆچی لە رووس لەمبارەوە شتێک ناپرسن؟»

نەمر قازی درێژەی بە وتارەکەی داو گوتی: «هەر ئێستاش بارزانیەکان رایان وایە لە شاری مەهاباد بەرگری کەن و بۆ ئەوەیٚ کە کوشتارێک لە ناو شارا نەبیٚ وا چاکە کە ئێوە لە شوێنە دیاری کراوەکاندا برۆن».

ژینراڵ بە قازی نەمر گوتی، «تۆ خۆت بۆ ریک بوونی ئەم مەبەستە بۆ مەهاباد برۆ تا خەڵک بتبێنن و بارزانیەکانیش نیتر دەس بە بەربەرەکانی نەدەن».

مەلامستەفا کە هەزار و پانسەد چەکداری بوو، لە رێگای میاندواوەوە بەرەو بۆکان کەوتە ریٚ و لە سەر ئەم باوەرە بوو کە رووبکاتە کێوەکانی مەهاباد. بەڵام نەمر قازی وەکو جاران پیٚ خۆش نەبوو کە ژن و منداڵ بەکوشت بدرێن و بە غەفاری ناوێک کە

سەرهەنگی ئەرتەشی ئێران بوو گوتی: «بە مەلامستەفا بڵێ کە لە شەڕکردن دەس هەڵ بگرێ، ئەرگینا ئەرتەشی داخ لە دڵ دەس ئەداتە کوشتاریکی زۆر لەم شارەدا و دەبێ بزانرێ کە تاڵان و غارەت لە ناو شارەکەدا یەکێکە لە ئەوئەرکانەێ کە سپێردراوە بە ئەرتەشی ئێران».

سەرهەنگ و ژنراڵ رۆژی ۱۷ ای دیسامبر کارەکەیان خستە دواوە تا دوو لەشکەر یەک بگرن، پاش باسێکی درێژ هاورپەکانی نەمر قازی بەئەو گوتیان: «تو هەڵ بێ و ئێمە ئەمێنین».

بەڵام قازی هەر قسەێ پێشووێ خۆی دەکرد و گوتی: «ئەگەر من بمێنم تەنیا ژین و ژیانی من ئەکەوێتە مەترسی و ئەگەر مەترسێک بۆ من هەیە بە شانازیەوە بە پیری ئەو دەچم و لە رێگەی میللەتەکەم سەر و ماڵ قابیل نیە و لاپەڕەکانی مێژووی کورد پڕە لە شەرەف و شانازی بۆ ئەم گەلە و من هیچ خۆم لە خەڵکی مەهاباد و گەلی کورد زیاتر نارانم».

رۆژی ۱۷ اێ دیسامبر نەمر قازی هاتە پێشوازی ئەرتەشی ئێران و پێشوازی لەم لەشکەرە داگیرکەرەکرد و پاشان لەشکەرەکە بەرەومەهابادکەوتە رێ و لە لاێ باکووری شاری مەهابادەوە هاتنە ناو شارو بە پێیە چەپەڵەکانیان شەقامە پیرۆزەکانیان داگیر کرد.

بەم شێوە کوتایی بە کاری کۆماری کوردستان هات و ئەم نیشتمانە شێرپەروەرانە دیسان کەوتە ژێر چەپۆکی چەوسێنەران و بارزانیەکان لە شار چوونە دەرو و بەرەو نەغەدە کەوتنە رێ.

لەم کاتەدا هەموو وێنەکانی پێشەوا سووتێنرا و هێزی ئێران کەوتنە بشکاندن و رووخانی ماڵ و ژینی کورد و بە بوونەی تەفتیش کردنی خەڵک زۆر تاڵان و دزی کرا و سێ هەزار قەبزە چەک و سەد و بیست موسەلسەل و دوو ئەرابە تووپ و نارنجەک و زۆر شتێ دیکە کۆ کرانەوە و قازی نەمر بە ژینراڵ رەزم ئارای گوت: «من زۆر بۆ ئەلی (کوڕی رەشی) ناڕەحەتم کە رۆیشتووە بۆ هاوردنەوەی خوێندکارانی کورد لە باکوو».

ژینراڵ ئوتوموبیلیکی ناردە شوێنی لە تەورێز و لە گیرفانی نامەیەک پەیدا بوو کە سەدر قازی بۆ قازی محەمەد نووسیبووی و لەو نامە هاتبوو کە : «تو لە گەڵ ژینراڵ هومایوونی بە نەرمی وت‌وویژ بکە تا من دێمەوە و من دەچمە کنی قەوامولسەڵتەنە، رەنگ بێ بڕیاری لێبواردن بۆ کوژتنی تۆ بدات». هومایوونی ئەو نامەیە خوێندو هەناریدی بۆ قازی.

کاتێ کە ژینراڵ هومایوونی گەیشتە مەهاباد پەیامی پێ گەیشت و بڕیار بوو دەگەڵ بارزانی وت و وێژ کەن و لەبارەی تەسلیم بوونی چریکەکانی بارزانی راوێژ بکرێ و کاتێ هومایوونی بە ژینراڵ بارزانی گەیشت گوتی: «تۆی کە سەرۆک ئەشیرەتێکی ئێراقی بۆچی هاتوویتە ئێران؟»

بارزانی لە وڵامدا گوتی: «ئەوەڵەن، ئەم جێگایە کوردستانە و خاکی باوک و باوەڕەی منە. دووهەمەن، تۆی ئێرانی بۆچی بە کوردستان هاتووی و ئەم خاکەت بە زۆر داگیر کردووە، ئەوساش دەبێ بڵێم کە من لەگەڵ تۆ باسێکم نیە و دەبێ بچمە تاران و لەوێ لە گەڵ باڵوێزی بریتانیا قسە بکەم».

بەم چەشنە لەم باسەدا هومایوونی سنگی داخ بە لووتیا چوو و بارزانی بەرەو تاران ڕۆیشت. هومایوونی دەستوری‌دا تەواو کەسایەتیە ناودارەکانی کۆماری کوردستان لە ساختمانی شارەداری کۆ بینەوە و پاش پرس و جو چەک و بەڵگەکان، پێشەوا قازی هەموو کارەکانی گرتە گەردن و تاوانەکانی بە ئەستۆ گرت.

بە ڵێ ڕێبەر دەبێ ئاوا بێت کە نەتەوە و گەلی خۆی بۆ مەرجە، نەک لەش و گیانی. بە ڕاستی ئایا کەسێکی ئاوەها ئەرئیستاش گڵکوەکەی هەر جێگەی ڕێزو بایەخە نەبێت ئایا گەلی کورد تا ئێستا ڕێبەرێکی وای بە خۆیەوە دیوە یان پێشەوایکی ترمان ئاوا لێ هەڵ کەوێت؟

ئەو هەموویانی بە بێ تاوان زانی و ئەوانی هەناردەوە ماڵی خۆیان و خۆی تەنیا مایەوە.

لە لایەکی تریشەوە گەلاڵەی ئەلوەندیان بۆ بارزانی پیشنیار کرد و مەلامستەفا گوتی: «دەبێ لە گەڵ شێخ ئەحمەدی برام وت و وێژ کەین» و هومایوونی قەبووڵی نەکرد و ئاخری بەم کارەگەردنی ناو شێخ ئەحمەد گوتی: «ئێمە کاتێ کە بەفر لاچێ ئەم ناوچەیە بە جێ دیلێین و بەرەو کوردستانی ئەودیو لە ئیراق‌دەگەرینەوە و بۆ تۆڵەی خۆمان خەبات ئەکەین».

هومایوونی فێڵباز کە ئەم قسەیٔ پێ ناخۆش بوو ئیسراری دەکرد کە وەزارەتی دارایی ئێران سەد هەزار تمەن بۆ خەرجی ئەم کوردە دەر بەدەرانە تەرخان دەکا کە بە رەو هەمەدان بچن و ئینجا کە زانی بارزانیەکان مل بە ئەم کارە نانن بە تۆڕەیی گەڕایەوە بۆ

مەهاباد و هەڕەشەی کرد کە تا دوو ڕۆژیتر ئەرتەشی ئێران نەغەدە داگیر ئەکا.

هەر ئەو شەوە بە هومایوونی هەواڵ درا کە بارزانیەکان بەرەو شنۆ کەوتوونەتە ڕێ و یازدە کەس لە هۆزی مامشیان کوشتووە و ئەگەرچی بەم کارە پردی پشت سەر خۆیان خراپدەکرد بەڵام دڵ خۆشییەکیان بە ئێران نەمابوو.

پاش ماوەیەک ئاخری شەڕێک لە نێوان ئێران و بارزانی ڕوویدا کە لە مێژوودا وێنەی نەبووە و ئەم شەڕە لە جەنگە موسەلەسیەکان بوو کە تا ئەو ڕۆژە لە هیچ وڵاتێک پێش نەهاتبوو.

ئەم شەڕە سەری لە سپای ئێران شێواند و بارزانیەکان دەیانویست ڕەزاشا دەسگیر کەن و بارمتەیەک بۆون بۆ ڕزگار بوونی قازی محەمەدی نەمر و بە داخەوە لەم ڕۆژ ڕەشیەدا یەکێک لە خانەکانی مامش دەس بە تەقە ئەکەن و بارزانیەکانیش یازدە کەس لەوان دەکوژن و ئەمیشە نموونەیەکە لە بەختی هەڵگەڕاوی کورد کە دژبەیەک و بە فێڵی دوژمنەکانی کورد لە بەرانبەر یەکدا دژ بە یەک ڕادەوێستن.

ئەگەرچی لەم ماوەیەدا کۆڵی ماڵ و منداڵی پێشمەرگەی کوردی هەژار باڵ و جگەریان تەزیبوو بەڵام دیسان هەر شەڕەکە بە قازانجی بارزانیەکان دوایی هات.

بەڵام هەر ئەو کارە ساتەی وا تووشی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بوو، بە سەر ئەوبێ کەسانەش زاڵ بوو و لێرەدا دیسان ئینگلیز و ڕووسی شەرمەسار بێنەری ئەم تراژدیە خەمبارە بۆون و بە نهێنی بڕیاریان لە سەر کوشتاری ئەواندا بوو.

لەم چەن و چوونیە ئەم کوردە بێچارەکە ڕێگایی بۆ نەمابوو. ویستیان خۆیان بە ئێراق

تەسلیم کەن با ئەگەر گەورەکانیان دەکوژرن لانی کەم منداڵ و خێزانەکانیان لە برسیا نەمرن.

ئەمانە ئەچنەوە ناو ماڵ و مەسکەنی خۆیان و بە داخەوە زۆرێک لە ژن و منداڵەکانی کورد لە بەر سەرما و برسیەتیەوە لە ناو چوون.

پاش سێ حەوتە لە دوایێ شەڕی ئێران دەگەڵ بارزانیەکان، حوکمی لە سێدارە دانی بنەماڵەی قازی محەمەد و سەیف قازی و سەدر قازی کە دەسەڵاتیان بەسەر ئەرتەشی کۆماری کوردستاندا بوو لە بەر بەیانی نێوە شەوی ٣١ی مارسی ١٩٤٧ی زایینی پاش چواردە مانگ لە بەسەر کار هاتنی کۆماری مەهاباد بە شێوەیێ بەرنامەیەکی ئەمنیەتی لە مەیدانی چوارچرایێ مەهاباددا لە سێدارە دران.

کاتێ فیوزی گوتی وەکیڵ، گوتی: «وەکیڵی ئێوە رووسە و تۆش چێوی دەستی ئەوانی. ئێوە لە رووس ئیزنی کوشتنی ئێمەتان وەرگرتووە و خۆتان شیاوی ئەوە نین کە ئەم کارە بکەن. من ئاواتی گەلی کوردم و هاودەردی با تەمەنم کورت بێ. خۆ بە کوشتنی من ناتوانن هەستی کوردایەتی بفەوتێنن.

ئایا ئێوە وادەزانن بە مەرگی من بزوتنەوەی کورد ئێتر کوتایی پێ هاتووە؟ ئێوە خۆتان حاکمی بەسەر هات و ژیانی خۆتان نین و حاکمی ئێوە کەسێکی ترە و بزانن کە تا رۆژی کە ئەستەم هەیە بزوتنەوەیێ کوردیش هەر بەردەوامە.

# «زمان و ئەدەبی کوردی»

هەروەها کە زوربەیٚ مێژوونووسان و پسپوڕان زمان ناس بیرو ڕای خویان دەربڕیووە ڕایان لە سەر ئەوەیە زمانی کوردی یەکێکە لە زوانە کونەکان ئێران چۆن پەیوەندی هەرەزۆری بە زوانی ئاڤیستای و پەهلەوی هەیە، دارمستر لە تەحقیقی خوێدا زوانی کوردی کونترلە زوانی پارسی زانیوە.

زوان کوردی یەکێکە لە زوانە زیندوەکان جیهان بە حیساب ئەژمێرن و بیروڕای بڕێک‌تر وایە کە زوانی فارسی لە کوردی‌یەوە چەوتیاوەتە یانی زوانی فارسی لەقێکە لە زوانی کوردی. زوانی کوردی هیچ پەیوەندیکی بە زوانەکانی دیکەوە نیە زوانی سەر بە خۆ و پڕپیتە و بوو هەر شتیٚ مانای باشی هەیەو هیچ چتی یان وشەیەک کەم و کوڕی تێدا نابینری و چەندین زاراوەیٚ هەیەو شاخەدارە بە داخەوە برێک لە شائێرەکان و ماموستا

ئائینیەکان بو بژارکردنی هەوڵ و تەقەلایان نەداوە و بڕێکیان بوو خویان بۆون، نە بوو گەل و نیشتمان و ئایینەکان تەنیا لە بارەی دین و هاوردنی وشەی ئەرەبێ لە جیاتی کوردی وەک یوم‌الممات و رازق‌الرزق و دەیان و وشە ئەرەبی وە «عەیب» و «جزا» و چۆن لە بەر رەزای خویان زانیوە نەک رەزای خودا، و شائیرەکان لەو سەردەمە نە بەکوردی نووسییانە و نە کوردی زانیش بوون و حەوت پیتی ئەرەبی (حروف ئەرەبی) هاوردویانە ناو نووسینی کوردی کە لە کاتێ خوێندوەدا ریشە و دەنگی و شەکە ئەگورێ چۆن لەو سەردەمە دڵسوزی بو نووسینی پیتە کوردیەکان نەبووە و شائیرەکانیش هەر بە نووسینی پیتە ئەرەبیەکان و وشە فارسی‌یەکان گەرچی خوێندنەکەی کوردیە بەڵام نووسینی لە پێتە ئەرەبیەکانەوە کەڵکیان وەرگردوە و پیتە ئەرەبیەکان ئەمانە ص - ض ـ ذ ـ ط ـ ظ ـ ع ـ ث - ئەم حەفت دانە پیتە ئەرەبیە لە کوردیدا نین و زوانی کوردی زۆرتری بە ئاڤستیای‌یەوە نزیک‌ترە. هەروەها کورد نابێ ئەم پیتانە بێرینە ناو زوانی کوردی بوو نووسین و پێتی کوردی‌کە فارسەکانیش لێ کەڵک وەر ئەگرن وەک - ە ـ پ ـ چ ـ ڕ ـ ژ ـ ڤ ـ گ ـ ڵ ـ ۆ ـ ێ ـ ئەم پێتانە تایەتی کوردین و هەرکامیان نیشانەی رەسەنی کوردین ـ بو نموونە چت لە شت کوردترە و گشت لە هەموو کوردی ترە ـ ژنەفتم لە بیستم کوردی‌ترە ـ زوانی کوردی وەکو هەر زوانیکی کۆن و زیندوێ ئێستا دو جورە پێتی هەیەدەنگ‌دار و بێ‌دەنگ. و ٣٢ پێتە کە بەم جورەیە: ئـ ا ـ ە ـ ب ـ پ ـ ت ـ ج ـ چ ـ ح ـ خ ـ د ـ ر ـ ڕ ـ ژ ـ س ـ ش ـ غ ـ ف ـ ڤ ـ ق ـ ک ـ گ ـ ل ـ ڵ ـ م - ن ـ و ـ ۆ ـ وو ـ هـ ـ ی ـ ێ.

سروشتی ئاوا ناسی و فونوتیکی زوانی کوردیش بە چە شنیکە کە ئەبێ بزوینەکان بە

پیت بنووسرێ ئەگینا رینووسی کوردیش توشی کەم و کۆڕیە ئەبێ و لە خوێندندا تووشی هەزاران هەڵە ئەبێ. لە ٣٢ پیتی کوردی «٧» دانەیان پیتی دەنگدارە کە بزوێنیشیان پێ ئەلێن پیتی دەنگدار کوردی بەم جۆرەیە :- ە -ا - و -ۆ -وو - ی -ێ. ئەمانە دەنگ واڵ ئەکەنەوە و کاری هەر کەسێک نیە ئەبێ کەسێک لەم بارەوە وشەکان و وڵاتە دراوسیەکان تارادەیەک بزانێ و زمانەوان کوردی بێت[1] و ئێمە نابێ هەر کەسێک لە ریەوە خۆی بە ماموستا ئەلف بێ زوان ناس دا بنێ و هەر چی پێ خۆش بو بینووسی یا بلێن بو بەرزی کەسایەتی خۆی گەلی کورد ئەبێ ئەوەی کۆڕی زمانە وانی کورد رایێ لە سەری داوە کەڵک وەر بگرن، ئەوکاتە وا بۆ یەکەمین جار سومریەکان بە ئەلامەتی نیشانەی دیاری کراوە خەت و نووسی‌ینیان دۆزیەوە(کەشف کرد)[2] کوردەکان (گوتیەکان) بە نیشانەی دیاری کراو کەێن و بەێنی خویان بەو شێوە راگەیاندوە بو نمونە ئاهو بە مانای شادی، وێنە کێشانی مار بە مانای دوژمن و تەوەر بە مانای جەنگ و ژن و پیاو هەڵ پەڕین بە مانای زەماوەند و چێژن بوە. هەروەها کە لە پێش‌دا باسمان کرد زوانی کوردی لە سەر بنچینەیێ زوانی مادی هاتووە و پاش روخاندنی مادەکان سەرنجی مێژوو گەلی کورد بدەێن ئەم هەموو لێ قوماوەیەو کارەساتە دڵ‌تەزینە کە بە سەر کورددا هاتووە ئەم هەندو کوسپە وا لە سەر رێگای داسپێنرا مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنی کە ئەم زوبانە

---

١-کە چون کاری من نیە لەم بارەوە شتێ نانوسم وە ئەم بابەتە لە سەرچاوەکان نوسیومە.

٢- دوکتور جەماڵ رەشید لە سەر ئەو باوەرە بوە سومریەکان یەکێ لە هۆزە پێشویەکانی کورد

چۆن بە ژیانی خۆی درێژەیٚ داوە پاک و سەربەخو لە کەل دەرهاتووە لە کاتیکدا زوانی فارسی و تورکیی بەو گشتە دەسەڵات داریەوە و راژە و خزمەت کردنە هێشتا پڕن لە واژەیٚ کوردی و ئەرەبی نووسینی تایبەتی بۆ خویٚان نیە[1] بە و ئەگەر زوانی فارسی پیتە کوردیەکان و ئەرەبیەکان لیٚ بژار بکەن زوانی نوقسانە لە زوان و نووسیندا هێشتا کورد لە پێشەوەیە کە وا بوو میللەتی زوانی سەر بە خو و نووسینی جیاواز لە گەڵ فەرهەنگەکانی دیکەدا چۆن مافی خوێندنی لیٚ قەدەغە ئەکرێت. ئەگەر چی لە بەر بەرژەوەندی حاکمەکان کورد روشنبیری ئەخەنە پشت گویٚ بەڵام لاوەکان تازەدرێژەدەری رێگای هوخشتەرە تا پێشەوای نەمر شێخ ئوبەیدوڵلا تازە بەری ئەم لافاوە ناگری باشتر وایە داگیرکەرەکان لە جێگای کوشت وکوشتار و خوێنرژتن بیر لەوە بکەنەوە بێنە سەر ئەقڵ بە پنج هەزار شەهیدی کیمیاوی لە هەڵەبچە ئایا شۆرش و خەبات لە رێگای رزگاری دامرکان یا زیاتر کوردەکان خوێنیان بە کوڵ و جوش هات دەیان ساڵە ئەم کوردستانە بە بیانویٚ شەڕ بە هەزاران بومب فڕوکە بوردمان کراوە و چەن هەزار کوڕ وکچ و پیرە پیاو پیرەژنیان لە خوڕا خنکاند بو بە چی مەگەر ئەتوانن بڵیسەیٚ حەق خوازی لە کورد دامرکێنی چەندێن پیلان و فێل و حیلە دروو و فروشتنیان بە نەوت و کڕین توانییان بو ساڵیک بە خەیاڵی پوچی خویٚان دانیشن ئایا شتیکیان بردە پێشەوە؟ یا بە جێگای ئەو

---

١- ئەم جۆرە شێوە نوسینە هەر لە شیوەی ئەرەبیدا دەنوسریٚ ئەگینا زوانی کوردی بە شێوە خەتی ئاڤیستای بوە. هەر وەها کوردەکانی تورکیا بە شێوەی لاتین دەنوسن وەک تورکەکان چون خەتی لاتین شێوە نوسینی رەسمی وڵاتەکەیانە

باجه و دەم چەورکردنی وڵاته ئیمپریالیستەکان بێن لەگەڵ کوردەکان رێک کەون و لانی کەم تورکەکان ئیزنی خوێندن و نوسینی کوردی بدەن.

ئەم چەنددانە شێعره له یادمانی (تراژدی) حەڵەبجە وتراوه و له شریتی ویدئویی تومار کراوه.

میژوو دەزانێ کورد چەن زەمانه
بەشی هەر دەرد و بەند و خنکانه
چەن دەر بە دەر و سەر لێ شێواووه
چەن مافی بە زۆر لێ زەوت کراوه
چەن کەرەت توشی دەرد و خەم بووه
چەن ماڵ وێران و دەر بە دەر بووه
چەن لە رێ خەبات رەنجی کێشاوه
چەن بو سەر کەوتن قوربانی داوه
چەن لاوێ ئازای شەهید کراوه
چەن گوند و کێڵگەێ سوتێنراوه
چەن جار فروشیا چەن جاریان کرێ
چەن جار لە بنا نەمامیان برێ
چەندە بە کوردان توجارتیان کرد
چەن لە گەڵ کوردا خەیانەتیان کرد

چەندیان کورد کوشتو چەندنیان کورد بڕاند
چەند گوڵی باخی کوردیان هەڵ وەراند
چەن کورپەیَ ساوای کوردیان سوتاندن
چەن گوڵی باخی کوردیان وەراند
چەن بە تەڵەکەو پیلان و تەددبێر
چەن لاوی کوردیان بە زۆرکرد یەخسیر
چەن لاوی کوردیان خزاندە زیندان
چەن روڵەیَ کوردیان لە خوڕا خنکان
چەن شاری کوردیان لیَ بوردمان کرد
چەن دیَ و دێهات کوردیان وێران کرد
چەن کوڕ و کیژی کوردی بێچارە
کران بە پەتی داری سێی دارە
چەن سەر داری کورد بیَ سەر کراون
چەن سمکو قازی لە ناو براون
هێشتا خەریکی پیلانو فیڵن
ئێستاش دەگیرن کە کورد نەهێڵین
بەڵام بە خوێنی کورپەیَ ناولانکان
بە ئاهی سەردی دەرونی دایکان

بە ئەشکی ڕۆنێ هەتیوانی کورد
بە خوێنی گەشی شەهیدانی کورد
بەو خوێنە گەشەێ لە سەنگەر ڕژا
بەو میشکە پاکە لەڕێ کورد پژا
هەتا نەگەینە بەرزی ئاواتمان
تا سەر نەکەوێ گەل و وڵاتمان
تا قەڵای دوژمن نەتوێنینەوە
تا مافی خۆمان نەسێنینەوە
بیرمان نابەزێ پەیمانمان داوە
خوێنمان ڕژاوە بەم خاک و ئاوە

✹ ✹ ✹

ئەگەر چی باسەکە لە ڕەوڵی خوێ دەرچو بەڵام مەبەست ئەوە بو کە ئەم قەومە بەو هەمو کەندوکۆسپە و دەربەدەری چون دێژەی بە ژیانی خوێ داوە لە پاڵی ئەوەدا چون جل و بەرگی خوێ و زوانی خوێ تێکەڵ بە بێگانە نەکردوە ئەیچون ڕەزاشاێ خوێری بە هەرەشەی شەبکە[1] و شەرواڵی کردە بەر فارسەکان بەڵام کورد بەو هەموو کوشتو برە هەرەشە قەدەغەی زوان و جل و بەرگ هەر وەک خورەتاوی بەیانان لە کەل سەری دەر

---

١ - کلاوی دەورەدار.

هاوردووه و یەکی لە میللەتە زیندووەکانی جیهانە کە پاش نۆهەزار ساڵ تێکەڵ بە میللەتانی دیکە نەبووە ئەگەر چی لە گەڵیانا ژیاوە بەڵام هێشتا هەر پاک و بێ گەرد ماوەتەوە.

# چاو خشاندنێ بۆ بار و دۆخی کورد و کوردستان

له پێشەوە باسی رەوڵی کورد و کوردستان له سەدەکانی پێش‌دا تارادیەک لێ‌ی دواین بەڵام له سەر ئەم باوەڕەم کە کەم و کورتی زۆری تێدا بووە و خوم بەر له خوێنەرەکانی خۆشەویست دەستی بۆ دادەکێشم، بەڵام من مەبستم له دەردی دڵ بووە نەک توژینەوەی کوردستان هەروەها کە دەزانین لانکی شارستانیەت ئەوەیە کە سروشتی کوردستان ئاو و خاکی بۆ هەر کەسێ وا بە چاوێ خۆی ئەقڵی و مێشکی ئەخاتە کار. کورد زۆر بۆمان روون و ئاشکرایە کە ئەگەر تەنیا له سەر کێوەکان و شاخەکانی کوردستان هەموویان حەساری نیشتمانن نەک ئەوەێ بەریان له چاو شورەکان و ئەجنەبیەکان گرتووە هەر وەک سیمی خاردار[1] له دەور تا دەوری کوردستان بوەتە دیوار و دەریاێ بێ‌بنی هەیە و ئاو

١- مەبەست لەو (سیم)ە کە دڕکنیان نوروسیوویە.

خاکەکەیّ لە زێرِو ئاڵتون گرێنگ‌ترە و مەکویّ تەمەدون و فەرهەنگ قارەمانی و هەروەها فێرگەیّ شەرەف و نامووس‌داریە هەر ئەم کوردستانە و ئەگەرئێمە لە جیاتی خوپەرەستی خوبەزل زانین و ... خۆمان بینە سەر ئەقڵ و بیر لە رابردوو خۆمان بکەیّنەوە و هەر شکست و سەرکەوتنی پێشویّ باب و باپیرانمان بکەیّنە سەرمەشق ژیانی خۆمان کەمتر تووشی دوبەرەکین و براکوژی هەر قەوم و حکومەتی لەم دنیادا بە دڵسوزی بۆ خۆمان پەیّدای ناکەین کورد ئەگەر خۆی هیمەت نەکات هیچ قەومیّ یان حوکومەتیّ بۆی دڵی ناسوتیّ و گەلی کورد بە «چەکوشی میزان کردنی خاوەرمیانە[1]» ناومان دەرکردووە یانیّ ئەگەر تورکیا لە ئەو برِیارانە وا بە ئەمریکا و ئینگلیز و ... داوە قەوڵی بە سەر نەبات کوردەکان هەڵ ئەخرێنیّ و یان ئێراق ئەگەر دژی وڵاتە دراوسیەکان زوڵم و زۆر بکات کوردەکانی‌دا بەش کراو دژی ئێراق سەر بە هەڵ دان ئەکەن و ئێرانیش هەروەها و سوریاش ئەگەر برِێک بریارنامە ئیمزا نەکات هەر بەو جورە ئایا کورد ماشەیّ دەستی بێگانەکانن یان ماف خوراوی قەرنی بیستمین.

ئەمە ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە کە بێگانەکان نانی خۆیان لە ناو کێشەیّ کوردا دەردێنن پیوست بە چ بیر و باوەرِێکەوە تا ئەوان ئیتر بە گیان و ماڵی کورد بازی نەکەنو مەگەر غەیّر لە ئەمەیە پیویستی بە یەک‌گرتنی هەموو لایّنە هەیّە بەر لە هەموو شتیّ ـ ئەبیّ لە رامیاری و زانستن گەلی کورد ئاگایان بیّت هیچ ئاشیّ وا بو کوردی درووست ئەکەن بیّ دەلیل نیە و هیچ میوانی وا بێگانە ئەیکات بیّ داو نیە و هەر جاریّ خەویّکمان بۆ ئەبێنن

١- رۆژهەڵاتی ناوەراست.

تا چۆن بیر حەق خوازی کوردی بوون لە مێشکی کورد لایٚ بەری

کورد زۆر جار کەوتووە داوی بێگانە و پەڕوباڵیان وەراندوە دوژمن دایم لە بیری تەڵەکەیە بو گەلی کورد چۆن لە داویان دەربێن تاڕادەیک لە بارەیٚ ئەمانە لە پێشەوە باسمان کردووە.

کورد خاوەنی فەرهەنگ و زمان و تەمەدونی میژوویە. تەنیا لە بارەیٚ لەت لەت بۆنی وڵاتی کوردستان کزن ئەویش هی پیشینان کورد بووە دوو کەڵی ئەوانە وا بە چاوی کوردی ئەمۆژەدا دەچیٚ. ئەودەمەیٚ وا خاکی کوردستاندا بەش دەکرا مەگەر کوردی تێدا نەبوۆە؟ مەگەر زەوینی چۆڵ بوو؟ ئایا چاویان لە وڵاتەکانی‌تر نەبوو بۆ ئاو و خاک چ خەباتی خوێناویان ئەکرد؟ ئەگەر هەر کوردیٚ لە هەر دەورە و رۆژگارێکدا بەرامبەر بە حەق خوازی کورد شەو بە بیٚ خەم سەر لە سەرین بنیٚ مایەی نەنگی خویەتی ئەم تاقمە لە هەر دەورەو رۆژگارێک ژیانیٚ لە بەر چاوی کوردی نیشتمان پەروەر و کومەڵی کورد دوست بە سەر شورِ ناسراون مەگەر لەو ئەسرەدا مەسەلەیٚ حەق خوازی نەبووە کورد دەیان و سەدان ساڵە لە سەر مافی رەوایٚ خۆی بە گەلیٚ جۆر خەبات ئەکات هەر ئەم لە خۆ بیٚ خەبەرانە وا ئومری ناموبارەکیان تواو بووە لە یارمەتی دانی بزوتنەوەکان خۆیان بیٚ قەیران کردووە و یان جاسووس خۆ فروش بۆن بە ژیانی چەپەڵیان بەم چەشنە باسی شۆڕشەکەیان کوژاندونەتەوە لە میژەوە دیارە کورد هەر پییان بە سکڵی ئەم خوفروشانە ئەچزیٚ ئەیانەوەیٚ ئەم حەق خوازیە ببیٚ بە پارە و بچیٚ بە گیرفانیان لە دورەوە سەیر ئەکەن کوشتنی هەزاران هەزار کورد بە پەرەیٚ کای دێتە بەرچاویان تەنیا لە بیری خۆیان و

گیرفانیان هەن ئەم ملپان و حەیوان سفتانە ئەگەر چێ شۆڕشەکانی کورد بۆ سەر بە خۆی کوردستان تەنیا بوو خوێان ژیاون وە دزی و جەردەیی یان لە کوردەکان ئەکرد.

گەورەکانی وەک شێخ ئوبیدوڵلای شەمزینان و بدرخان و شورشی بۆتان، لە نیوەیْ دوومی (ناوەراست) قەرنی نوزدەهەمدا و سەرەتا و سەردەمی ناسیونالیزمی کورد دەنگی دایەوە بەڵام بناغەیْ و سەر چاوەکەیْ ئەگەرێتەوە بۆ سەردەمی میرانی سۆران و بابانیەکان و ئاخری دەسەڵاتداری ئەردەڵانیەکان و تا سەرەتایْ ئەوەڵی قەرنی بیستم ئەم حەق خوازییە سەر بە خۆی‌یە لە سەر تا سەری کوردستان بو بە کێشەیْ جیهانی لە ناو دەوڵەتەکاندا لە وڵاتەکانی جیهان دەنگی دایەوە وکاتێ کە لە ساڵی ١٣٠٥ ناکوکی کەوتوە نیوان رووسیە و ئینگلیز لەو کاتە ئینگلیز لە گەڵ کوردەکان نێوانی باش بۆ بەڵام رووس لە بەر ئەوەیْ ئینگلیز حیسابی لێ بیات کەوتە گیانی کوردەکانی ئێرەوان و قەرەباغ و لاچین چۆن ئەودەمە مەکویْ کوڕی فەرهەنگی کورد لەو شوێنانە بۆ و بوەتە بائیسی تەفرەقە و ناکوکی نێوان ئینگلیز و کوردەکان بەم چەشنە کێشەی کورد بووە راس و باس نێوان دەوڵەتەکان بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە چەندە گەلی کورد بێ کەسن کە دواجار رووسی و ئینگلیز کوردەکانی خاکی کوردستان بەش بە ئێران ئەکوشت بە زۆر کوچی پیان ئەکرد لەو لاوە کوردەکانی تورکیا لە ناو خاکی ئێران دژی حکومەتی کەمالیستیەکان خەباتی ئەکرد کوردەکانی دابەش بە ئێراق ئینگلیز پشتی لێان کرد بۆیە کەوتوونە بەر هێرشی دڕندانەیْ ئێراق لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە دوژمن بە گەیشتن بو ئامانجی خۆی کوردی ئەوێت نەک دڵی بۆ کورد بسوتی تەنیا رێگای ئەوەیە پەیوەندی بە

بێگانە نەبێ بۆ یارمەتی چۆن لە ناو قورنەی شەڕدا پشتی چۆڵ ئەکات لە بارەی تاڵان میراتی فەرهەنگ و تەمەدوونی کورد و ئاسەواری مێژوویی هەر میللەتی کە مانای پێ ناسی ئەو میللەتەیە و لە راستی شەجەرە بنەڕەتی ناساندنی مەزهەب و مێژوو و فەرهەنگ و شانازی پێ کردنی ئەو میللەتەیە و پاراستنی و پاسەوانی لەو ئاسەوارە مێژوویە بو هەر مرۆڤ خاوەن فام و ئەقڵی واجبە و ئەرکی مرۆڤایەتی خویەتی کە بە تەتوقڵانیک مێژووی بایەخی بو دا بنن و فەرهەنگ و پێشەی پیشووی لە دەوری تازەدا نا بێ لەبەێن بچێ چۆن هە ر ئەوانە بە ئێمە دەرسی داهاتوو پێشو ئەدەن. بە داخەوە لە مێژوودا لە کاتێ ـ حکومەتەنالایق و خوێڕیەکان لە بەر چەن هوێ کە پیان وتراوە و شل بوونی کار بەدەستانی (میراتناسی) و نەزانی خەڵکی دەور و بەری شوێنەوارە کوونەکان کەوتنە گیانی ئاسەوارە مێژوویەکان و بە تاڵان بردنی سەرمایەی مێژوو باپیرەکانمان و بەم چەشنە وجاخی میللەتی کورد کەم رەنگ و کز بووە. لە کاتێ وا حکومەتەخوێڕیەکان کە نیوانیان لە گەڵ فەرانسە بۆمیراتێە کونەکان لە گەڵ یەک رێک ئەکەون چەندە سەر لە خواریە وا ئاوا حکومەتی و یان کەسی دەسەڵاتداری خاکی ئێران یان بەر پرسی لە کوردستان هەڵ ئەکەوێت یان ئەو ئەرکە گرێنگانە بە چە کەس گەلێ نالایەق ئەسپێرن. و بێگانەکان و دز و دروزنەکان دەستگای گەنجیاب بێرن و بە مەیلی خۆیان حەفاری بکەن بێ ئەوەی وەهمی لە دڵیانا بێت چۆن دەستیان لەگەڵ حکومەتدا لە ناو کاسەیکە. بەڵام ئایا ئەمە غەێر لە ئەوەیە کە زڵمی لە ئێمە ئەچێت بۆ ئەوەیە بڕێک لە بەر خوشی خۆیان وگیرفانی خۆیان تەمەدون و پێشە وگەنجی وا بە شەو

نخونی و ڕەنجی پیشنیانی کورد سەربەرز کردنی میللەتەکەیّ لە داهاتودا بەگەلی کورد بسەلمێنین کە هوزەکانی کورد پێشکەوتو بوون تا چ بگاتە ئەوەیّ کە بە کاسیە کۆن یا سکەیَک دەیان لاپەڕەتر بە مێژووی روون ئەبێتەوە دەردیکی گرانە وا کەسیّ بەو ئەمانەتیانە خۆی دزو نامەحرەم بێت هەر خۆی بەر پرسی ئەوە بکەن مەتەڵی هەیەکە دەڵێن (گورگ نورەیّ رانتە) (گورک ئەگریا ئەویت ئەترسم وا نەبیّ) و هەر ئەو بەر پرسانە (ئەمانەت دارەکان پای دزەکانی بێگانە بە رو شوێنەوار کوونەکان ئەکردەوە کوردی هەژار لەم بارەیەشەوە تا تەوقی سەری لە قوڕ نیشتووە چۆن تەنیاکورد لەم بارەوە وجاخی رووشنە هیچ شوێنی کوردستان هەر لە دەشتە پانایيەکان کە شارحوکومەتبۆون جێگەیّ پێشە سازی تاکێوە بەرزەکان کە فێرگەیّ ئاپینی ئەشو زەرتوشتە بیّ ئاسەوار نیە بە داخەوە لەم باریشەوە گەلی کورد شاهیدی تاڵانی میراتی قەومی مێژووی خویەتی چ بە دزی و چ بە ئاشکرا تاڵانی کار بەدستانی ئاسەواری باستانی زیویە سەقز کە خوالخیشبو رەشید کەیخەسرەوی لە کتێبی دەورانی بیّ خەبەریّ نسکی ١ و ٢ سکاڵایّ دڵی خۆی دەزبریوە و شەنگی دز و دروزنەکانی ئەم خاک و نیشتمانەیّ خستوە سەر ئاو و لە راستیدا ئابڕوێکی بۆیان نەهێشتوە و هەمووی بە سەنەدەوە کە ئەوانە وا بەناو پێجووی چ غارەت و تاڵانیکی گەنج و زەڕ و زیوی خاکی کوردستانیان کردووە لە راستیدا چ زەبرێکی مێژوویان لە مێژووی کورددواە و ئەم ناکەسانە بە نیوی کارناس باستانشناسی جەنازە مومیایی و خنجەر و تەلا و موجەسمە و ... لە زیوە بە مائمورەکانی دیارکراوی ئیسرائیل ئەفرۆشن و گوڕی هوخشتەرە هەر ئەوسەردارە نەمرەکە بە دەستی

توانای حکومەتی ئاشووری بەزاند لە زیویەی سەقز پەیدا ئەکەن و ئەوانە جنازە کە ئەفروشن و ئێستا لە ئیتالیا هەیە ئاخ بۆ ئەم زڵمە گەورەیە وا بە میرات مێژووی کورد ئەچێت ئەویش رەنگە هەر دەستی دوژمنان گەلی کورد کە نایانەوێ بایەخی ئەم قەومە مێژوویە دەرکەوێت ڕەنگە دەستی لە کارا بێت.

ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان (١٩١٤ ـ ١٩١٨) یەکێک لە رۆوداوەکانی هەرە گرینگەکانی چارە نووسی و ئاڵو گوڕی گەلی کوردی تێدا بو چون کوردستانیش وەک بەشێکی گرینگ لە رۆژ هەڵاتی ناوەڕاست جێگای‌یکی دیاری لە شەڕی یەکەمدا هەبو روداوە ئەنخامەکانی شەڕ کاریکی گەورەیان کردە سەر ژیان بو دوارۆژی گەلی کورد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا تا ئێستا بە تەواوەتی روون نەکراوەتەوە وەک قوناغیکی تایبەتی لەکاریکی بەخودانە خراوەتە بەر چاو. شتیکی ئەوتو بە زمانی کوردی لە بارەی ئەم باسە گرینگەوە نەوتراوە مێژوونووسانی کورد ماموستایان ئەمین زەکی‌بەگ و رەفیق حەملی و حوسێن موکریانی تەنها باسی لایەک لەو دەرد و ئازاری و برسیەتی و گەلی کوردیان کردووە کە گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا توشی هات و بەرلەئەوە لەشکری رووسی لە ساڵەکانی ئەو شەڕەدا گەیشتوەتە هەموو ناوچەکانی کوردستان و لە هەمۆویاندا لەگەلی لەشکری ئوسمانیدا توشی شەڕ بوە.

یەکی لە نووسەرەکانی رووسی دەڵی ـ کە سوڵتان ئەبدوالحمید ویستی ئەرمەن و ئاشوریەکان لەنا وبەرێ لە کورد بەولاوە کەسی بو جێ بە جێ کردنی نیازەکانی و

ئارەزوکانی نە دوزیەوە.

ئەویش بە هوێ مەیلی سروشتی یانەوە یانێ کورد و شەڕو شورڕ بەم جورە شەڕیکی ئایینی لە نیوا نیاندا بەر پاکرد کە بوە هوێ کوشتارێکی گەورەی ئەوتو تا ئیستا لە وێژدانی ئەم نەتەوەیەدا دەنگی داوەتەوە سوڵتان ئەبدولحەمید بو نەجاتی خوێ بوو ئەم کارەساتە و هەرەشەێ خستە بەێن کورد ئەرمەن و کوردەکان بۆون بە چێوی دەستی سوڵتان بە داخە سەرکردە کوردەکانیش پێان وا بو کە هیچان بو نەهێشتوە تەوە کە سوڵتان باری قەڵایان پێ دەڵێ. لە شەڕی رەواندوز کە رووس ویستی داگیری بکات ئەرمەنە داخ لە دڵەکان ویستویانە توڵە بستێنن و لە بەر چاوی رووسەکانەوە کەوتنە گیانی دانیشتوانی رەواندوز و هەزاران پیاو و ژن ئافرەت . منداڵی کورد بونەتە قوربانی و زوربەیان بە گوللە نەکوژراون بە زەجر ئەشکنجە لەبەێن چوون.

ئایا سەروکە کوردەکان بە باری قەڵای سوڵتان خەڵات و بەراتیان پیێدرا ئایا ئەمانە وا خوێان بە سەرکەردە و دەم سپی کورد خوێان لە قەڵەم داوە چۆن بو دواجار رۆویان بوە بە دەستماڵ و ریشەوە بە جلی پیاوانەوە لە ناو ئەو خەڵکە خوێان پیشان بدەن چەن هەزار کوردیان لە خورایی دا بە کوشت.

ئەمەیە وا دەڵێن بەردێ وا نادان لە چاێ بی‌خات، هەزار دانا ناتوانن دەری بێنن.

کورد وا بەم چەشنە خوێ خستوەتە ناو کێشەێ شەڕ و توشی دەربەدەری بوە هەمووی تاوانی کوردی نەزان و مالک و ئاغا و کوێخاکان و کوردە دڵ سافەکان بوە وا بە ناو پیاوە ماقۆڵەکان حیسابیان دەکرت و ئیستا کوردی ئەم ئەسرە سزای ئەداتەوە.

بەداخەوە ئیستاش هەر برێک بەم جورە وا خۆیان لە کراسی چاکە نیشان ئەدەن پیان وایە کە خەڵک نازانێ رەنگە برێک کوردی دڵ ساف و سەرباری خەڵک بەرێزەوە بەوخائن‌نانە بڕوانی، بەڵام لە زاناکان و دڵ سوتاوەکان وا بو دنیای پێشکەوتوی گەلەکەیان تێ ئەکوشن بەقەد پەڕ کایێک نرخیان نیە. و لە بەر چاوی کوردە نیشتمان پەروەرەکان ئەو کەسانە بە پشیلەیٚ نان بە نرخ رۆژ خور ئەیانناسن.

ئەو دەورانە رویشت وا هەر کەس لە ناو گەلی کورددا لە لادێک و یان شاروچکەیێک دو دانە فەرش یان دو گاو پەزی لە هاوسیەکەی زیاتر بوایە ئەودەم سپی بو، و حوکمی پادشای ئەکرد بە سەر هەژاراندا و لە گەل پیاوە ژاندارمەکان دەستیان بە یەک ئەکرد و بە مژینی خوێنی کورد خۆی بە شێوەی گورگ در ئەهات ئیتر چاکیی بە کوفر ئەزانی. گەلی کورد لەوە بیر ئەکەنەوە بزانن کێ بویان دڵ ئەسوتێنێ بیر لەوە ناکەنەوە کە کوڕ کوێخا فڵان کەس یا شێخ فڵانی یان کام خانزادە بوە... کورد بە میزانی لە خۆ بوردن بۆ پێشکەوتوی گەل لە ئەو کەسە رێز ئەگرێ. دو رەنگ و چەورزوانەکان و هەروەها ئەوانە وا بە ئیمکاناتی ماڵیەوە شەخسیەتی پوچەڵیان بۆ خۆیان دروست کردوە لە داهاتوی نزیکدا ئەمانە پەتیان لە سەر ئاو ئەخەن و تەنیا دروزنەکان وا لافی پیاوەتی ئەدەن و لە حەیوان خوارترن رووڕەشیان بـۆ ئەمێنیتەوە کە وا بـۆ لـە گەڵ کاروانی زانین و پیشکەوتنی گەلی کـورد و بە گشتی زاناکان و بزوتنەوەی فەرهنگیان رێک نەختستوە مروڤ بەرەو زانین هەوڵ بدات تا لە چینی بێ خەبەران و گیاخوران و ریوی سفەتان حەشر و نەشر نەکرێ. راستی و چاکی ببێتە پیشەی ژیـان هەر کەسێ وا بە خوی

ملشۆری ناسەلمێنێ بۆ ماڵی دنیا. مەردانەیێ و ئازایەتی ئەکاتە سەرمەشقی ژیانی تا لە پاش مردنی ناوی چاکەی بمێنێ و خەڵک بە نەبوونی ئەو بزانێ چ ڕەولێکی بوە نەک بە زیندویش هەر وەک مردو بێت.

# «یاداشتەکان»

١ ـ بێ‌شک لاپەڕەی تاریک مێژووی ئێران بە بریقەی شمشێر کورد روون بووەتەوە کە وا بوو ئەگەر کورد نەبوایە لە خاکی ئێران ئێستا ئێرانی نەبوو لەت لەت بوو هەر بەشێکی بە دەم حوکومەتێ کەوە درا بوو کەچێ ئێستا کورد خۆی لەت‌لەتەوە بێ نەقشەی جوگرافی‌یە هوێ راستیەکەی ئەوەیە کورد دڵ ساف و بێ دەغڵ و غەڵ و غەشە جا ئایا ئەم سادە بوونە ئەبێ هەروا بێ یا بە جۆریەک ئاوژدەکرێ و لانی کەم سنوورەکان وا لە بەین خاکی کوردستان دانراوە بشێوێ و پاڵی بە خالی پاکی ئێرانەوە بدرێ تا کاتێ و بێگانەکان مێژووی ئێران ئەخوێننن بە کورد پێ نەکەنن بەڕاستی ئەم میللەتە جگە لەوەی حکومەتەکەیان داگیر کردوون بیر و مێشکیان لێ سەندون.

٢ ـ یەکی لە شانازی ئێرانیەکان بە پێ ناساندن مێژوو و داب و نەریتی ئەشو زەرتوشتە، ئەتوانین بڵێین هەم کورد بووە هەم لە خاکی کوردستان چاوی بە دنیا هەڵێناوە کتێبی ئاڤێستا بە زوانی هەورامی هاتووە و کراوە خەڵاتی ئەشو زەرتوشت. لێرەدا ماموستای نەمر قانع فەرموویەتی:

کتێبی زەرتوشت کە ئاڤیستایە
وەک باقی کتێب فەرمانی خوایە
بە زوان هەورامی هاتە سەر بەشەر
یانی های زەرتوشت بوو بە پەیغومبەر

* * *

٣ ـ کوردەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەو ڕادیە گەیشتن کە مافی کورد ئەبێ گرتن بێ. نەک داتن. چۆن چەند جار وڵاتە دەسەڵاتدارەکان، بۆ گەیشتن بە ئامانج و قازانجی خۆیان ویستیان مافی ڕەوای کورد بە وڵاتە داگیرکەرەکان بسەلمێنن ئەوانیش ناچار بۆون دان بەوە بنێن بەڵام لە ژێرەوە بە نەوت و بارمتەیّ زۆر توانییان ئەو حەقخوازیە بە پێچەوانە بکەن بە ناحەق، کوردەکانیش بۆیان دەرکەوت کە دەبێ خاک و وڵاتی خۆیان لە چەنگ بێگانە ڕزگار بکەن بەڵام هیچ حکومەتی نایەوێت کە کورد سەر بە خوو بێت چۆن هەر ساڵ بووەتە چێو دەستی بڕێک لە دەوڵەتە خاوەن دەسەڵاتدارەکان لە ناوچەیّ ڕۆژ هەڵاتی ناوە ڕاست. بە واتای ئەمڕۆ: چەکوشی تەئادوڵ. بۆیان روون و ئاشکرایە کە

کوردیان بۆ ئاژاوه و له ئاوی لێڵ ماسی بگرن. به رواڵەت دڵسوزی کوردن بەڵام مێژووی گەلی کورد خەیانەت و زەرەر و زیانی زۆر لەم دوو رەنگ و چەور زوانانەی پێ گەیشتووه.

٤ ـ له مێژوودا به هوێ نالایەقی و ناقبیلی حکومەتەداگیرکەرەکانەوه زۆربەی ئاسەوارەکۆنەکان و باستانیەکان رووخێنران و ئەنتیکەکان دزران و بەتاڵان چوون، له لایەن حکومەته کانیش رەنگه خۆیان پیان خوش بو بێت چونکه نەیانویستیوه که فەرهەنگی گەلی کورد و تەمەدونەکانی و ئەو کاسیه نەخشینەکان و تەلا و نوقره ... که به شتانەوەده یان کتێب مێژوو کورد به کتێبه مێژوویانه زیاتر که پییان ناخۆش بوو رەق و کینەیان لێی بوو و موزەخانەکانی دەرەوه له وڵاته ئەجنەبیەکان به موجەسەمه و شمشێر و دەیان پەیکەر و گەنج ئێران رازاوەتەوه و به ڕاستی تراژدی بێ هاوتایە که لەم بابەتیشەوه توش مێژوو کورد بوه بوو هەر کوردی دڵسوز جێگەیێ ئاخ و داخه بویە برێک له نووسەره بێگانەکان له بەر ئەوێ که هیچ بەڵگەو سەنەدێکیان به دەستەوه نەبووه له ئاوی لێڵ ماسیان گردوه و به گەلی کورد دەڵیت قەومی بیابانی و وەحشی و بێبەش له فەرهەنگ و تەمەدونی به قەڵەم ئەدەن. ئەمەش یەکی تر له بێ کەسیەکانی گەلی کوردە.

٥ـ ئەگەر چی له برێک شێوندا چتگەلی وەک دەستبەندو قەڵخان و شمشێر وکەل و پەل له خاکی کوردستان دوزراوەتەوه بەڵام ئەمانه له بەر ئەوەێ که له کورد پسپور و کۆنەناسی کەم بووه ئەوانیشیان به حیسابێ هەخامەنیشیەکان یا ئەشکانیەکان و یان بێ ئەوەێ ئاشێره به قەومه پێشویەکانی گەلی کورد بکرێ به قەڵەم دراوه.

۶ـ یەکی لە سیاستەکانی داگیرکەرەکانی کوردستان ئەوەیە دایم بووگەلی کورد تومی نیفاق و جیاوازی بخەنە نێوان کوردەکان و ناوچەکانی کە بەم پیلانە بو سەر گەرم کردنی کورد بە گژ یەکداداوە تا بیرلە سەر خۆی نەکەنەوە.

۷ ـ مینورسکی نووسەر کتێبی کورد لە پەێجویی کوردەکان دەڵێ: بە بیرو ڕای من لە نێوان تەواوی نەتەوەکانی جیهان قەومی تر وەک گەلی کوردم نەدیوەکە لە ئاوازە وگورانی بە ئیحساسی دڵ شکاویان و ئیحساسی گوناهباری لە دەرگای خودا و یان شکایەت لەجیا بونەوە تێدا بێت، ئەگەر کەسێ وا کەوتوەتە بەر گێژولولی ڕۆژگار و چەرخی ڕۆژگار هارپویە بوو تەسەلی‌دان بە روحی خۆی گوێ لە گورانی کوردی بگرێ.

۸ ـ ئەگەر گەلی کورد بەبۆنەیّ چەندانە شێخی کورد وەک شێخ ئوبیەوڵلاو شێخ مەحمود و شێخ سەئید و شێخ بارزان نەبوایایە لە بەرێزی ئەوان کە تەواوی ژیانی خۆیان بوو رزگاری گەلی کورد تەرخان‌دا تا مردن دەستیان لە خەبات بو رزگاری کورد کەم تەرخەمیان نەکرد. ئەوانەیّ وا بوو رزگاری کورد ئاواتیان هەیەو دڵ بە کوڵ و جوشن لە کاتێ ناو هاوردن شێخ لە هەر شوێنێک بێت ئەگەر هیچیان بۆو نکرێت ئەو جێگا تەرک ئەکەن چۆن برێک لە شێخەکان ماوێیک دورو و درێژ گەلی کوردیان بە حەی و نەی و سوفی‌گەری ، شیشەخواردن، سەرگەرم کرد و بێری سیاسی و سەر بە خۆیان لە مێشکیان لابرد بویە تا ئێستاش هەر ژێردەستن. خۆیانیش لە ریگایّ حەقیقی دین ئیسلامیش دور بونەوە و پالێان بە تەریقەت داووە شەریعەتیان لە بیرچووەتەوە و ئێستاش ئەگەر کەسێک بڵی هیچ کەس غەیب نازانێ جگە لە خودای گەورە بە هاوردنی ئایەتی قورئان ئیسباتیش

بکەیت کە بڵێت ڕیگای دینی ئیسلام ئەبێ لە خوێندن و تێگەیشتن لە مانای قورئانی پیرۆز فێر بێت، دەروێشەکان بە خنجەر و زەرگ پەلاماری بو ئەبەن.

۹ ـ برێک لە مەلا ئائینەکانی کوردیش لەم بارەوە بێ تەقسیر نین و نەبۆون چۆن گەلی کورد زۆر بە قەولیان ئەکەن و حیسابیان لێ ئەوەن. جا ئەگەر برێک لە مەلاکانی کورد لە بارەی وەتەن خوشەویستی و رزگاری و دژی ژێردەستی و کویلەتی و هەروەها لە مێژووی کورد باس بکەن بێ گومان ئێستا گەلی کورد لە مێژەوە رزگار بوو چۆن لە کوردستان نەخوێندەوار زۆرە و یان خوێندەوار بێ بەڵام لە مێژووی کورد بێ خەبەرن و باشترین جێگا هەر مزگەوت و شوێنەکانی واکومەڵی بوو موناسبەتی وەک تازیەباری و یان ئەو شوینەنانە وا بوو مولودی و مانگی رەمەزان و ... خەڵک زۆر کو ئەبێتەوە و مەلاکانیش هەلی زۆریان بوو هەڵ ئەکەوێ جا ئەگەر بیانەوی لە شۆنێکدا تەنیا پێنج دەقیقە لەبارەێ سیاسیەوە باس بکەن کاری زۆر ئەکات و زۆرتر گەلی کورد بە حەقی خۆی ئەگات بەداخەوە نەک وایش ناکەن زۆربەێ باسەکەیان بە ئەرە بی دوپات ئەکەنەوە کە گەلی کورد لە جیاتی کورد بێت بە ئەرەب ئەبێت!!!

۱۰ ـ بەداخەوە برِی ناکورد بە پارە و بە دەست و رِەنجی کورد و ماڵیات و ... ئەبن بە کارمەند ئیداریی یان ئەبن بە دوکتور و موهەندیس ... لە دواجارداکەمترین بایەخێک بوو کورد دانانن و کەسایەتیکی درووکازب لە خۆیان درووست ئەکەن تا خۆیان بە پێشکەوتوو و با تەمەدوون بە خەڵک بسمەلمێنن کە زانایمان لە ئێوە چینە هەژرارەکان فرەترە بەداخەوە لەم لایشەوە برێک کوردی دڵ ساف و سادە زۆرلیان ئەژنەفن و بە

قسەیان ئەکەن و حیسابیشیان لێ ئەبەن. و یان ئەگەر کارەکەیان لە ژێر دەستی ئەو نەزانە وا بە ناو زانا بەڵام ناپیاوەتی دزی و دەیان کردەوێ نامروڤانە بە پای کورد تەواوی ئەکەن. باش وایە لێرەدا حیسابێ ئەو ناکوردانە کە وا لە سەرەوە لێان دووواین لە کوردی زاناو خاوەنی ئیمان بیرو باوڕێ کوردانە جیا بکێنەوە ئەوانەوا بەم چەشنە ژیانی ناموبارەکیان ئەبورن و تەنیا پوڵ و پارە و ئاسایش و خوشی نەبێت هێچی‌تر بویان بایەخی نیە ئەم لەخۆ بێ‌خەبەرەانە لە ناوی کوردی خاوەن بیرو باوڕی نیشتمانپەروەردا بێ بایەخ‌ترین کەسن مایەێ نەنگی کوردن چۆن بەم چەشنە خەڵکی دڵ ساف پاک‌داوێنی کورد لە سەربەخۆی کورد و هەروەها دەسەڵات‌داری کورد بێزار ئەکەن ئەوانیش لە زالو خرابتر بوو و میللەتی کورد زەرەریان هەیەوبائیس دڵ ساردی لە هەستی کوردایەتی ئەبێت. تەنیا ریگەێ ئەم تاقمە کەسانە وابەم چەشنە بونەتە سەرباری کورد ئەوەیە کە لە نیو خەڵک شەنگیان لە سەر ئاو بخرێت و بێ‌بایەخ و هیچ ریزیک بویان دانەنێن تا بزانن گەلی کورد ئەوەندە سادە نیە کە هەر گەندوڵەیک وەک ئەوانە بە سەریا خونمای و مانوڕی فەرهەنگ ئەقل‌داری بدات. ئەوانیش بیرلەوەێ بکەنەوە بێنە سەر ئەقلی ڕاستەقینە لە جیاتی دەمار فروشتن و دەسەسەری کردن، بە ئەرکی سەر شانی خۆی بزانێ کە خزمەت کردن لە پێناوی نیشتمانپەروەریدا بە شانازی بزانێ لە خۆی مایە دا بنێت بو گەلو هوزی رەنج بکێشێ تا ژیان نامەی وەک گیاخوەرەکان نەنووسرێت.

١١ ـ تەنیا کوردی قسە کردن و کوردی پوشین نیشانەێ کورد بۆون نیە. کوردایەتی ئەبێ ئامانج و قازانجی میللەتی بێت. چۆن گەلی کورد زۆر زڵم و کردەوەێ نامرۆڤانەێ

لە بێگانەکان دیووە ئێتر سزاوار نیە دیسان لە کوردیش مولّوزم بویّ پەیدا بێت. ئەرکی سەر شانی هەر کوردی پاک و بێ گەردی بێت هەر کاتی‌وا پیویست بە یارمەتی بو وەک شمشێری میسری لە کێلان نەویستێ و کورد بوونی خۆی نیشان بدات و سەرو ماڵ قابیل نەزانێ بوو سەربەرزی گەلی کورد دایم خەمی کوردی لە بیربێت و تەنیا ئاواتی گەورەێ ڕزگاری تەواوی میللەتەکەی بێت خۆی بە ئێرانی تەواو بزانێت نەک ئێراق یان تورکیای و سوریای و ...بزانێت لە هیچ شوێن کومەڵێک دا کات و ساتی خۆی بە خوخەڵافەێ نەبوێری و لە هەر هەلێکدا لە بەسەرهاتی ئێستا و دووا رۆژی کورد باس بکات و دەرو بەری خۆی لە باری چۆنیەتی بەرەو رزگاری تێ بگەیێنێ و لە جلی کوردایەیتی ئابرو و شەرەفی کورد خاڵدار نەکات و کردەوە و ڕەفتاری جورێک بێت کە دەرو بەری بە ڕەوو کورد پەروەری سەرەنجیان ڕا بکێشن.

۱۲ ـ خاک و سەرزەوینی کوردستان بە تەواوی ئەوندە پێنج کیشوەر ئەرەبێ ئەبێت. جا لێرەدا جێگەێ سەرسوڕمانە کە چۆن نزیکەی چل ملوێن کورد و هەر لە سەرەتای مێژوودا لەگەڵ نەتەوەێ ئادەمیزاد ناوی کورد و میللەتی کورد بووە وچەرخی لە چەمەر بریوە ئێستا چۆن لەت‌لەت فوارە بێت. ئەم کارە ناشایستە لە دەورەی شاسەفەویەکاندا سەرزەوێنی ئێران لەت لەت بووە بە تایبەت کوردستان دابەش کرا و یان لە سەر نەخشەی جوگرافیا ناوی نەبێت لە کاتیکدا وڵاتە دەرهاوسیەکانی کوردستان هەر کیشوەریک ئەوەندێ دانەێ لە پاریزگاکانی کوردستان پانای و خەڵکی بێت ئەوان سەر بەخوبن. نەتەوە یەکگردوەکانی ئوروپا چۆن شەرمسار نابن کە گەلی کورد بە میللەتی ژێردەست

وڵاتەکان و ئەقەلییەت و کەم نفوز دای ئەنین.

دوکتور مەشکور لە جوگرافیای ئێران باستان لاپەڕەیٚ ٩٧ دەڵی کە لە دەوری ئاشوریەکان قەومێک بە ناوی زیکیرتو لە پارسوا (وڵاتی پارس) ژیواری ئەکرد و ئەم قەومە لە تایفەیٚ پارسەکان نەبۆون و زۆرتر نزیکایەتی نەژادیان لە کوردەکان ئەمرۆژن بەڵام لە وڵاتی پارس‌دا بوون. ئەم قەومە لە مادەکان بۆون و یارمەتی دەری مادەکان بۆون لە دژی داگیرکەران یانی سەکایەکان ئاشوریەکان هەڵویستان کرد تا لە کوتای‌دا ئەو دوو داگیرکەرە سەکایەکان و ئاشوریەکان شکست‌یان خوارد.

بە بیروڕای من ئەم قەومە ئێستا دانیشتوانی شارەکانی گیلان و مازندەرانن کە زۆربەیٚ زمان ناسەکان دەڵێن (مادزادەکان) بووە و ئێستا بە شێوەیٚ مازندەران دەر هاتووە بە پەی گوڕانکاری زوان و تێ‌پەڕ بونی دەورانەکانەوە گوڕراوە.

ئانزان بە بیرو ڕای زۆربەیٚ مێژوونووسان پاشماوەی گوتیەکان و هاونەژادی کاسیەکان بۆون کاتیٚ کە شوش بو جاری دوهەم ئاوەدان بوەتەوە حکومەتی لەوی بووە بە ناوی ئانزان و هیشتا روون نیە کە ئەم حکومەتەنیوی شای ئەو وڵاتە بێت یان نێوی ئەوحکومەتە کە ئانزانی بو بێت دیسان مەشکور ئەو حکومەتەیٚ بە ڕەش پیسەکان ناو بردوە دوکتور مەشکور لە لاپەڕەیٚ ١٠٥ بە شک و گومان بنەچەیٚ مادەکان ئەیانباتە سەر کاسیەکان لە کاتێکدادەیان مێژوونووسی خاوەن رای دەڵین بیٚ شک مادەکان پاشماوی کاسیەکان ئەزانن و چۆن کاسیەکان لە غەربیٚ وڵاتی ئێران لە زەنجیرەکێوەکانی زاگروس ژیاون حوکومەتیان کردوە، و پاش روخاندنی حکومەتەکەیان خەڵکەکەی، خۆ بە

زەوین‌دا نەتواونەتەوە (نەتاویاونەتەوە بەزوین‌دا) بێ شک ئەو نەتەوە هەر لە وڵاتی خۆیان (کاسی) ماوەتەوە و مادەکانیش لە ئەو نەتەوەن لە کاتێ دەسەڵات‌داری مادەکان لە ئێران زوبانی مادی تاڕادێک ڕەونەقی پەیدا کردەوە کە بوەوتە زوبانی ڕەسمی ئێران و لەق و پوی تاهیندو و یونانیش چووە بە بونەیْ شارەزا بوونی مادەکان بوو کشت و کاڵ و پەروەردەی حەیواناتی ئەهلی لە سەردەمی مادەکان تۆش قاتی و قڕی نەبووە بڕێک جار دەرهاوسیەکانی وڵاتی ماد بوو بازرگانی کەل پەلی ژیان لە گەڵ ماددا زیاتر لە وڵاتانی‌تر بەرەو وڵاتی ماد هات شویان ئەکرد.

١٣ -بە بیڕ و رای ئەوانەی وا لە دورەوە بە سەر هات و چارەنووسی داهاتووی کورد شوێن و چاوە دیڕی ئەکەن چەن جور بیرو رایان هەیەبوو کورد و کوردستان و هەروەها ترسیْ کە کورد بەرەو نەمان ئەچێت یان بڕێک دەڵێن رزگاری کورد سەربەخویی نزیکە و ئەم دو دەستە مەترسیان لە پاش رزگاری کوردستان هەیەکە رزگاری کوردستان دواجار بکەوێتە دەستی نامەحرەمان و تاقمێک چەور زبان و ڕیاکار و دوو ڕەنگ کە لە هیچ دەور و رۆژگاریدا ئاهیکشیان بوو کورد هەڵ نەکێشا بێت بینە خاوەنی کوردستان یان لە ناو کورد ڕەخنە بکەن و دیسان کوردستان لەدەستی دڵسوزان دەربچێت ئەمجارە بە دەستی بڕێک گیرفان پڕکەر بسورێت ئەمە ئەبێتە ئەوەیْ کە منداڵی نەبووە لانکی بوو دروست ئەکات بەڵام ئەوان دەلێن: نە بەر لە باران بارێن ئەبێ بەر تکە باران بگرێت شایەد ئەمانیش ڕاست بڵێن. چۆن زۆر کەس بە نرخی ڕۆژ نانئەخوات بەڵام ئایا کورد هێشتا ماویەتی سزای ئەم جورە کەسانە بکێشت بڕوا ناکریْ چۆن ئەم گیرفان پڕکەرانە دایم لە بیری

خۆیانن و هیچ شنەو سوزی کوردایەتی لە دەماخیان نەیداوە و ئەبێ هەر ئەو کەسانە وا دەیان ساڵە و یان سەدان ساڵە بنە ماڵەیّ لە رێگای کورد و کوردستان جەور و سەردی و سوڵی و هەروەها دەربەدەری و کوشتنی برا و باوکو و منداڵی ساوای کە لە بوردمان بووتە خوڵە مێش تا چ بگات بەو بنەماڵانە وا جگەرگوشەکانیان پاش ۱۰ تا ۲۰ ساڵ لە بەرگوللە و تووپ و ... دوژمن بەئسی جەنگیان کردووە کوردستانی ڕزگار کرا و ئە بێ ئەوانە لە ناوی حکومەتی کوردستاندا جێگەیان بێت چۆن بە خوێن ئازیزانی ئەوان سەندراوەتەوە بویّان ئەزیزە نەک ئەوانەی وا لە دوری‌شەوە دەستیان بە ئاگری ماڵە سوتاوەکانیش نەکردووە چارەنووسی داهاتوی میللەت ئەوان دیاری بکەن بە قەوڵی کورد وتەنی خوو دەستی پێوە نەسوتاوە. و بەڕاستی ئەو جورە کوردە بزگیرانە جیگەیّ مەترسین کە خۆیان چاک بە قەڵەم ئەدەن زۆربەیّان خانزادە و بەگزادە کە بوو هەلی وا ئەگەڕن جا ئێستا ڕیگای رزگاری کوردستان.

بیر و رای کوردی راستەقینە ئەگەرچی لە سەرەتای لەت‌لەت بوونی کوردستانەوە تا ئێستا بوو هیچ ساتی و کاتێ کورد ناموی لە خاکی خۆی بە لەشی نیوی چاوانی خۆیان زانیوە و پشتاوپشت تەنیا رۆژێک شمشێریان نەکردووەتە کێلان بەداخەوە هەر لەو سەردەمەدا تاکو ئیمڕو هێندێ کورد کە بونتە کەند و کوسپ بو کورد کە بە قەوڵی پێشنیان وەک (یابوەکەی شێرکە) کاتێ کە توپێ بووە هوێ ژێر کردنی چەندانە بەرخ کە لە دەورو بەری خۆی بووە، ئەم تاقمە کوردانە جاریکش لە بەر خویّانەوە ئاهیکش بوو کورد هەڵ نەکێشاو و (لە هەر لایێک بایێ بێت شەن ئەکەن) و لە شوێن کار و کاسبی خۆیانن.

ئەوانەی وا خەبات ئەکەن و توشی هەزاران کێشەیٚ سەخت ئەبن گەندەڵە کوردەکان لە قاقای پیکەنین ناکەون و بیٚ‌خەیاڵن جا من دەڵێم ئەم تاقمە بریار تەیموری شەڵ بوێان زیندوو بوایاتەوە کە بەڕاستی ئەویش زوربەی ئەو کەسانە وا ئەکوشت بەر لەوە لێان پرسیاری ئەکرد لەم کومەڵەدا چیٚ نەقشی و ئەرکی پیویستی ژیانی رۆژانە و مرۆڤانەکان بە ئەستووە گردووە پیٚشەو کاری ئیٚوە چیە.

ئەوانیش لە وڵامدا بە گریانەوە دەیان گوت وەڵلا لەماڵ خۆمان لە گەڵ منداڵ و خیٚزان خۆمان بیٚ زەرەر و بیٚ زیان بوو خۆمان ژیان ئەکەین، تەیموریش لە وڵامدا وتویە کە ئەمە لە گەڵ حەیٚوان چ جیاوازیٚکی هەیەئیٚوە تەنیا نان خوەری سادەن و بگرە زەرەرتانیش بوو کومەڵ زۆرە چۆن ئیٚوە لە بەین بەری خواردەمەنیەکانی پیویستی ژیانی مروڤە راستەقینەکانن و لە بەیٚن بەری پیویستەکانی ژیانن کەوا بو ئیٚوە لەم دنیادا زیادەن باشتر وایە نەمیٚنن چۆن هیچ نەقشیٚکتان لە کومەڵدا نیە جا ئایا ئەمڕۆ لەم کوردستانی پان و بەرینەدا خوتان بین بە قازی هەر دەورو بەر خوتان بڕوانن ئایا نەبونەتە هویٚ دواکەوتن و سەرباری کورد. و چەند بی لایەق و ناشایستن کە باسم کرد هیوا دارم خوینەرنە نەیی‌کات ڕەخنە و لومە گلەیی و هەروەها ... ببیٚتە ویرد سەر زوانی لاینگرانی فەرهەنگ بەگشتی چینی خاوەن بیٚرو باوەڕ من تەنیا باسەکەی ئەوم دوپات کردوەتەوە ئەلبەت لە باقی لە وڵاتەکانی‌تری جیهانی سیهەم زیاتر لە هەشتاد لە سەد خەڵکی گەلانی جیهانی سیهەم هەر لە هەژاری‌دا ئەژین کورد ڕەنگە زیاتر لەوان لە حەق و ماف خورایی تی گەیشتوبن. بەڵام ئەم تاقمە خەڵکە تەنیا لە دوورەوە شاهیدی ئەم کارە ساتەن و کەم

تەرخەمن بو لەخوبوردن.

بۆ رزگاری جا بیر و رای هێندێ له رۆشن بیرانی کورد لەبارەێ رزگاری میللەتەوە ئەگەر زاناکانی کورد واله نزیکەوە هەر یەکی بە شێوەیەک هەوڵ و تەقە لائەدەن بە دو بە شەوە بن بە سەد لە سەد چل و پێنج لە سەد ئەم روشن بیرانە لە سەر ئەو باوەڕن کە بەر لە هەمووێ کاری و بە پەنامەکی ئەبێت لە رێگای فەرهەنگەوە تەواوی خەڵکی کوردستان لە ژن و پیاو پیرو جوان بیر و مێشکیان لە مافی رەوای گەلی کورد تێ بگەیێنن و یەکی لەم هوە کە ئەم تاقمە روشن بیرانە هەیانە کە بوو نموونە دەڵێن پاش نزیکەێ دوسەد ساڵ خەبات لە پارچەکانی کوردستان زۆربەێ لە خەڵکی ناوچەکانی کوردستان هێشتا پاش ئەو هەموو ک.شت و کوشتارەوە یا تاڵان و ماڵ وێرانیە کە بە سەر کورددا هاتوە کە چێ برێک لە ناوچەکانی تری کوردستان بێ خەیاڵ و دەڵێ بەکوردەکانی ئێراق وایان کردووە بە ئێمە چی؟!

یان لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا ئەو هەموو شەڕو شوڕانە ئەبێت برێک لە ئێران و کوردەکانی ناوچەێ ئەردەڵان پێان وایە ئەوانە تورکیایین؟؟!! و نازانن لە ئەسڵدا ئێرانی بوون. ئەڵبەت لێرەدا ئەم تاقمە هەر لەو کەسانەن کە لە پێشدا باسمان کرد و هیچ بۆنی زانیارێک لە مێشکیان نەیداوە جگە لە بێ هەستوو بێ ئوسولی جوگرافیای کوردستانیش نازانن و پێان وایە تەنیا کورد لە ئێران و ئێراق هەیە ئەویش لێی بپرسێ چۆن دەزانێ دەڵی وەڵلا بیستومە کە لە تورکیایش کورد هەیە!! و دیسان رۆشن بیرانی گەلی کورد وا لە نیزیکەوە خۆیان شاهیدی بەسەرهاتی کورد و یان لەو بەسەرهاتەدا خۆیان

دەخیل بۆون لە سەر ئەو باوەڕەنین لەرێگای چەکداریەوە دەست بە خەبات بکری ئەبێ مێشک موسەلەح بێت چۆن زۆربەی ئەوانەیوا دەستیان داوە بەچەکەوە مێشکیان پووچەڵ بوە و تەنیا هەستی ئیحساس وای لێیان کردووە کە چێ پاش ماوەیەک چۆن دەستیان موسەلەح بوە و مێشکیان پوچەڵ ماندوو بۆون و خۆیان بە حکومەت تەسلیم کردووە و بونتە هوێ ئەوەش کە تەواوی رازە نهینەکانی ئەو رێکخراوە بوو حکومەت دەربخات و زۆر جار لەم بابەتەوە گەلی کورد توشی زەرەری گیانی و چەرمە سەری بوە کە من یەکی خۆم لە دوبارەکردن، و یان نووسینی ئاجزم. دوا جار ئەوانەێ و ماندو بۆون لە چەکیان چۆن بە ئیمان و باوەڕ و لە ریگەی خەبات چەکدارانەوە دەستیان بەوکارە نەداوە دوا جار پاش ماوەیەک هاتوەتەوە و بوەتە پیاوی حکومەت لە ئێراق و کارمەندی ئێستخبارات و بوەتە دژی گەلی کورد و دیسان بزوتنەوەی کورد لەم بارەوە زەرەر و زیانی زۆری پێ گەێشتوە.

ئەگەر گەلی کورد هەموویان تا رادەیەک لە بارەی مێژووی کورد و هەروەها ناسینی راسیتەقینەێ میللەتی کورد بە هەر شێوەیەک کوردستانی ئێراق روو بدت ئەو ساڵە سەر تا سەر کوردستان هەر کەسێک بە شیوەیەک لانی کەم لاێنگری خۆی دەرئەخات و پنجاە و پێنج لە سەد ئەو کوردە ڕۆشنبیرانە دەڵێن چۆن کوردستان بگری سەخت دژوارە چۆن لە هەر پارچەێ کوردستانی تورکیا و ئێراق بە هوێ خەفەخانی و نەبونی ئازادی جا ئەم کارە چۆن ئەکرێت ئەبێت شان بە شانی شەڕئەو کارە فەرهەنگیە بکرێ و بە شێوەێ پەنامەکی خەڵک لە هوێ ڕاپەڕێنی چەکدارانە و ئەرکی سەر شانی ئەو خەڵکە بو

یارمەتی دان لە بزوتنەوەکە روون بکرێتەوە و ئەوکەسانەیٚ وا لە ئاوی لێل ماسی ئەگرن و ئەیانەوەیٚ ئاژاوە بەر پا بێت بو قازانجی ژیانی خۆیان ئەبیٚ ئەم کەسانە بیٚبایەخ بکرن وئەگەر بەقسە رانەهاتن و نەهاتنە هێلّی میللی بە هەر شێوەیٚ وەک بێگانە لەگەلیّانا رەفتار بکریٚ. ئەگینا ئەوانەیٚ وا جوان یا پیرن ئەگەر لە بیری گیرفانی خۆیانن بە شەو بە رۆژ هەر توزیکیش خەمی کوردیان لە دڵ بێت هەر ئەویش ئەبێتە هویٚ ئەوەکە بەرگری لە کورد فروشتن بە شێوەیٚ جوراوجور دەرمان نەخوشیەکەی چارە سەر ئەکرێت، لە خوڕای دەسن۔سەری نەکات. بو پڕ کردنی گیرفانی خۆی گەلی کورد لە مێژەوە دەستی بە خەباتی شۆڕشگێڕانە کردووە بۆ مافی رەوای خۆی بەڵام هێشتا نەیتوانیوە بە ئەم ئامانجە بگات ئێمەی کورد هێشتا زۆرمان ماوە کە لە ناو یەکدا یەکیەتیمان بێت لە بەر ئەوەیٚ کە لە سەرپای خۆمان نین لە زۆربەی پیویستەکانی خەبات ئایا تاکو ئێستا کورد ریبەریٚوای لێی هەڵ کەوتوە کە تەواوی کوردەکان ئەوکەسە بە رێبەری بزانن ئەم کارەش نیازی ئەو رێبەرە بوە بەڵام لە گەڵ رێبەرەکانی تەواوی کوردستان ریک نەکەووتون و ئێستا هەر رێبەری کورد خۆی بە رێبەری ئەوکوردانە وا لە هەر کیشوەری ئەژیت ئەزانیٚ ئەویش هەر بە خەیّانەت حیساب ئەکریٚ و با هەر پارچە پارچە بونی کوردستان تاوانی دەوڵەتەکانی ئینگلیز و رووس بزانن و ئیتر با هەر ئەوان بن تائێستا لە ناوچەکانی کوردستان تەفرە و تووناى دەس سکرتیرەکان کورد بن. کوردستان هاوسیٚ دیوار بە دیواری رووس و تورکەکان و ئێراقیەکان و ئەتوانین بڵین کە پردیٚ باش بووە لە بەرکینەیٚ رووسی لە گەڵ ئوسمانیەکان بەڵام رووس هیچ کات بو کوردەکان چاکیٚ نەدیٚ تەنیا بو

قازانج و هەڕەشە کردن لە ئێراق، تورکیا جار و بار چرای سوری بە ئەو حکومەتانە داوە هەر کام لەکوردە دڵسوز و نیشتمان پەروەرکان بە ئاکام گەیشتون لە سە ر ئەو باوەڕن کە هوێ سەر نەکەوتن و دامرکاندنی شوڕشەکانی کورد هوێ ئەسڵی دڵ سافی و خۆش باوەڕی ڕیبەرەکانی کورد بوەو یان نیفاق تەفرەقە نێوان کوردەکان هەر وەها کەم زانین لە سیاستەت و پاڵدان بە دوژمنەکانی کوردەوە بوە. گەلی کورد تەنیا برای ئێرانیەکان ئەبێ هومێدی بێت تا خۆیان لە دەست ئەرەب و کەماڵیستەکان رزگار بکەن و بێنەوە باوەشی دایکی مێژینەی خۆیان، ئێرانی ئازیز.

نموونەی کوردەکانی ئێراقن دوژمنانی کورد بە دوستی خوێان ئەزانن. کە چی خوێان کوردەکان بە شێوەێ فلستین لە خاک و زیدی خۆیان بێ بەش و بێ بەهرە کردووە ئیتر کوشتو بڕ دەربەدەری کوردەکان بە جێگەی خوێ، کوردەکانی تورکیا هەر بەو چەشنە کوردستانی تورکیاو ئێراق بۆ موئاملەێ سیاسی ئەویش نەبو پشتێوانی تەنیا بو قازانجی خۆی جار و بار لەگەڵ ئەم دو حکومەتە پێوەندی کڕین و فروشتن کەل و پەل بوە، و ئێستا ئاماژە بو دەردی دڵ برێک لە شائیرەکان بکەێن کە چۆن ئەم دڵسوتاوانە بو زید نیشتمان خۆیان خەم و ئاخیان لە دڵدا بوە چەندە ئاواتی رزگاری نەتەوەێ خۆیان لە دڵدا بوە و ئاواتی رزگاری نەتەوەکەێ خوێن لە دڵیاندا بوە و بەو ئاواتەوە سەریان ناوەتەوە.

لەم بارەیەوە:

## «ئەحمەدی خانی»

لە بارەی مێرد خاسی کوردان دەبێژی:

بەختێ مە ژ بۆ مەرە بیت یار
جارەک ببتن ژ خاب هوشیار
رابت مە ژی جهان پەناهەک
پەیدا ببتن مە پادشاهەک
دەردێ مە ببیتن ئەلاجێ
ئلمێ مە ببیتن رەواجێ
گەردێ هوبوو یا مە سەر فەرازک
ساحب کەرەمەک سوخەن نەوازیک
گەردێ بوو یامە پادشاهەک
لائیق بدی یا خودی کولاهەک
غالب نەدبوو ل سەر مە ئەڤ رووم
نەدبوو نە خەرابەیی ددەست بووم
مەحکوم ئەلە یهو و سەئالیک
مەغلووب و موتیعی تورک و تاجیک
ئە ماژ ئەزەل خودێ ئوساکر
ئەڤ رۆم و ئەجەم ل سەرمە را کر
نا موسەل حاکم و ئەمیران
تاوان چییە شائێرو فەقیران

هەرچێ برە شویری دەستی هێمەت
زەبت کر ژ خوە راب میری دەوڵەت
لەو را کو جهان وەکی ئەرووسە
وی حوکم ددەستێ شویری ڕووسە
ئەز مامە دحیکە تا خودێ دا
کورمانج د دەو لەتا دنێ‌دا
ئایا بچ وەجهی مانە مەحرووم
بیلجو ملە ژ بۆ جی بوونە مەحکوم
وان گرت ب شویر شەهرێ شوهرەت
تەسخیر کرن بێلادێ هێممەت
هەرمیرەکی وان ب بەزلی حاتەم
هەر مێرەکی وان ب ڕەزمێ ڕوستەم
بفکر ژ ئەرەب حەتتا ڤەگورجان
گورما نجییە بوویە شوبهی بورجان
ئەڤ ڕۆم ئەجەم بوان حسارن
کورمانج هەمی ل چار کنارن
هەر دوو تەرەفان قەبیلی کورمانج
بو تیری قەزا کرینە ئامانج

گویا کو سه‌ر حه‌دان کلیدن
هه‌ر تائیفه سه‌دده کی سه‌دیدن
ئه‌ڤ قولزوم رۆم و به‌حر تاجیک
هندی کوبکه‌ن خورووج و ته‌حریک
کورمانج دبن بخون مه‌له‌ته‌خ
وان ژێک ڤه‌د کن مسالی به‌رزه‌خ
ئه‌و خه‌تمه ژ بو قه‌بیلی ئه‌کراد
وان دانه ب شویر و هیمه‌تی داد
هندی ژ شو جائه‌تی غه‌یوورن
ئه‌و چه‌ند ژ مننه‌تێ نوفوورن
ئه‌ڤ غیێره‌ت و ئه‌ڤ ئولوڤێ هێمه‌ت
بوو مانعێ حه‌مل بارێ مننه‌ت
له‌و پێکڤه هه‌میشه بێ تفاقن
دائیم ب ته‌مه‌ررود و شقاقن
گه‌ردێ هه‌بوو یا مه ئتفاقه‌ک
ڤێکرا بکرا مه ئنقیاده‌ک
رووٚم و ئه‌ره‌ب و ئه‌جه‌م ته‌مامی
هه‌میان ژمه را دکر غولامی

تەکمیل دکر مە دین و دەولەت
تەحسیل دکر مە ئلم و حیکمەت
تەمییز دبۆون ژ هەڤ مەقالات
مومتاز دبۆون خودان کە مالات

✹ ✹ ✹

بە لای دڵ منەوە تائێستا هیچ شائیری وێنەی ماموستا قانع بو کورد دڵیان نەسوتاوە و خەمی کوردیان لە دڵدا زۆر بوە هەموو شائیرە کوردەکان بو کوردستان و کورد جەورو جەفا و ڕەنج زۆریان کێشاوە بەڵام ماموستا قانع کاتێ هەر شێعریکی وا لە وەسفی کوردستان نوسیوە مرۆڤ بێ شک لە خۆی شەرمسار ئەبێت کە ئەم کەڵە پیاوە چەندە ئیمان و باوەڕی بو کورد و کوردستان بوە و لە مێژووی کوردیش زۆر زانای بوە و مێژووی کوردی جلی شێعری لە بەر کردووە و هیچ کام لەو شێعرانە وا لە بارەی مێژووی کوردەوە نووسیوە لە گەڵ کتێبە مێژوویەکانی باوەڕپێ کراوەکاندا جیاوازی نیە لە ریگای کونەناسی و جوگرافی و ئەدەبی نەتەوە پێشوەیەکانی هەمووی ئەو شێعرانەی مێژوویە دەتوانین بلێن کە ماموستا قانع دەریای مێژووی کوردی لەناو گوزەڵە کو کردوەتەوە و ئەگەر ئەوگوزەڵە برژێ هەر وەک لافای دەریا ئالەمی ئەگرێتە بەر. و ئێستا نموونەیەک لە شێعرەکانی ماموستای نەمر قانع ـ ی ـ دڵ سوتاو نیشتمان پەروەر:

ئەی کوردی خەفەتبار و برێندار و پەرشیان

ئەی میللەتی بێ پشت و بە بێ یاوەرو ئوریان

کوردینە ئێتر خزمەتی ئەغیار هەتا کەی

شوێن کەوتنی بێگانەی خوێنخوار هەتا کەی

دڵ پاکی لە گەڵ ئەقرەبێ چزدار هەتا کەی

هەڵگرتن و ماچکردنی ڕەشمار هەتا کەی

کوردینە وەرن حاڵی ببەن زاری‌یو شینم

بوچ وا بەخەم و قوڕبە سەر و مات و حەزینم

ئەي کوردی ستەم دیدە هەتا کەی لە مەلالا

بێگانە لە سەر نێعمەتی تۆ وا جەلالا

ئەی کوردی جەفا دیدە بەسە قەیدی ئەسارەت

نادان بە کوتەک حاڵی ئەبێ دانا بە ئیشارەت

ئەی وەتەن ناو بردنت بو من یەقین شێتانەیە

شێرەکانت بو پارە ئەمڕۆ خادمی بێگانەیە

من کە پارەم نیە دوسەد کوشش بکەم ئەفسانەیە

ئەی وەتەن خەڵکی ئەڵێن پێم (قانع) دێوانەیە

هۆزی کورد یاخوا نەمێنم بو هەناسەێ سەردتان

بوخەم و ئاهی دەروون بو دڵەی پڕ دەردتان

کوانێ نەثرەی رۆستەمت؟ کوا بیژەنی بێ ترس و بیم

شێرەکانت مردن و - بێکارەکان ساغ و سەلیم

ئەێ وەتەن! یەئقوبێ تۆم و ... یۆسفم لێ گوم بوە

ئەیوەتەن بەدناوی توم و ئابروم بوتو چووە

کێ فروشتیتییە بە وەللە نانی خوێری خواردووە

رێش نامەردی درێژە - سادقە بە چکەی جووە

دوژمنانی بۆ چی بە ناحەق هەر خەریکی هاتو چوون

خو لە من چاکتر ئەزانی - ئەو لەگەڵ کورد بووک شوون

ناخەنە خۆیان دەچی بکەم؟ بێ حەیا و بێ ئابڕوون

بەچکە شێری نیشتمانم. شیرەزای شێرانی زوون

ئەی وەتەن پارە پەرەستی بوو کە ئیمەی کرد بە پەن

رۆژ هەڵات و رۆژ نشینت. تا نەمانوا لێ ئەدەن

لاوەکەم نووکی قەڵەم دڵ دوژمنی پێ هەڵدرە

گەر قەڵەم شیوەن نەکا، خەڵفە نەمامێکی زرە

٭ ٭ ٭

ئەی وەتەن تۆ خۆشی دڵم و هێزی ئەژنۆو باڵمی
تو چرایٚ ڕوناکی دەردی ژینی ترشی و تاڵمی
بێ درۆ تۆ تاجی فەخرو سێبەری ئیقباڵمی

✵ ✵ ✵

لە خەو هەستنن میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەمووتەئریخی ئالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە

✵ ✵ ✵

هەموو شائێرەکانی کورد هەتا گیانیان لە لەش بوە ئاواتو ئارەزویان سەرکەوتنی گەلەکەیان بوە و شەونوخونی و دەربەدەری و بەندیخانە و هەزاران چەرمەسەرێ بە سەریاندا هاتوە و شەو و ڕۆژ بیر و مێشکیان بۆ تێگەیشتنی میللەتەکەیان نەسرەوتوە و خەڵاتیشان تەنیا نەداری و نەبونی و هەژاری بوە. هیچ شائێرە کوردی نیشتمان پەروەر نابینرێ کە ژیانیکی خۆشی و حەسانەوەیکی بێ دەردیسەری بێت. ئیتر قەڵەم بەدەستانی کورد لە هەر بابەتێکەوە وا بوو میللەتەکەیان ڕەنج و جەفای زۆریان کێشاوە بە جێگەیٚ خۆی بە داخەوە زۆربەیٚ لە کوردی ئەمڕۆ لەم کارەساتە بێخەبەرن و تەنیا پارە دوستی نەبێت ئەویش لە ڕێگای دامرکاندنی دژی فەرهەنگ و داب و نەریتی کورد بەکاری دەهێنرێ. گەلی کورد کەم پارەداری بوە بۆ میللەتی کورد سەمەرەیٚ بێت تەنانەت بەو پارەوە سەر چاوکەی کوردی فەوتاندوە چۆن نەزان و چاو بەسراون کورد بوون بۆیان بایەخی نیە تەنیا پارە ئەناسیٚ ئەمەیش یەکێکە لە کەند و کۆسپەکانی گەلی کورد.

# فولکلور

١ ـ بەشی داب و نەریت.

٢ ـ زەماوەند و هەڵپەرکێ کوردی

٣ ـ بەشی لاواندنەوە و سەرە خۆشی.

٤ ـ دڵداری و ئەڤین.

٥ ـ گۆرانی.

٦ ـ گاڵتە و گەپ.

# بەشی داب و نەریت.

بەیت و باو و داب و نەریت هەروەها گورانی و بەستە و مەقام بە گشتی لە ژیانی کوردەواری داهەر لە سەرەتای مێژووی کوردەوە تا ئەمڕۆ شانبە شانی بە سەرهات و ژیانی کوردەواری دەوری باشی بووە و ئەم بەیت و باووە پێوەندی گیانی بە گیانی لە ژیانی کورددا هەبووە بۆیە ئەبێ بایەخی زۆربە فولکلۆری کوردی بدرێ. بە تایبەت گورانی کوردی بە شاخ و داخ و کەژ و کێو ـ زێد و نیشتمان و سروشت، خێرو خۆشی، هەروەها دەرد و ناخۆشی و دڵداری هەمۆویان لە چوار چێوەێ گورانیدا جێگەێ خۆیان کردۆتەوە بەزم و نەزمی بەسەرهاتی شەڕەکان تا کاری رۆژ انە هەموویان لە گورانی تایبەتی خۆیان جێگەێ خۆیان کردوەتەوە و جار وایەکە دەنگی گورانی کوردی کە بە شێوەێ نیشتمانی ئەوێژن، سەرەنجی بێگانەش بەرەو لاێ خۆی دەکێشی لە

کوردەواری‌دا هەر لە کاتی منداڵی کورد لە دایک ئەبێ تا دوارۆژی ژیانی ئاواز و بالوورە لەگەڵ ژیانی تێکەڵە، یانی کاتێ لە دایک بوونی بە لایەلایە و لە کاتێ جوانی تا پیری بە ئاوازەو گورانی جورراوجور ر لە کاتێ مردنی بە بالوورە بەدێ دەکرێ یانی کورد هەر لە دایک بووونی تا مردن دەنگ و ئاوازەی لێ نابڕێ کە وایە ئەبێ قوڵی هیمەت هەڵ ماڵێن تا ئەم بەیت و باوانە کە میراتی گەلی کوردە بە پشت گوێ نەخرێ، چۆن سەردەمێ ئەو باوە ئەگرێتەوبو یازدە تا دە هەزار ساڵ پێش کە ئایینی مێهر پەرەستی بوە و بویە ئاخیان بو هەڵ ئەکێشم مەبەستی من ئەوەیە کە یەکم ـ مێژووی ژیانی باب و باپیرانی خۆمان چۆن فەرهەنگی هەر میللەتی و زیندوی پێوەندی هەیەبە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو میللەتەوە ئەگەر ئەم داب و نەریتە ئێستا لە بیر بچێ رەنگە لە داهاتوودا نەزانین کە خۆمانیش کیین و چیین یان لە کام میللەتین و تا ژیانی چاکتر دەستمان کەوێ و بۆ هەر میللەتی پیویستە رابردووی میللەتەکەی خۆی بزانێ. ئەوەش بلێم کەئێمە ئێستا کە لە سەدەی بیستم‌دا ژیان وگوزەران ئەکەێن ئەمە نابێتە هوێ ئەوەکە حاشا لە رابردووی خۆمان بکەێن هەر وا کە ژاپون لە پێشەسازی ئەم چەرخەدا جیهانی سێمەمی بە جێ هێشتووە هێشتا داب و نەریتە دێرێنەکانی باپیرانیان نەخستوتە پشت گوێ ئەگەر ئەوان جێژنی چای‌خوران بەرپا ئەکەن کورد جێژنی (میهرەگانمان) هەیەکە باسی میهرپەرەستی کە ئایینی زۆر بەرزتر لە ئەوانەیە وەک ئەوان جێژنی باران و ... هەیەئێمەی کورد شەوی چلە و جێژنی نەورۆزمان هەیەکە ئەمانە هەمۆوی پڕ ناوەڕۆک‌تر لە جێژی ئەوانە.

بە داخەوە ئێمەی کورد تەنیا دەردی کاریمان ئەوەیە کە فەلسەفەی بڕێک لە داب و

نەریتە کوردیەکان نازانین بۆیە زۆربەیان لە بەین چوون و تەفرە و توونا بوون چەرمەسەری ژیانی کوردیش بووەتە هۆی ئەم لە خۆو بێ‌خەبەریە. بەیتی قارەمانی و بەیتی دڵداری یەکێکە لە بەشە کانی هەرە گرنگی فولکلۆری کوردی ئەگەرچی فولکلۆری کوردی و حەکایەت ئەفسانە و قسەیٚ نەستەق وگاڵتە وگەپ ـ ئەگرێتە خۆیەوە، بەڵام هەر کامیان ئەگەر بە شێوەیٚ ورد سەرەنجی بدەین چەند ئەوەندی ئەم کتێبە باسی تایبەتیان دەویٚ ، و شەی فولکلۆر کە لە کوردی‌دا بە کەلەپووری نەتەوایەتی ئەیناسن وێردی سەر زمان و وشەکانیش هەر بەشکین لە ئەدەبیٚ فولکلۆری کورد ی و کەم کەسی هەیەکە وا لە یەک لە فولکلۆری میللەتەکەی خۆی نەزانی و یان لە ژیانی رۆژانەدا بە کاری نەهێنریٚ بەتایبەت گەلی کورد هەر وەک باقی کارە ساتەکانی ژیانی ڕابردو لە کەلەپووری خویٚ‌دا زۆر دەوڵەمەندە و سەرەنجی قەڵەم بە دەستان و زاناکانی بێگانەیٚ بۆ لای خۆی راکێشاوە وەک ئەبوڤیان کە لەبارەی کەلەپوری زیاتر لە نەتەوەکانی جیهان لێ دواوە و دەڵیٚ کە گەلی کورد لە بەشی فولکلۆر خاوەنی سامانی‌نیکی گەورەن نەخوێندەوارەکانیش گیان و هەستی شاعێرانەیان هەیەو بە کەژو کێو و سوارچاکی و جوامێری و ئازایەتی ـ ژیانی ناسوری و بە سەرهاتی شەڕەکان هەمووی بە شێوەیٚ بەستەو مەقام و حەیران دایان هێناوە کە ئەگەر پەیجوی جوانی لێ بکریٚ زۆربەیان ئەچێتەوە سەر ئایینە کۆنەکانی ئێرانی تەنانەت رۆژ هەڵات ناسەکان بیرورایان وایە کە وڵاتە دراوسیەکان کوردستانی گەورە بەشی زۆری فولکلۆری کوردیان بە شێوەیٚ بەیتو و باو بۆ خۆیان داناوە بەڵام بنەڕەت و بناغەی لە ناو کوردا بووە و رووی داوە. بۆیە کورد ئەبیٚ بە رێزەوە بە کەلەپوورە

نەتەوایەتەکانمان بە شێوەیٚ ڕەسم و یاسا ئەبێ بە ڕێوە بیەین و بە ڕاستی ئەگەر کوردی کە بێ‌ئار تەشکی لە فولکلۆری خۆی حاشا بکات لە دوو حاڵەت بەدەر نیە یان بە شیری دایکی کورد گۆج نەکراوە یان پێناسی خۆی لێ ون بۆوە گومان لەوەدا نیە ئەگەر کوردی لانی کەم بە حەکایەت و ئەفسانە و گورانی کوردیەکان گوێ بگرێ بۆێ دەرئەکەوی کە ئەم کارە ساتە ئاموژگاری روون کردنەوە بەسەرهاتی و ڕووداوەکانی مێژووی هەزاران ساڵ پێش و زۆر نەهێنی لە مێژوو روون ئەکەنەوە و ئەتوانین بە جورەیٚ هۆشیاری لە جیهان نەزانی بە کاروانی هەوڵ وزانین و ئەزمونی دانین. بە بیروڕای هێندی لە مێژوونووسان و هەروەها فولکلۆر نووسان دەڵێن ئەفسانە لە یونانیەکانەوە دەستی پێ کردووە بەڵام سومریەکان پەرەیان پێ داوەو لێرەدا ئەبێ بڵێن کاتێ کە ئێران و تورانی بوون و لە هێرشی ئەفراسیاو شای توران بۆ ئێران هێرشی کرد تورانیەکان بۆ ماوەیەک نادیار لە ئێران ماونەوە و کتێبی ئەوەڵ ئاڤیستایان بردە توران و ئەگەر لە داستانەکان باش بزانین زۆربەیان لە خاکی ئێران کە لەو سەردەمە نەتەوەی کورد و زمانی کوردی ئاڤیستایی لە ئێران باوبووە و ئەگەڕێتەوە بۆ مێژووی دەهەزار ساڵەیٚ کورد. من لە سەر ئەو باوەڕەم کە زۆربەی ئەفسانەکانی یونانی داهێنەریان کورد بووە لەق و پوێ تا یونان و وڵاتە دراوسێەکانی کورد چووە بۆ نموونە داستانی دێو درنج کە هێزی خراپەیە لەگەڵ هێزی چاکە (مینوخرد) بەشەڕ هاتوون کە ئەمە هەر لە ئاڤیستا باسی کراوە کە کتێبی ئایینی زەرتوشت بووە و هەر واکە بوو هەمووان روون بۆوەتەوە زەرتوشت کورد بووە. لە ئەڤیستادا دێو (ئەنگەر مینو) و فریشتەیٚ چاکە ـ ش (سپنتا مینو) هاتووە کە لە بڕێک

باسی ئایینی زەرتوشت، دێو مەبەستی له هەوای نەفس مرۆڤ بووه که چێ به شێوەێ داستان هەر جاری به شێوەیەک دەرهاتووه و له ئەنجامدا به رووناکی دەروون که (شەید) بووه دێو پیلانی بەتاڵ بووەتەوه. له باسی زەرتوشت لەم کتێبه تا رادەیەک باسی کراوه، له ئەفسانه کوردیەکاندا هەر دێوو سیحر و و نێرەنگ له ئەنجامدا بەرو نەمان چووه و ئاش بەتاڵ بووه.

هیچ داستانی کوردی نیه که ئادەمیزاد چاکه له گەڵ مرۆڤه خراپەکان وا له سەردەمی خۆیاندا زاڵم بۆون له کاتێ دیلیدا چاکه له گەڵیان کراوه ئەمەش ئەوەمان بۆ ئەسه لمێنی ئه هەر چاکه لەم دونیادا بکەین داستانی خدری‌زیندوو و هیچ قەومێک وەکوو میللەتی کورد به شێوەێ فەلسەفەی ئادەمیزاد راهێنەری نەبووه.

ئەگەر ئەو داستانی خدر یان خزرزیندو و کوردی بگیرێتەوه له گەڵ ئایەتی قورئانی پیرۆز یەک ئەکەوێ که له سوورەی (کەهف) باسی کراوه.

کاتێ وا چیرۆکی کوردی له پیوەندی له گەڵ گیان لەبەراندا هەیەمرۆڤ سەری سورِ ئەمێنی که چۆن به واتای شاهنامه (رۆستەم حەوت خوانی) برِیوه و چۆن خۆی له گێژەڵاوی درِنده و چەرەنده پەرِاندوتەوه و چۆن لێرەدا دڵسوزی راستەقینەی دایک و باوک و یان دەسگیران دەر ئەخات و چۆن مەبەستی چاکه و سەلماندنی کاری له بیری مرۆڤ بمێنی با دژواریژ بێت بو دواجاری حەسانەوێ هەیه. بەرِاستی وێنەی ئەم چیرۆکانه زۆرن وەک بەختیار و بەدبەخت و کورِه کەچەڵ و کچه پادشا، بۆدەر هێنانی پاره و نانی منداڵ جل و بەرگ چۆن ئەم ئادەمیزاده هەڵودا و پەرِیوەی شاران ئەبێت و له

غەریبی شارەکان چۆن خۆی پێشان داوە و پاشان چۆن بەکۆڵی خەرج و بەرجی زۆر بە رووی سوورەوە دێتەوە. زۆربەی چیرۆک و داستانی کوردی لە جیاوازی و تەفرە و توونا بۆون و هەروەها بەزیی و رەحم رەوڵێکی تایبەت بە خۆ ئەگرێت و گوێگریش لە کاتێ بیستن داستانی کوردی لە تەفرە و نیفاق بێزار ئەبێت و لە سۆزی دەرۆنەوە رەحم بەزەیێ ئەجۆشێ لە کوتاییدا دەرس ئاموژگاری بە مرۆڤ ئەسڵمینی.

زۆربەی لە چیرۆک و داستان و ئەفسانەکوردیەکان ئەوە ئەگەێنن کە مرۆڤ ئەبێ سەردی و سوڵی رۆژگار بچێژێت و رەنج و تەقەلای زۆر بدات تا بە ئامانجی خۆی بگات و نا بێ لە هیچ کاتێکدا ناهومێدی بە دڵی خۆی رێگە بدات یەکی‌تر لە بو سەرنج راکێشانی بێگانە بۆ چیرۆکی کوردی ئەوەیەکە باس شەڕ و شوڕی دوو میللەت ئەکات و چۆنیەتی سەرکەوتن بە سەر زاڵم یان سوپای تاڵانگەر کە چۆن دواجار شکست ئەخوون، کە زۆربەیان لە شەڕەکانی کۆنەوە گیراوە بە شێوەێ داستان و ئەفسانە دەرهاتوون لە هەموو داستان و ئەفسانە و چیرۆکی کوردیدا زۆرتر لە قارەمانیەتی، ئازایەتی، دڵسوزی و هەڵوەدا بوون باس کراوە و زۆربەیان لەم بابەتانە ئەوەمان بۆ دەر ئەخات کە گەلی کورد پیاوی ئازا و نەبەزی زۆر خوش ئەوێت.

لە داستانە کوردیەکان هەموو لایەنەکانی ئەدەبێ و هەروەها رێز و حورمەت و کەلام شیرینی و حەیا و ئەدەب بە خۆیەوە گرتووە و لە هیچ داستانی کوردی یا ئەفسانە و چیرۆکی تێدا نابێنرێ کە ئەدەب و کەللام یان حەیا و شەرم ـ ی تیا بەرچاو نەگیرابێ ئەمەش ئەوەمان بۆ روون ئەکاوەتە کە گەلی کورد تاچ رادەیەک حورمەت شەرمێ تیا باوو

بووە وەک سەرتان نەیشێنم، چەپکی گوڵو چەپکی نەرگس ـ مەرگتان نەوێنم هەرگیزا هەرگیز کە لە کوتای داستانەکەوە دەبێژن. یان لە بەین داستانەکە دەڵێن چاوتان رۆژی خراب نەوێنی، یان خەێر ئێوە ئەێژم. وەرویٚ دوژمنتان بێت ـ من بیٚ ئەدەب نەوم لەلاتان لە بەر چۆنیەتی حەقایق داستانە کە ئەمانە لە بڕێک جاردا دەوتریٚ وەک کوشتنی پیرەژنەکە کە فەرهاد بە چ شێوەیٚ کوشتویە، بە گشتی لە هیچ چیرۆکی کوردیدا باس فەساد ئەخلاقی و بیٚ حەیایی و بیٚ شەرمی تیا نکراوە. لێرە ئەوەشمان بۆ روون ئەبێتەوە کە گەلی کورد هەر لە سەرەتای مێژووی خۆیەوە تاکوو ئەمڕۆ هیچ کاری دژ ئەرزش مرۆڤایەتی لە نێو کۆمەڵ، یان خێزانیدا باو نەبوە و زۆر شەڕافەت مەند و پاک داوێن بۆون، بۆیە لە ئەفسانەکانی کوردیدا ئەم جورە شتانە تێدا نیە بەڵام دڵداری و ئەڤین لە دەرۆنی هەر مرۆڤێکدا هەیە بەڵام لە نێو کورددا بە شێوەیٚ پاکی و راستەقینە بەڕێوە چووە و تارادەیەک ژن لە پاش مردنی پیاوی ئیتر مێردی نەکردووە چۆن تاڕادیەک خۆشی وێستووە کە پیٚ وا بووە هیچ کەسی ناتوانیٚ جێگای ئەو بگرێتەوە یان بە قەوڵی کورد وتەنی لە جێگەیٚ شابازان کوورکوورەوازان ـ یان کیٚ بمریٚ و بە کیٚ بێژن خۆت خۆش هەروەها لە پیاوانیش بووە کە پاش مردنی خێزان ئیتر ژنیان نەهێناوە و لێرەدا وێژدانی خوێنەران بە قازی بێت ئەبیٚ ئێمەی کورد کە ئاڵا هەڵگری هەموولایەنە کوردیەکانین ئەبیٚ نەهێڵێن کە ئەم داستانە و چیروک و ئەفسانە پڕناوەرۆکانە بفەوتیٚ هیچ کەم تەرخەمیێک نەکەین و بەش بە توانای خۆمان لە ماڵو دەر و دەشت وبە بیٚ خەبەران رابگەێنین کە لەم چەرخی بیستمە هیچ کام لە کردەوە و داب و نەریتە کوردیەکان دوا کەوتو و بیٚ پایە و

ئەساس نین داب و نەریتە کوردیەکان بە جورێ دارژاوەکە لە هەر دەورو رۆژگارێکدا بە کەڵک و سودە، گەلی کورد ئەوەندە ئەقڵی بڕیوەکە وەک تازە داستانەکەی‌دا هێنرابێت. هەرکات دوپاتی دەکەنەوە هەر بونی تازەیی بدات.

ئەگەر لە بارەێ پەندی پیشنیان باسی کورت بکەین چۆنکە ئەویش بەشێکە لە فولکلۆری کوردی. گەلی کورد هەموو بە سەرهاتەکانی خۆی کردوە بە پەندو دەرس بۆدوا رۆژی رۆڵەکانی خۆی و بەڕاستیش لە پەندی پیشنیان زۆر شتێ وا لە مەترسی و سەرسەری و خۆگوم کردن بە پەند و دەرس دارژاندوەکە ئەمڕۆ بە شێوەێ رەسمی لە نێو خەڵکدا باوە.

بو هەموو کار و فەرمانی یان ژیانی رۆژانە رێگای روشن کردوەتەوە. جیاوازی کۆمەڵایەتی تاکوونێوان مروڤ کە هەر کەسی بە جورێک و بۆ سروشتیش پەندی داناوە وەک دەڵێن لە پیران تەوی، لە زستان شەوی. یان زگم بدرێ زەنگم نەزرێ. خوا حەق بزنی کوڵ لە سەر بزنی شاخدار نایڵی و هەزار پەندی وا کە بە فەلسەفەی ژیانی ئادەمیزادەوە پێوەندی هەیەدایان ناوە. جا کێ بێت ئەمانەێ بە چاوی خۆی نەدێ بێت. کێ بێت بە سەریا نەها تبێت ئەمانە هەمۆویان بەڕاستی مەترسییان بو هەر کارو بارێک داناوە ئەگەر گەلی کورد بلێن سەدان وەک ئەرەستو و سوقەراتمان بووە بەڵام چۆن کوردی بێکەس دڵسوزێکی نەبوە ناچار هەر پشتاوپشت ئەم پەندو موچیارانەێ پاراستووە و بە داهاتووان گەیاندویە. ئێستا دەڵێن هەرکە پیری نەوێ پیرێ بسێنێ. زۆر بەێ لە پەندی پێشنیانی کورد فەلسەفەی باشی بووە و زۆر لەق و پو ئەداتەوە بۆیە دەڵێن

وێنەیٚ ئەفلاتون و ئەرەستو لە ناو کورد زۆر بوون، بەڵام بێ کەس بون هەروا کە ئەرەستو سوقەرات بو هویٚ نەزانین جەهل و خەڵکی ئەو سەردەمەی یونان بون بە فیدای زانینەکەی خویان.

بۆیە لە بابەتەکەوە چومە دەریٚ لە بەر ئەوەی گەلی کورد زۆربەی داب و نەریتە کوردیەکان ئەچێتەوە سەر ئاینەکانی کۆن و زۆربەیان بە ئەزموون بەسەرهات و زانین نەوە پێک هاتووە، بەراستی جێگەیٚ داخ و ئەسەفە بو گەلی کوردی ئەمرۆ داب و نەریتەکانی کوردی هیچکامیان لە چەرخی بیستمدا جێگەیٚ تەشک و ئار نیە کە ئەمرۆ لە زۆربەیٚ ناوچەکانی کوردستان بە تەواوی کەم رەنگ بۆنەتەوە و جێگەیٚ ئەو داب و نەریتە کوردیە بە شێوەیٚ بێگانە بووەتەوە کە لە شادی و شیوەن و هەموو بابەتەکان گەوزەوەکە ئەوەتە شارستانیەتی چەرخی بیستم چۆن بەیت و باوەکان لەکوردستان کە لە بنەڕەتدا کوردین هەموو لایەنەکانی تێدا رەچاوە کراوە چ لە بابەتی حەیاو ئەدەب و شێوەکانیٚ مرۆڤانە و هەموو جورە کردەوەکانی وا ئەمرۆ دین ئیسلام پەسەندی ئەکات بە داخەوە برێک ناکورد لەم کردەوە پڕ لە مانایانە لایان داوە وەک قەل‌لاسایی کەرن هەرچەند گەلی کورد لە سەرەتای بەرەبەیانی مێژووی ئادەمیزادەوە بۆ گەلانی دراوسی بۆەتە چرای رووناکی وگەلی کورد هەر لە مێژەوە شابازی هەموو بازە بەرزە فڕەکان بۆون وگەلانی تر لاسایی کوردیان کردوە کورد شاهباز بووە بە داخەوە ئێستا ناکوردەکان هەر کوردیان بەم رۆژە خستەوە لە بەیتو باوە کوردیەکان کاتیٚ کە لەبارەیٚ ژن خواستنەوە چەندە لایەنگری لە شەرەف و ناموس بەرچاو گیراوە.

لە کۆنەوە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان ژنان شان بە شانی پیاوانی یار و یاریدەری ژیانی کۆمەڵایەتی و شەریکی غەم و شادی هاوسەرەکانیان بۆون یەکی لە ئەو میللەتانەی کە لە ئێراندا بۆ پاراستنی سنووری لە دەس چاو وچنوکەکان ئەی پاراست کورد بووە لە رابردووی نزیکدا بوو کە کاتێ وا وڵاتە ئوروپایەکان دیسان بۆ سەر خاک و سەر چاوە ژێر زەوینیەکانی ئێران کە پڕەلە گەنج و گەوهەر وەک تەڵا بگرە تا بە نەوت ئەگات کە ویستیان چاویان شۆڕ بکەنەوە بۆ تاڵانی چەندجارەیان گەلی کورد بۆ بەرگری لەو هێرشە حەماسەی خۆلقاندوە وای لێان کرد کە بە سەر شوڕیەوە پاشەکشی بکەن و دیسان بچنەوە سەر جێگای خۆیان لە سەر دەمی مێژووی ئێران بو پاراستنی ئەتوانن بلێین لە ناو هیچ قەومێک ئێرانیدا وەک گەلی کورد بۆ پاراستنی ئێران کوششی نەکردووە بەڵام بەداخەوە لە جێگای قەدرو رێزی ئێران پادشا خاینەکانی بە برژەێ بومب و گوللە دەست خۆشانەی گەلی کوردیان داوەتەوە.

بە داخەوە بە هوێ بێ باری و ناشایستەی شاکانیشەوە کوردستانیان بە سەر وڵاتە بێگانەکاندا بەش کردبۆ هەر تەڵە کە و پیلانیک کە بۆ کورد بوایێت بەر لە بێگانەکان دەسەڵاتدارە ئێرانیەکان لە حەق نەشناسی هەموو گیانبازیەکانی کورد کە بۆ ئێران لە سەرەتای مێژووەوە کردویە بۆ پارستنی ئێران لە بیریان بردەوە و ئێران بۆ لە ناو بردنی کورد خەت و نیشاندان بە بێگانەکان دەستی باڵای هەبوە.

ئاسەوارێ وا لە سلێمانیە دوزراوەتەوە کە لە بەردە و تەوەر و خنجەر و نەیزە و دەروش و برێک پێداویستەکانی ژیانی ئەو سەردەمە درووست کراوە زۆرتر نزیکە بە

ئاسەوارە پەیدابووەکانی سەرزەوین فەلەستین لێرەدا تارادەیەک روون و ئاشکرایە کە گەلی کورد لە سەردەمی بەرد (ئەسر حەجەر) لە گەڵ قەومەکانی دیکەدا ئاشنایەتی و هات و چووی لە گەڵ قەومەکانی تردا بووە یان بەم جورە کە برێک لە مێژوونووسەکان کە خەتی بزماری ئەناسن.

دەڵێن لە کیوی گوتی (جودی) کە ئەمرۆ لە ژێر دەسەڵاتی تورکیادا هەیەئاسەواری دوزراوەتەوە کە ناوی کچەکەی حەزرەتی نوح سروە بووە و کەشتیەکەی نوح لە کێوی گوتی (جودی) نیشتووەتەوە کە لە قورئانی پیروزدا لە بەر ئەوەکە ئەرەب لە رێزمانیدا نیە بە کێوی جودی ناوی لێی براوە.[1] بۆیە ئەم باسە مێژوویەم هاوردەپێش کە گەلی کورد هەر لەو سەردەمە تا کوئێستا هەموو بە سەرهاتەکانیان هاوردەوە بە شێوەیٚ پەند و دەس پشت تا پشت تا ئێستا بە گەلی کوردیان لە هەر مەترسی‌یەک بۆمان شتێکیان داناوە کە ئەگەر هەر ئەو رووداوانە کە قازانجی تێدایە یان زەرەر کورت ئاسان بۆمان روونیان کردوەتەوە پێشینیان کورد هیچ ئاموژگارییان بیٚ کەڵک نەبوە بەڵکو بە روداوی ناپەسەند وایان بە چاو دیوە بویە ئەو باسەیان لە چوارچێوەیٚ بەیتدا داتاشیوە و بە شێوەیٚ جوان نەخشاندویانە و تام چێژیٚ تایبەتیان پیٚ داوە تا وەک وردە چیرۆک و پەخشان و بەیت بمێنێتەوەلای من وایە کە بێنەوە خۆناسینی و بەرهەمەکانی کورد زیندوو بکەینەوە، با کەمێک دەست و بازوی لیٚ هەڵماڵین لە خۆمانەوە دەست پیٚ بکەین نەک زانابین لە مێژوو بەیت و باووی کوردی تەنیا ئەوە مەرج نیە ئەبیٚ بەیت و باوەکان هەموویان کە بە نارەوا

---

١- لەم بارەوە هێشتا بۆ پسپۆران مێژووزان جێگەی تۆژینەوەیە.

زیندووبەچاڵ کراون بە شێوەی کوردانە مێشکمان زاخا و بکەین با خۆمان لەو شورەسوارانەی کە بە جلە کوردیەکانەوە و جامانە و چەتفە و لفکە و سۆرانی لە کاتی شەڕدا مرۆڤ لەرزە لە گیانی ئەنێشت لە رێگای شورە سوارانی کوردئێمە کوێریان نە کەینەوە چەن خۆشتر و جوانترە کە چینی زانایانی کورد لە خۆیانەوە دەست پێ بکەن ئەوسا رچە شکێنی ئەوانە بین کە لە بەیتو باوی کوردیناموون.

ئێمە نابێ چاوەنواڕی ئەوانە بین بەڵکو ئەبێ خۆمان بە هەر شێوەیەک بەشدار بکەین ئەوەدەزانین کە ئەدەب و فولکلۆر ی نەتەوەکەمان چ تامێک و لەزەتێکی هەیە، رووداوە دڵ تەزینەکانی کوردی گوێ هەر لە خەو پێا کەووتوی رائەچەڵەکێنن منداڵەکانی کورد هەر لەو رۆژەی کە دەچنە ناو بیشکەی جوان و رەنگین بە دەسترازەی سەوز و سوور قاچ و دەستیان دەبەسرێتەوەو میروی بازێ بەسەردا شوڕ دەکرێتەو دەکەوێتە نێوی گەلانیان و ئاشنای لەگەڵ ئەو بالوورە دایکەوا بە لایەلایە دڵی پڕ لە سۆز و کوڵی کە لە دووری برا و باوک و کوشتن خزمەکانی ناو ئەبات دڵی هەر دڵ پەرۆشی و جوش کوڵ دێنن و لەو رۆژە منداڵی کورد دەبێتە گوێ رایەڵی دەنگی دایە پیرە و باپیرە و دایکی کە لە نیوە شەوان بەچرینی لایە لایە و ناو کەسە کوژراوەکانی دەماری تۆڵەسەندن لە نێو دڵی ناسکی کۆرپەکەی مۆر دەکا و کاتێ کەوتە گڕوگاڵ وردەوردە هاتە قسەکردن بە بەسەر هاتی ئەو سەرگوزەشتانە وا بە سەری باوکو دایکی هاتووە لە کاتێ دووبارە کردنیان منداڵی کورد دڵۆپەی فرمێسک دێتە ژێر چاوی و خەوێ لێ ئەکەوێت و دوا رۆژ لە دڵیا ریشە دائەکوتی و بۆمافی رەوای گەلەکەی وا بە ناڕەوا زەوت کراوە بە ئازایەتی بیر لەوە دەکاتەوە کە یا

کوردستان یا نەمان بویە تا ئێستا بەو هەموو کارەساتە دڵتەزینە وا بەسەر کوردیان هاوردووە دوژمنانی کورد هەر نائومێدن و کوردیش وەک شووشە وایە هەرتا بشکێ تیژتر ئەبێت کە وایش بووە بەیت و باوی کوردی و فولکلۆری کوردی هێندە زۆرە کە وەک هەویر ئاوی زۆر ئەخواتەوە کە وا بوو هەر کەس بە پەی ئەرکی شانی ئەوانە بگرێ لە ئەستو چۆن حەیران و بەیت و باو و فولکلۆر و ـ پەخشان هەرکام هەزاران لاپەڕەی ئەوێ کە لە بارەیەوە بنووسرێ لێرەدا من تەنیا مەبەستم لە ئاشیرەتی کورت و سادەیە کە لە هەر باخی گوڵی بچنرێت و سەرێک لە باغچە گەورەکانی فەرهەنگی کوردیمان دابێت چۆن تائێستا دەیان کتێب لە بارەی فەرهەنگ و بەیتوباوی کوردەوارییەوە نووسراوەتەوە و پاش ئەوانە هێشتا زۆربەی فولکلۆرە کوردیەکان نەخراوەتە سەر لاپەڕەی کتێب.

# «ئاهەنگی زەماوەند و هەڵپەڕکی کوردی»

هەروا کە بەیتو باوەکانی‌تر بۆمان روونە کە گەلی کورد هەموو بەیتەکانی لە مێژوو دەستی پێ کردووە یانێ لەنۆ تا شەش هەزار ساڵ پێش تا دوو هەزار ساڵ پێش، بێ گۆمان هەڵپەڕکی کورد یەکێکە لە داب و نەریتە کۆنەکانی کورد کە ئەگەڕێتەوە بۆ سێ تا چوار هەزار ساڵ پێش چۆنکە هەڵپەڕکیەکان کوردی چەن جۆرە یان سوپاس لە ئەهورامەزدا بووە وەک زیکر دەرویشەکانی ئەمرۆ ئەمە لە کتێبی مەزدەیەسنا ودەقەکانی ئەدەبی کوردی بە وردی باسی لێ کراوە و ئێران باستان و تاریخ ماد و ... و هەڵپەڕکی کوردی هیچ پەیوەندی‌تری بە میللەتانی دیکەوە نیە گەرچی وڵاتە دراوسیەکان و یان تیکەڵ بوونی برێک لەوانە هەڵپەڕکی کوردیان تا ڕادەیەک کەم رەنگ کردووەتەوە بەڵام پەیدا بوونی هەڵپەڕکی کوردی بۆچێ و بە چ بابەتی بووە؟ فەلسەفەیکی دور و درێژی هەیە کە تەنیا ئاماژەیکی کورتی پێ دەکەم.

باش وایە کە بزانین هەڵپەڕکی و شادی دەهۆڵو زورنای کوردی لە کەیەوە دەست پێ دەکات ئەگەر چی هێشتا ئەم باسە و بە تەواوی روون نەبووتەوە و کاری تەنیا کەسێک نیە کە پیویستی بە کۆڕی زانیاریٚ باش و بی لایەنە چۆنکە ئەمانە ئەبێ هەمۆویان بە بەڵگە مێژوویەکان روون بیتەوە.

ئەم هەڵپەڕکی کوردیە هەروەک باقی داب و نریتەکان کورد ئەگەڕیتەوە بوو سەرەتاریٚ پەیدا بوونی ئینسان(مروڤ) کە بوو درێژە پیٚدان بە ژیانی رۆژگار.

ئەگەر چی بۆ پێک هێنان و رێک هێنان دوودانە هاوژین ئەم زەماوەندە و شادیە پێک هاتووە بەڵام هەڵپەڕکیە کە چۆن جێگەیٚ خۆی لەم شادیە کردوەتەوە جێگەیٚ باسە چۆن ئەگەر بە وردی سەرنجی بدەیٚن زۆر رۆداوەکانی مێژوو تیٚدا بەرچاو ئەکریٚت.

هەڵپەڕکی کوردی داستانی قارەمانەتی و جەنگ و سەرکەوتن و هەروەها شکست و باس چۆنیەتی شەڕ لە مێژووی کۆندا بۆمان روون دەکاتەوە و هەر لە دەوری حکومەتی گوتیەکان و کاسیەکان و لولوبیەکان و هۆریەکان و ماننایەکان وتا مادەکان کە لە زنجیرە کێوەکانی زاگروس ژیاون پشتاوپشت بە ئێمە گەیٚشتوە کە نەتەوەکانی نەتەوانە کوردەکانی ئەمرۆژیٚن هاتووە. کە وا بۆ ئەم باسە لێکوڵینەوە و تۆژینەوەیٚ زوریٚ پیٚویستە بەڵام کورتە باسی ئەگەر لیٚ بکەیٚن لە هەڵپەڕکی کردن و چۆپیٚ کیٚشانمانیش چتگەلیٚ قارەمانەتی و جەنگ و شادی و هەروەها پاڕانەوە لە ئاهورامەزدا بۆمان روون ئەبیٚتەوە و هەندیٚ لە پسپوران مێژوو نووس وەک پرفسۆر مینورسکی و سپایزار ئەدمونز و دوکتور ئیزەدین موستەفا رەسول: بیرورایان وایە برێک لەم هەڵپەرکیانە سەر کەوتن مادەکان بە

سەر ئاسوریەکان یا ئاشوریەکان بووە، بەڵام دیارەکە لە هەر دەورەیێ حوکومەتێک وا لە ئێران و کوردستانی ئەمڕۆژ بووە تا دەورەی ئاردەڵانیەکان بابانیەکان و میرانی سۆران و ... هەر کورد خۆی لەم سەرزەوینە حاکم بووە و ئەگەر چی سوپایێ دوژمن داگیری کردەبێ بەڵام هەر ناموٖیان قەبوڵ نەکردوە و دوژمن نەیتوانیوە حوکم و حاکمی و بیروڕایێ خۆی بە سەر کوردستاندا بسەلمێنی.

چۆن بۆمان دەرئەکەوێت هەڵپەڕکی کوردی زۆربەیان لە جەنگەوە هاتووە لێرەدا ئەگەر هەر لە مادەوە دەستی پێ بکەین کاتێ کە ماد لە گەڵ ئاشوردا بە جەنگ دێت کە چەند جار شەریان بووە و جاریش وا بووە ماد شکستی خواردوە.

ئەوەیێ کە دیارە هەڵپەڕکی ئاهەنگی جەنگی و بەزم و رەزمی جەنگی تێدا روونە چۆن ئەم هەڵپەڕکیە دەڵێن لە سەرکەوتن مادەکان بە شێوەی رەسمی داهاتوە چۆن با بو یادگار دواروٚژی کورد بمێنێتە وە بە لە زەماوندو شادیەکانی وا بە بۆنەیێ ئەو شادیەوە دەهوڵ زۆرنا و هەڵپەڕکی ئەکەن هەڵبەت تەنیاکورد لە زەماوندی تێدا هەڵپەڕکی نەکراوە بە بونێ جێژنی کوونی ئێرانیەکان و بە تایبەت ئەوانەیێ وا بە بۆنەیێ قەومی کوردەوە رێک خراوە وەک جێژنی چوارشەممە سوری و جێژنی میهرەگان - جێژنی دروینە و خەلە و خەرمان و ... باران و مەڕۆ مەڵات و ... و زوربەیێ هەڵپەڕکیەکان لە شەڕوە وەر نەگیڕاوە.

هەڵپەڕکی کوردی لە شەن کردنی خەلە و خەرمان و شکاریش و دەیان جۆیتر لە کوردیدا ۳۵ جۆری هەڵپەرکیمان هەیە تەنیا ۱۷ جۆری بیرەوەری شەڕەکانێ قەومی کوردە و لە بنەڕەت هەر هەڵپەڕکی بە یادی سەرکەوتنی قەومە مێژوویەکان کوردەوە

داهات و ئێمه ئێستا هەر له مادەکانەوه باس لێ ئەکەین.

به گوێرەیٚ برێک له مێژوو نووسان، مادەکان له کاتیٚ حکومەتی هوەخشتەره که کوڕەزای دیاکو یەکەمین شایٚ ماد که له هەگمەتانه (هەمەدان) ئەمڕۆژ پێتەختی دامرزاندوه که هوەخشتەره توانی به سپایٚ بچوککه تازه له جەنگی لودیه و میتانی رزگار بۆون و هێشتا سوپایٚ ماد خۆی له توز و گەردی ئەم دوو جەنگه نەتەکاند بوو، توش جەنگ لەگەڵ دەوڵەتی ئاشوور به سوپایٚ به هێزو ئامادەکراو هێرشی هاورده سەر وڵاتی ماد، لەم کاتەدا به پرزی و ئازایانه به خۆیان هاتن. و به کوێره باسی مێژوویٚ کورد پێوەستەگی نەژادی ئەوه، (نووسین مەرحوم یاسمی و کورد و کوردستان. ئەمین زەکیبەگ ـ تاریخ ئێران باستان مشیرالدەوڵه و ...) ئەم جێژنه له سەر کەوتنی ماد و بەربەرەکانی لەگەڵ لودیه و لیدیەکان (قوستەنتەنیه). که پاش هەشت ساڵ شەڕ ئاخری خۆرگیراو ئەوانیش به ناو جیٚگەری سەرکەردەیٚ بابل شەڕەکەیان وێستان و ئەم شەڕه له سەر جەنایەت سەکایەکان و هەڵاتنیان بەرەو وڵاتی لیدیه ئەویش له کاتیٚمادەکان وا له گەڵ ئاشوریەکان ناکۆک بوون، لیدیه به شەڕ لەگەڵ ماد دەرکەوت ماد هەشت ساڵ لەگەڵ لیدیه شەڕی کرد و شکستی نەخوارد و بۆ سەرکەوتن لەو شەڕەدا بیرەوەری بۆ داهاتوی ئەو سەرکەوتنه ئەم شادیه دایٚیان هێنا و هەر ساڵ بو بیرەوەری ئاهەنگی شادی و هەڵپەڕکییان ئەگێڕا.

ئێستا باسی چۆنیەتی: هوخشتەره له فەرماندەرەکانی ویستوه که باسی چۆنیەتی شەڕەکه بکەن به شادییەوه بو خەڵکی ماد که دەور تا دەوری پایتەختەکه خەلکی ماد

کۆئەبنەوە و بە شیوەی تیاتر (تاتر) فەرماندەرەکان بو شایَ ماد (هوخشتەر) را باس شەرِەکە ئەکەن، بەم جۆرە کارە سات و بە سەرهات و هەروەها کەوتنیان و شکست لە برِێک جار وەک شانو (نمایش) دەری دێنن و تەماشاچیەکان بە کەنێن و زەقین و شادی چاوەنوارِن و هەروەها لەم بارەیەوە لەوکاتە کە کەرِەناو دەهوڵ ئاهەنگی جەنگ بوە هوەخشتەرە دەستوری دا بیکەن بە شادی تا لە بیرنەچێتەوە و ئێستا ئەگەر بە وردی سەرنجیَ هەڵپەرکی کوردی بدەێن ئەو راستەقینەمان بۆ دەرئەکەوێت چونیەتی فەرماندەری شەرِکردن رەزمی وەکو جەنگی رەزمی و ئەوە بو کە لە ئەنجامدا بە پیرۆزی ماد لەو جەنگەدا کوتایی هات و ئینجاشای مادەکان بە بونەیَ ئەم سەرکەوتنە دەستوری جێژنیگەورەیَ هەفت شەوو و هەفت رۆژ شادی بە دەهوڵ زورِنا و هەڵپەرکی لە سەرتاسەری وڵاتی ماد ئەدات تا لە مێژووی ئەم قەومە بمێنی جا لەم شادیەدا چونیەتی شەرِەکە و سەرکەوتنی دوپات کراوەتەوەو لەو کاتەوە تا ئەمرِۆ لە هەر شادی و زەماوەندی لە جیاتی شمشێر دەستماڵ بە مانای ئاشتی بوە و لەجیاتی شمشێریش بەکار براوە و پشتاوپشت تاکو ئێستا هاتووە و هەر بەردەوامە.

لە کاتیَ دوبارە کردنەوەی ئەم فەرماندەرانە کە ئاهەنگی شەرِەکەیان بەو جورە بو پادشاکانیان گیراوەتەوە بە کەرِەناکە و دەهوڵ پیشان دراوە و ئێستاش هەر ئاهەنگی نێزامی باوە. چونیەتی نەزمی ئەوی سەردەستەیَ شەرِ کە لە فەرماندەری تاکو ژێردەستەکانی بە شمشێر و ئاموژگاری بو جەنگ کە لە یەک دەستەدا چەند نەفەریَ دەس بە دەستی یەک بە مانای پشت یەک گرتنی و لە ژێر چاودێریَ فەرماندەری یەک نەفەرە

بۆیەکە ئێستا هەڵپەڕکی کورد چەن نەفەر دەس بە یەکەوە ئەدەن و یەکی چوپیکێشەکە بە مانای فەرماندرە ئەوکەسە هەر جورێ هەڵپەڕیِ دوایەکەیان بەو جۆرە هەڵ ئەپەڕن و چاویان لە چوپیٚ کیش و سەر چوپیەکە چۆن رایٚ ئەوەشێنن چۆپیەکە بە مانای شمشێرە کە لاسای وەشاندنی شمشێرە لە کاتیٚ جەنگدا و دەست لە ناو دەست بە مانای یەکگرتوییە و هەروەهاچۆپی بە مانای ئاشتی لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە.

چونیەتی دەس پێکردنی شەڕ وا بووە کە ئەوەڵ بە نەرمی کە ئێستا لە هەڵپەڕکی کوردیدا گەریانی پیٚ دەڵێن وردە هەنگاونیان سەرەتایجەنگ کە جەنگی شمشێر بە نەرمی لە ئەوەڵیەوە دیارە.

هەڵ گرتنی توند ئەو هەڵپەڕکیە بە مانای توندی جەنگ و پرزی لە شەڕدا ئەگەێنی و سەرکەوتنی بە سەر دوژمندا روون ئەبێتەوە. ئەو هەڵپەرکیە وا سیٚ جار کە لە زەوێندا بە توندی پیٚ بەزەوین ئەکوتن بە مانایٚ دوژمنان لە ژێر پیٚ خستن و خەریکی بەربەرەکانێن و بەرەو سەرکەوتن ئەچن.

هەروەها هەڵپەڕکی مایەشتی یان ماد دەشتیکە لە دەشتی مادەکان روی داوە لە زوربەی شار و لادیەکانی کوردستان باون ئەم هەڵپەڕکیە کە لە ماهیدشت کرماشان رۆی داوە و ئەوان (لیدیەکان)[1] هاتونە ماهیدەشت(ماد دەشت) هەر دویان زۆرکوشت و کوشتاریان بووە و ژنەکانی ماد بە یارمەتی پیاوەکان هاتون و پاش چەندیٚ بەربەرەکانی

---

١- بیروڕای جیاواز هەیەدەڵێن ئەو شەرە لە ماهیدەشت (ماد دەشت) کرماشان لە گەڵ ئاشوردا بووە.

زۆر به هه‌ڵوێستی ماد سه‌رئه‌نجام ماده‌کان سه‌ر ئه‌که‌ون و تا سه‌رسنووری لیدیه ئه‌چن و ئێستا له هه‌ڵپه‌ڕکی کوردیدا مایه‌شتی پێ ده‌ڵێن و له‌م هه‌ڵپه‌ڕکیه کاره‌سات ئه‌و جه‌نگه بومان رونتر ئه‌بێت چۆن بڕێک جار به‌ره‌و دوا ئه‌چن و بڕێک جار به‌ره‌و پێشه‌وه. یا جار وابوه بو فریودانی دوژمن پاشه کشه‌یان کردووه و ده‌یان ره‌مز و فه‌نی جه‌نگی تیدا ئه‌بینرێ چه‌ند جۆر هه‌ڵپه‌رکی گه‌لی دیکه هه‌یه که له کار و کشت‌وکاڵ و هه‌روه‌ها له شکاردا هاتووه. نیوی ئه‌م شادیه و چۆن له مێژووی کۆن له ده‌ورانی گو تیه‌کان که له پێش ماده‌کاندا بۆون و ئه‌مانه بڕێک له کاره کانیان به شێوه‌ێ هه‌ڵپه‌ڕکی ده‌رهێناوه و مه‌رج نیه که هه‌موێ هه‌ڵپه‌ڕکیه کوردیه‌کان جه نگی بێت. به‌ڵام بیره‌وه‌ری و بو رێز نییان له سه‌ر که‌وتنی ماده‌کان بۆ دایم له شادیه‌کاندا شێوه‌ی ره‌سمی به خوێه‌وه ئه‌گرێت تا قاره‌مانه‌تی و نه‌به‌زی و جوامێری له خوو بوردوییێ ئه‌م گه‌له بو هه‌تا هه‌تایه بمێنی.

ته‌نیا مه‌رج ئه‌وه نیه که هه‌ر که‌س هه‌ڵپه‌ڕێ وایه که لێ ئه‌که‌وێت چۆن چوپێ‌کێش نابێ به هه‌ر جۆری مه‌رامی دڵیه‌تی هه‌ڵ په‌رێ و به حیسابی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ێ دابێنن ئه‌بێ خۆی له مێژووێ چونیه‌تی ئه‌م هه‌ڵپه‌ڕکیه شاره‌زا بێت نه‌ک هه‌ر فێر بێت و ناوی هه‌ڵپه‌ڕکی کوردیش خراپ بکات وه‌ک سمت گێژدان خو به پشته‌وه وه له خوڕاییێ خۆو خستن. هه‌ڵبه‌ت ئێستا ئاڵ وگورێ زۆر له هه‌ڵپه‌رکیه کوردیه‌کان ئه‌بێنن.

به داخه‌وه هێندی که‌س نه‌زان به چاوی سوکه‌وه به ئه‌م که له‌پوری نه‌ته‌واتیه ئه‌نوارن. مه‌به‌ست ئه‌وانه‌یه وا به چاوی سوکه‌وه له داب و نه‌ریتی خوێان پشتیان هه‌ڵ کردووه له کورد، که ته‌نیا به زوان کوردن. و میلله‌تی پاک‌ره‌سه‌نی کوردیش قه‌د ئه‌و زوڵه‌کوردانه واله

ژیانی ناموبارەکیان هەنگاویان هەڵ نە ناوەو بو کورد دڵیان نەسوتاوە لەبەسەرهاتی چەرمەسەری و سەرەسوڕی کوردی هەژار پشتیان کردوە گەلی کوردیش بە کوردێ والە بنەڕەتدا لە بنەماڵەێ خوێرێ و هەرەکیدا چاویان هەڵ هێناوە ئەم تاقمە بنەماڵەیێک هەرزە هەڵ کەوتون. مەبەست ئەوەنیە کە فڵان کەسی لە بنەماڵەێ کام ئەئیان یان ئاغا یان خان بووە و یان هەیەلە راستیدا هەر ئەم مالک و ئاغا و ... چڵکاو خوەری ئەو حوکومەتانە بوون وا بە خوێنی کورد تینویەتیان شکاوە ئەم جۆرەکەسانە مەگەر مێژووی دوارۆژی کورد رۆنی بکاتەوە چ خەیانەت و جەنایەتی بەم کوردە هەژارە کردویانە. چونکە لە خاکی پاکی کوردستان ئەژیان و لە رەنج و زەحمەت و ئەرکی سەر شانی کوردە دەست پینە بەستوەکان و پێ پەتیەکان بە ئەو پلەیە ئەگەیشتن کە چی کەمترین هەنگاوێ بو کورد و کوردستان هەڵ نەگردوە بە ئار و نەنگەوە دەڵێن کوردین لە گەڵ بێگانەکاندا دەستیان بە یەک ئەکرد بو گیانی کوردی دڵ ساف ئەمانە لە مێژووی کوردا پیان دەڵێن خەیانەتکارانی خوماڵی مەسەلێک هەیەکە دەڵێن: کوردە بەڵام کورتە. دواکەوتوی کورد زۆرتر ئەو ناکوردانەن کە لە قارەمانەتی و ئازایەتی و سەربەرزێ و هەزاران شتێ بە نرخیتر ئاگایان نیە تا وێژدانی ئەویەیان بێت لانی کەم لە داب و نەریتی دەوڵەمەندی کورد پشت نەکەن پیان وایە ئەگەر بەم کردەوە فولکلۆریە رەفتار کەن لە کەسایەتیان کەم ئەبێ ئێستا لە شادی و زەماوەندا لە کوردەواریدا دەبینن بڕێک رەقس دەکەن ئەم تاقمە ناکوردانە لە راستیدا لە هەر کوێ بێت لە بنەماڵەیەک خوێری و سەرسەری هەڵ کەوتون ئەگەرچی بە قەوڵی بڕێک لە بنەماڵەێ فڵان ئاغا و ... بوون و یان

هەن بەڵام پێناسی خویان ون کردووە و یان لاسای کەرن دەیانەوی خۆیان بە پێشکەوتو بە قەڵەم بدەن. نەوەڵلا وا نیە لە لای برپەک لێزان و خاوەن فەن و قەڵەم بەدەست بە خویری بنەڕەت ئەژمێرن و بە حیساب دێن چۆن هەر ئەمانن کە فەرهەنگی دەوڵەمەندی کورد پێ شل دەکەن و بە بێگانە پەرەستی رو ئەکەن ئەو شتانە وا ئەمرۆ لە کۆمەڵداتازە باون نە ئیسلام و نە کەسێ وا بونی لە پیاوەتی برددبێ کەم پەسندیان ئەکات ئەو ناکوردانە وا جل و بەرگی کوردی و زوانی کوردی بەدوا کەوتوی ئەزانن و بە شەرمەوە قسان دەکەن ئایا ئەمە بە مانای ئەوە نیە کە لە دایک و بابی خۆیان نێن و زوڵن. بێ ئەوە لە فەلسەفەی زوان و فەرهەنگی بێگانەکان شتێ بزانن. تەنیا لاسای کەرن کاتێ لێان دەپرسی خۆیان لەو کردەوەدا داماو ئەبن تەنیا بۆ خو زل کردن روالەتی بوە هیچی تر.

ئەو کەسانە وا بە رەقسی و هەر کردەویەکی ناکوردانە پێان خوشە،لە راستیدا چاویان لە دیتنی فەرهەنگی کورد کوێرە و دڵو دەرونیانیشی هەر کوێرە دوژمنانی گەلی کورد هەر ئەوانە نێن وا ماڵی کورد و منداڵی کورد و ... لەبەێن ئەبەن و یان دەربەدەر و کوشت و بڕ دەکا و خوێنی کورد ئەمژن ئەوانە نابێ چاوە نواری چاکەت ڵیان بێت و دوژمن ناوێ بە خویەتێ بەڵام ئەو زوڵە کورددانە چۆن بو هەتاهەتایە تا مردنی نەنگینیان پشتیان لە گەلی کورد هەڵ کردووە ئەوانە دوژمنانی ناوی ماڵن بو کورد چۆن لەم خاکە کوردەدا ڕۆاون بەڵام هیچ کردەوەیەکی کوردانەیان نیە لە داب و نەریتی باب و باپیرە خۆیان حاشایان کردووە چۆن زیندووی هەر میللەتی بە فەرهەنگ و داب و نەریتی ئەو میللەتە زیندوە ئەگەر بفەوتی بە مانای لەبەێن چونی ئەو میللەتەیە ئەو کەسانەواڵە دەستوراتی باب و

باپیر گەلی کورد روی کرژ ئەکەنەوە کورد نین. چۆن ئەمانە ئەبنە هوێ دواکەوتنی ئەم میللەتە و دڵسوز نین لە سەرەتای مێژووی کوردەوە زۆر بۆن کە کوردیان وابەم رۆژە خستووە مەگەر هەر ئەو کوردی نو هەزار ساڵەێ نێن کە لاپەڕەکانی تاریکی مێژوویمان بە بریقەێ شمشێر روون کردوتەوە و دەیان جار کەوتووە بەر چەرخی چەمەری رۆژگار دیسان چەرخی لە چەمەر بڕیوە و هەر نەبەزتر و ئازاتر هاتوەمەیدانەوە و لە بەر گێژو لولی رۆژگاران تەنگو چەڵەمەکانی رۆژگاری تێپەر کردووە و کورد لە ئازایەتی و جوامێری و هەروەها ملنەدان بە زوڵم ناوێکی بە ناو بانگی هەیە.

هەر لە سەرەتای ئادەمیزادەوە تا ئەمڕۆ خۆیان خاوەنی فەرهەنگ و مێژوون و سەر بەرز لە ناو میللەتەکاندا ناسراون لە هەر سەردەمێک وا ئێمە ئەژێن کە درێژەدەری میراتی پڕ لە شانو شکوێ کوردین وجاخی کوێر بکەینەوە و دەبێ ئێمە لە داب دەستور و بەیتو باوی میللەتەکەمان و هەروەها ئاسەوارە کونەکان بە بەستەو مەقام و پەخشانی کوردی بە گشتی هەمو کردەوەکانی کوردی بپاریزێن هەموکار و فەرمانێ لە ژیانماندا لە مێژووی کوردی بەهرە بگرین نیشتمان پەروەری یەک رەنگبوونی کوردانە بێت هەر لە سەرەتای ژیانمانەوە بایەخی باشی بو دابنێن و پاک داوێنی ناموس و شەرەف بانی هەمو ئەرکەکانی ژیانی هەر کوردێ ریشەدار بێت هەر وەکو هەڵپەڕکی گەنم و جو و ئێستا ئەمە کردەوەیەکی راستەقینەێ میللەتە بو ئەوە ژنانی کورد چاو ترسینەری بێگانەکانبن ئەبێ هوشیار و ئاگامان لە خۆمان بێت تا لەم گێژە لولی رۆژگاردا کە لە هەر رووداوێکی چەرخی بیستەمدا خۆمان لە بەر شتهاێ بێ بایەخ کە لە کەسایەتی هەر کەسێک کەم

ئەکاتەوە و چۆن ئەوان سواریان سوارە ئەبێ ئێمە ئاگامان لە خۆمان بێت.

جەنایەتکارانی خۆماڵی نەبین لە جاران چاکتر و پاکتر پارێزگاری لە هەمو ئاکارەکانی کوردی بکەێن تاکو لەمە زیاتر لە ژێر پێ نەچێن کوردی رەسەن قەد ژیانی سەرشوڕی قەبوڵ ناکات و لە داب و نەریتی خوێ حاشا ناکات. بەداخەوە ئێمەێ کورد لە رابردوی خۆمان ئاگادارێکی وامان نیە چونکە لە و تورکیا و سوریا و ئێراق هەزاران پیلان و فێل بۆ گەلی کورد ئەکەن تا لە فەرهەنگی خۆمان بێگانە بین و لە رادیو و تەلەویزیوندا بە تەواوی دەست بەسراوین و لە داب و نەریتەکان باس ناکەن باشتر ئەوەیە خۆمان بیر لە چارەنووسی خۆمان بکەین ئەوانەی وا خاکی پیرۆزی ئێران و کوردستان بە ئێمە سپاردوە لە هەر بابەتیکەوە پارێزگاری بکەین و بە باشی ئەرکی سەر شانی خۆمان بە جێ بێنین تاکو ئەوانەی بو هەتاهەتایە لە دنیای روون ماڵئاوایان کردووە ناو نیشانی ئەم میللەتە لە لاپەڕەکانی مێژوو کەم رەنگ نەبێت. ئایا تەنیا بەوەێ کە کوردی بدوین یان ئەبێ ژیانمان کوردانە بێت.!کوردی شیاو ئازا بزانێ چ بە سەر خاک و وڵاتی و گەلەکەێ دێت و نابێ شاهێد بێت، ئەبێ خۆی لە هەمو رووداوەکانی بە سەر هاتی میللەتەکەی بەشدار بێت وابزانێ کە میللەتەکەێ لە هەر لایکەوە کەلی پێ ئەکەوێت ئەو کوردە کەلگیر بێت بە قەوڵی ماموستا هەژار فەرمویەتی بە کوردی بژێن بە کوردی بمرین.

# بەشی شیوەن و چەمەری و سەرە خۆشی لە کوردستاندا

ئـەگەر چـی لە ناو هەر قەوم و میللەتێ وا خۆی داب و نەریتی تایبەتی هەیە بەڵام گەلی کـورد هەر وەک باقی رووداوەکان و بەسەرهاتەکان جیـاوازی لە گـەڵ میللەتەکانی دیکەدا زۆرن.

بێ گۆمان گەلی کورد بەشەدارتر لە هەموو گەلانی زیندووێ جیهانە چۆن کورد لە رۆداوەکانی رۆژگار شەڕ و سەرگەردانی ماڵ وێرانی چەرمەسەری زۆرتری بە خۆیە و دیوە کە بە بۆنەیٚ برێک لە رۆداوەکانی رۆژگارەوە رەنگە لە نەتەوەکانی دیکەش هەر بە شێوەیٚ داب و نەریتەکان کارە ساتێ زۆرتری پێوە هەیە هەروەها کە بۆمان روون بوەتەوە کە کورد لە درێژای مێژوودا رۆی ئاسودەیٚ بە خوێەوە کەمتر دیوە جگە لە دەربەدەری چۆن سەر شورێ بەخۆێ ناسەڵمێنێ و بۆ ئازادی گیان و ماڵی بەخت کردوە گەلی بە

شانازی دەزانن کە قەد لە بیر ناچێتەوە لە ناوچە کوردستاندا کاتێ کەسێ دەمرێت ئەگەر جوان بێت و شورە سواریان لە ژن یا پیاوی ئازاو جوامیرو ناودار بێت ئاهەنگی تایبەتی بۆی سازدەکرێت ئەو بنەماڵە ژنەکانیان یانی خزم و کەس و کاری نزیکی پەلکەێ بۆ ئەبرن و لە سەری جلی مردەوەکە داێ ئەخەن و سەرگونای‌یان لە کاتی شیوەن زامداری ئەکەن و جلی رەش لە بەر ئەکەن و بە لاواندنەوە بالورە و رۆ رۆ کە دلی هەر دڵ پەرەوشێک بەکوڵ و جوش دێت و پیاوەکان بە سەر جل و بەرگی مردووەکە وا داخراوە سەروێن وکڵاو و دەسماڵ و پوزەوانەێ بۆ دائەخەن بە مانایێ ئەوەیە کە لە پاش توکێ بە ئێمە ریگەو رچەێ ژیان و پیاوەتی بڵی و یان ئێمە بە بۆنەی تووە پیاوی ناودار بۆێن و جلی مردووەکە تەواوی هەر لە سەروێنەکەی تا خەنجەری بەر شاڵی دای‌ئەخەن و ژنان بە لاوانەوەێ سوارچاکی و جوامیری و نەترسی و ئازایەتی ئەی‌لاوێنەوە و ئەگەر لە شەرِدا کوژرابێت بە سۆزی نیشتمانی پیێدا ئەڵێن کە ژنەکان بە نۆرە نۆرە لە دەمی یەک بە گریانەوە ئەسێننەوە یان چەمەری بۆ ئەگێرن وەک ئاهەنگی ئاشورایێ ئەمرۆژی شیعەکان ـ و سەرەموری ئەم بەیتانە بە باڵایێ ئەیژن بە سۆزی دەروونەوە و گریانەوە دەڵین: برا شمشێر کوروژەکەم رۆ ـ برایێ هەڵکەوتو و لێهاتوم رۆ ـ پیاوی ناوی کەڵە پیاوانمان‌رۆ ـ وی‌رۆ برارۆ دایکەرۆ باوکەرۆ خوێشک و براۆ گشت کەسم‌رۆ و ئەم شێعرانە دەڵێن کە لاواندنەوەێ سوار چاکیە:

سوار هەیٚ سوار هەیٚ نەترسم رۆ

له ئوردو براو تورمە پوشم رۆ

✹ ✹ ✹

سوار سوار بو وه پەنج وه شەش

بێژن سوار بو خاوەن ئەسپە رەش

سوار سوارگیر کەفته دواوه

کەللەی پیکیاوه هەر له حەواوه

✹ ✹ ✹

دەلاڵ بانگ ئەکا بەدەنگی زولاڵ

خوێشک بێ برا بکەن زینده چاڵ

✹ ✹ ✹

وه جار و بار وا بووه که خوێیان له قورِ ناوه و به دەنگی بالۆرەوه ناو کەس و کاری جوانەمەرگ و ئازایان بردووه هەر وەک دەنگ کێشان پیاوان دەنگی هۆره جاریش وا بووه له ناو چەمەریدا واوەیلا له سەردان براڵەرۆ براڵەرۆ ئەڵێن ئەگەر هەر کەس ئەوکاره ساته ببینێ خۆی دڵی به کوڵ و جوش دێت و پێ خۆشه که به ئازایەتیٚ بمرێ و به جوامێرانه بژێت تا له کاتیٚ مردندا جێگەیٚ ئاخ و فەغان بێت و ئەگەر ژیانی به سەر شۆڕی و

نامەردی و بێ بایەخی بێت هەر لە زیندوویش بە مردو حەسێب ئەکرێت و مەردانە ژینێ ئەکاتە پێشەیْ ژیانی ئەم ئاهەنگە لە راستیدا ئامۆژگاریە بۆزێندووەکان و مەبەست لە ژن و پیاو نیە مەبەست لە مەردانە ژیان کردنە مەبەست لە ئازایەتی و سەر بەرزێ و سەر بەستیە لە خۆ بوردن بۆ ژیانی بێ زلْم و زۆر وەک زانایان و شائێرەکان فەرمۆیانە:

مەگەر نەت بیستووە زانای سەرزەوین

مەردانە بژی نەک حیزانە ژین

ئومری کورتم دێ پڕ بۆ لە شانازی و شەرەف

ئومری درێژم دێ نەنگ و بێ هەدەف

مەردێ ئەگەر کاری بە نامەردانە

باری سەر باری هەموو دەردانە

«ماموستا هەژار»

✱ ✱ ✱

هەزاران موچیاری لەم بابەتەوە زۆر کەس بۆون کە لەم رۆداوە و چاو پێ کەوتنە بیریان لە بێ بایەخی خوێان کردوەتەوە و بۆیان رونە مردنەکەیان نەنگە بۆ دواجاریش و یان هەر ئێستاش مردوون.

لە کوردەواریدا لەم کارەساتە وا بە سەر هاوسێکەیان هاتووە لەم بارەوە خوێان بە بەشدار ئەزانن. رادیو کۆک ناکەن و ماڵان سپێ ناکەنەوە و زەماوەند ئەگەر لە پێشەو بێت

ئەیخەنە دواجار و لە سەر تاشین ریش‌تاشین تا ماوەیک لە بەر ریزێ بۆ هاوسیەتی و خزم مردوەکە خۆپاریزی ئەکەن و ژنان سەر لە خەنە ناگرن و پاش چل رۆژ لە بنەماڵەێ مردووەکە یان دوو پیاو لە گەڵ دوو ژن لە کەس و کاری مردووەکە ئەچنە ماڵی ئەو هاوسێیە لەو دێهاتە یان ناوچە و کەسانی نزێک والە بەر ئەوان ئازیەتیان گردووە لە ئەوانە ماڵ ئاوایی لێان ئەکەن تا ئازیەتی بشکێنن و لە خەڵکی ئاواییەکە چەند کەس ریش سپی ئەچنە ماڵی خاوەن مردووەکە بۆ خولکی ریش تاشین و سەر تاشین و سەرو ریشیان ئەتاشن و جار وا بوە ژنان لە بەر هاودەردی کۆ ئەبنەوە و ماڵی کەس وکاری ئەو مردووە سپێ ئەکەنەوە و ئەگەر لە ئاوایی‌یان ئەو ناوچە زەماوەند بوایە لە بنەماڵەی مردووەکە ئیزنیان ئەگرد و یان چاووشەکان بەدەهوڵە کە یانەوە دەچوونە بەر ماڵی بنەماڵەێ مردووەکە ـ کە بەدەستی چەپێ لێ ئەدات بە دەهوڵەکە و خاوەن مردووەکە ـ لە بەر ڕەزامەندی هاوساکەێ ئیزنی شادیەکەێ ئەدات و لە بەر ئەوەکە هاوسیەکان بەشداری ئەو زەماوەندە بکەن ئەچوونە ناو زەماوندەکەو دەوری هەڵ پەڕیون‌و ئەمەش بومان روون ئەکاتەوە کە ئەم میللەتە چۆن مافی هاوسیەتی و هاوماڵی بە چ شێوەیەک جێ بە جێ بووە و چۆن رێز و حورمەت‌یان لە یەک گرتووە و چۆن رێگەێ پیاوەتی و هاودەردی دەزانن ئیتر ئەوەکە تا سێ رۆژ ماڵ هاوسیە چێشت‌لیێ‌نان بۆ ماڵی خاوەن مردووەکە و هەروەها لە کاتێ فاتیحەخوانی هەر ماڵی ئاویک ئەواتە ماڵەوە و خەڵک ژن و پیاو تا ڕادەیەک هاودەردی ئەکەن بنە ماڵەێ مردووەکە بە راستی بویان سەبووری دێت ئەمە لە کاتێ تەنگانەدا کورد کە خوێنی یەکێکە یاری‌دەری یەکترن لە رۆژی تەنگانەدا.

# بەشی دڵداری و ئەڤین

ئەم جۆرە داستانە بۆیە لە ریزی داستانی باسی ئەکرێت چونکە زۆرتریان بە تایبەتی لە کوردەواریدا تەنیا رۆداوێکی سادەی ئەوڤین و دڵداری ناگرێتەوە بەڵکو لە پاڵ ئەوەشدا کەرەسەیکی تێدایە. کە بە شێوە داستانی قارەمانەتیدا بەدی ئەکرێت داستانی دڵداری کوردی لە پاڵ سۆز و هەست و خۆشەویستی وەفاداری و راستگوی‌دا جۆرێک لە ئازایەتی و فیداکاری دەرئەخەن ئەم خاسیەتە وایان لێ ئەکات لە روێ رۆداوەکانەوە خویان لە راستی نزیک ئەکەنەوە و ئەبنە دو لێ قۆماوی راستەقینەوە بەڵکو وا رۆداوێ راستەقینەێ مێژوویان هەیە کە ئەیانباتە ریزی داستانی مێژووی‌یەوە بۆ نموونە فەرهاد و شیرین ـ و بەهرام و گوڵئەندام کە دەست نووسەکەێ لە مۆزەخانەێ بریتانیادا نموونەیەک لەم داستانە بە شێوە زبانی گورانی هەیە لە کوردەواریدا ئەگەر چی گەلانی

دیکه‌ی وڵاته دراوسیه‌کان کوردستان داستانی شیرین و فه‌رهاد به‌هرام و گوڵئه‌ندام نووسیویانه‌که چی روداوه‌که هه‌ر ئێستاش له سه‌ر زه‌وی کوردستان وه‌قایئه‌که روی داوه له بیستوون‌دا که خاکی زگماکی کورده و بۆ نموونه‌ێ روونتر خه‌ج و سیامه‌ندو ئه‌زیز و کوبرا و ده‌یان که‌سی‌تر دڵداری پاک و راسته‌قینه و ناودار که هێشتا له سه‌ر زاری کوردن هه‌ر ماون ئێستاش له لادیه‌کان ماوه که به هۆی هه‌ندێ جیاوازی رۆژگار ئه‌م دڵدارانه خۆیان به قوربانی داوه و به یادی خوشه‌ویستی گۆرانی دڵته‌زین به‌گریانه‌وه ده‌ڵێن لێره‌دا به راستی ئه‌وه ده‌ر ده‌که‌وی که ئه‌م نه‌ته‌وه پاک ئازایه چه‌نده به ئه‌ڤین و دڵداری که ئه‌و په‌ڕی سنووری بریوه و قوربانی وه‌فاداری راستی و پابه‌ندی به هاوبه‌شی ژین و ژیانی خوشه‌ویستیه هه‌موو داستانه‌کانی دڵداری کورد تیکه‌ڵه به ئازایه‌تی سۆزی دڵته‌زێن و له خۆ بۆردن له پێناوی خۆشه‌ویسته‌دا و په‌یمان بردنه سه‌ر یان له سه‌ر په‌یمان تا ئه‌و په‌ڕی گیان بردنه گورِ لێره‌دا باسی په‌یمان شه‌رتو وه‌فاێ میلله‌ته‌که‌مان بۆ ده‌ر ئه‌که‌وێ که به‌م نه‌ته‌وه شانازی بکریِ

دڵداری کورد یا سوز و ئه‌ڤین خۆشه‌ویستی پیشان ئه‌دات له سنووری خۆیدا یه‌کێکه له به‌رهه‌مه به‌دیمه‌نه‌کانی ده‌روون و دیمه‌نی مه‌ئنه‌وی ناگوڕی له ناو کوردا جار وا بووه که دوو دڵدار به نهێنی دیاریان به یه‌ک‌داوه و پێشکه‌شیان به یه‌کتر کردووه.

وه‌کو ده‌سته‌سڕ ـ ئاوێنه ـ شانه ـ قوچکه و ئه‌نگۆستیله یا ئه‌ترو کلکه‌وانه. و به‌م جۆره به یادی ئه‌و هه‌ناردنه‌ی شێعری هه‌ڵبه‌ستوه و تیکه‌ڵ گۆرانی کردوه:

یادگاری دۆس چەندەجوانە
یان شیشە ئەترە یان قۆچکە[1] و شانە
یادگاریەکەت ها بەلامەوە
وەک مەڵهەم ئەینم بەروی زامەوە

* * *

دەسەسڕەکەت سێ گوڵ حەبیبی
بۆمی بنێرە هامە غەریبی
یاخوا هەڵی کەی باکەێ لاروایی
با لە قۆچکەکەێ بیخا ئاوایی
کەم بێ کەم بچو لە دەر ماڵمانە
با کەس نەزانێ بە ناو کارمانە
مەردم وە حەقن من و نانە لەم
ئەشرەت ویلم کەن و رەزای دڵ خۆم.

* * *

١- قۆچکە پارچە لە هاوین پیاوەکان لە بەر قەرچەێ خۆرەوە لە سەری ئەکەن ئەڤینداری کچ ئەم دیاریەکە بە نەهێنی بۆکور ئەیئنێرن پێوە شاد و دڵ خۆشن و لە قوڵای سۆزی دەررونەوە حەزی لێ ئەکات و یان ئەڤیندار بەم شتانە گۆرانی هەڵبەستووە بە ئەشقی ئەو شەوی بەدەم رۆژەوە داوە شەونخونی کێشاوە.

یانکوڕ وتویە:

بێژن وە کاڵهویل قژ کاڵ دیدەمەس

بپرسێ لە من بزانێ دەردم چەس

✹ ✹ ✹

جاریش وا بۆ ئەم ئەڤین و خۆشەویستیە بە ئەو پەڕی سنووری خۆی گەیشتوە کە بە بۆنەێ دەخاڵەت و دەس تێ بردن خزم و کەس و کاری ئافرەتی داماو یا تەفرەقەو جیاوازی کەوتووە بەینان و ئەو دوو ئەڤیندارە تەفرە و تونا بۆون و بە یەک شادنەبونەتەوە و فەرهادکوژەکان لە کوردەواریدا بە کەسی وا دوو دڵدار لە یەک جیا بکاتەوە پێ دەڵێن فەرهادکوژ: ئەڤینداران بەداخەوە ئەکەونە بەرگیژو لولی رۆژگار وایان لێ ئەکات کە ئەبێ بە هۆی گیان باخت کردن ئەو دوو خۆشەویستە کە چۆن دەسیان لە یەک نەگردووە تا ئەووێ بۆ یەک مردن کە لەم بارەوە گۆتویانە:

ئەگەر من مردم بۆ من مەکەن شین

پشتم لە قیبلە و رۆم لە نازنین

بە حەسرەت یارم لێیمیان سەنەوە

ئەوە من مردم هەر بەو داخەوە

ئەگەر من مردم وەسیەتی ئەکەم

تالێ لەو زوڵفە بخە ناو کفنەکەم

نەکا لە قیامەت بەێن بەێن یادت کەم

* * *

لێرەدا حەمە بێکەس، وەلی دیوانە و خەج و سیامەند ـبەهرام و گوڵئەندام ـ شیرین و فەرهاد کە لەم دواییەدا بڕی لە ئەڤینداران یادی ئەوان و یان خۆیان بە میرات بەر ئەوان زانیوە وەک:

شەرت بێ لە داخت بروم نەیمەوە
وەک بارام لە شوون گوڵەنامەوە
لە دوایێ مردنم تێر بوم بکەن شین
من بومە فەرهاد ئەویش وەک شیرین

* * *

لەم کەین و بەێنی دڵداریە چەندە مێهر و وەفای نواندۆیانە بۆ یەک بۆ دایم لە دنیا بێ بەقا ماڵ ئاوایی یان کردوە و حەسرەتی شاد بۆون یەک گرتنیان بە ژێر خاک بردووە.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێت و ڕوون ئەبێتەوە لە پێناوی ڕاستی میللەتی کورد ئەبێ بیناسین چۆن بە ئەهد و میهری خۆشەویستی خۆی وەفاداری کردووە ئەگەر چی بە کۆتایی پێ هاتنی ژیانی تەواو بێت ئایا لێرەدا نامووس داری کورد دەتوانین یەک لە هەزار ناو بیەێن ئەگەر ئێستا وا نەماوە ئەوە لە بێگانەوە بو گەلی کورد هاتووە و چەندە

لاپەڕەکانی مێژوو لە هەر بابەتێکەوە پڕە لە شەرەف و شانازی و بەس. ئێستاش هێشتا لە لادیەکان کوردستان تا رادەیەک ئەوەمان بەرچاو ئەکەوێت کە مامۆستای پایە بەرزی کورد قانع نەمر و هەمیشە زیندوو لە دیوانەکەیٚ فەرمۆیەتی:

دڵداری لادی سەیری جوانە
بۆت بەیان ئەکەم زۆرچاک بزانە
بە جۆت ئەگەڕن لە دەشت و سەحرا
بێ دایک و باوک، بێ خۆشکو برا
لە رێدا ترسی مەشکەو دوو رشتن
تاوی پێکەنین تاوی ئاو پژێن
هەتا تەمەنییان دە دوازدە ساڵە
پێکەوە ئەبن ئەو دوو منداڵە
کوڕ ئەڵێ بە کچ وایە نیازم
گەر بۆم رێک کەوێ هەر تۆ بخوازم
حەزت لێ ئەکەم سۆچی خۆم نیە
دڵ لە سەر تویە دەسەڵات چیە

*** 

کە وا بۆ هیوا دارم هەموو کوردێکی بێ گەرد و دڵسوز بە کارە ساتە فولکلۆریەکان و

کەلەپوریەکان لە چەرخی بیستەمدا بە هەڵە نەچن لاوە کوردەکان وا تازە پێ گەیشتۆن ئەوانەێ وا لە داب و نەریت بەێت و باوێ کوردەواری یاخی بۆون و لە ئەم کوردە قارەمانە بێگانە بونەتەوە لە راستیدا پێ ناسیان ون کردووە و یان کزی کەسایەتی‌یان هەیە. خوێان لە قیتی و قۆزی دائەنوێنن بە هیوای دەرخستنی داستانە رەسەن و فولکلۆری کەلەپۆری نەتەوایەتی کوردی لە سەر تا سەری ئێرانی پانو بەرێن.

# «گورانی»

گورانی کوردیش یه‌کێکه له به‌شه ده‌وڵه‌مه‌نده‌کانی که‌له‌پوری کوردی و برێک له کوردناسه‌کان گورانی کوردی ئه‌به‌نه‌وه سه‌ر سه‌ره‌تای ژیانی ئاده‌میزاد که هه‌ر له‌و سه‌رده‌مه گه‌لی کورد به کار و شکار ژیانی رۆژانه‌یان و پارانه‌وه‌ی ئایین هه‌ر یه‌ک به جورێک ئاهه‌نگی تایبه‌تیّ خۆیان بووه مێژوو روونی ئه‌کاته‌وه گه‌لانی سامی و له بابل و که کلدانی له نه‌ته‌وه‌یّ کورده‌کانه‌وه گورانی فێر بۆون و ئێستا گه‌لی کورد تا رادیه‌ک له گورانی و هونه‌ردا ده‌وڵه‌مه‌ندن که سه‌رنجی وڵاته بێگانه‌کانیان بولای خۆیان راکێشاوه بوه‌یه ئێستا بوه‌ته هویّ ئه‌وه‌که له یادمانه‌کانی کوردی له ده‌روه‌یّ وڵات ده‌یان خاوه‌ن بیر و رایّ له‌و یادمانه به‌شداری بکه‌ن جا له به‌شه‌کانی ئه‌م کتێبه هاتوه که چۆن گورانی کوردی سه‌رنجی بێگانه‌کانی به‌رو لای خۆی راکێشاوه.

به داخەوه ئێستا بڕێک له هونەرمەندانی کورد گورانیەکانی کوردی ئەبەنەوه سەر فارسی و تورکی و ئەرەبی یان ئاهەنگەکانی له سەر بنەمای کوردی ئەیگورن ئەم تراژدیه جێگەیٚ مەترسیه بو تێکچونی ئاوازه ڕەسەنه کوردیەکان چۆن تەنیا ئەو تاقمەیٚ که له ناو فەرهەنگی هونەری گورانیدا شارەزایان هەیەکەسی‌تر لەو کار ساتانه نایزانی و ئەبێته هویٚ دەوڵەمەندی فەرهەنگی بێگانەیان بڕێک‌تر گورانیەکانی کوردی که تەنیا شێوەیٚ تایبەتی کات و ساتی خۆی هەیەله هەر سات و کاتیکدا ئەیبێژن ئەمەش له گرانی و سەنگینی ئەو ئاوازه جوانەکەم و لاواز ئەکاتەوه بو نموونه گورانی حەماسی له ناو شادی و ـ بەزمی خوشی ئەوێژری که ئەمه بو هەر کەس ئەزانی تەئسیری ناڕەوای هەیەتەنیا لێرەدا مەبەست له سەر فەلسەفەی گورانیەکه تا ئەندازەیەک گەلی کورد له هورەکه هەمان (ئاهورا) بوه رونەکه له جێگای خوێدا باس کراوه و شێوەیٚ که به بالورەیٚ ژنان چۆن هەست بزوێنه بیسەران چۆن لەو بالوره بیر ئەکەنەوه که مرۆڤ گەندەڵانه ژین نەکەن و کەسێک بن له ناو خەڵکدا جێگەیٚ خۆیان بکەنەوه یان سیاچەمانه چۆن ئەوانەیٚ وا له ناو کومەڵ ئەبیسن له سەردەمی بارام چوبین ئەم گورانیه به جیکایەک بەرز گەیشت و ئێستاش هەر کەسێک ئاواتەکانی که له دڵیا مابیٚ به بیستن سیاچەمانه ژیانی نوی ئەکەوێته بیری و ئەتوانین بڵێن که گۆرانی کوردی کۆنترین ئەدەبیٚ فولکلۆری کوردیه و ئەم هونەره له زۆر کونەوه پەیدا بووه و ئەبیٚ هیچ کامی تێکەڵ و گوڕانگاری نەکەین و نەیفروشین تا ئەویش نەبێته بڕێک له وشەکانی کۆنی کوردی که ئێستا فارسەکان بوو دەوڵەمەندی فەرهەنگەکەیان خۆیان لیی کەڵک وەر بگرن ئێمەیش بیٚ بەش بین. و فولکلۆر ناسان بیرو

رای جیاوازیان هەیەلە بارەی سەرە تای گورانی کوردیەوە ئەم دوو رایە هەیەهەر ریچکەگەی ئەچێتەوە سەر باوەرێ فەلسەفەی چۆن رای ئەم دوو بیر و باوەرە لە سەر بناغەی چۆنیەتی داهاتنی گورانی کە هەندێکیان لە سەر ئەوەن کە سەرەتای داهاتنی گورانی کوردی لە کار و ژیواری دەس پێ کردنی ژیان ئادمیزاد و هێندی تریش لە سەر ئەو باوەرەن کە گورانی لە سەرەتای جوڵانەوەی هەستی مرۆڤ بە دین و ئایین کە بە دەنگ لاواندنەوە موناجات ئایینیەکان ئەو مەئبوودی خۆیانە ستایش کردووە لێرەدا مەبەست لە سەر پەرستش کردنی ـ حەفت فریشتە چاکیەکان و ... تا داهاتنی ئایینی زەرتوشت کە لە پاش بە ئاهورامەزدا لە هورە چرین بە ستایش خودا بووە لێرەدا نا بێ ستایش لە بیر بچێتەوە چۆن مرۆڤ لە سروشت گورانی بۆدێت یان لە خۆشێ و پیرۆز بۆون بە سەرکەند و کۆسپ و گیر و گرفت کە بە سەریا زاڵ بێت و بە ئاواتی خۆی بگات کە هەستی دەرونی ئەبزوێنێت یان لە بەر ناهومێدی و دڵ شکاوی و هەست بە تەسلیم بوونی و زەبوونی لە بەرامبەر ئەو ئاواتە کە لە دڵیا دائەمرکێ و بە دی‌نایێت و ئیحساسی دڵ‌تەنگی بکات ئەویش دیسان مرۆڤ لە بەر دڵ‌تەنگی ناچار سکاڵای دڵی بە ئاوازەوە دەر ئەبرێت. ئەگەرچی هەندی دەڵێن گورانی هاوتای جوانیە و گورانی لە کانگای دڵەوە هەڵ ئەقولێت. لە گورانی کوردیدا یادی رووداوەکانی مێژوو باسی شەرەکانی پێشوی تێدا ئەبینن زۆربەێ‌شیان لە گەڵ هاوتایی پیری‌دا یەک ئەگرنەوە و ئەو پێوەندیانە کە بە مێژووی جەنگەوە هەیە کەرەسەی گورانیە کە ئەگۆرێ و لە سۆز و هەستی هان دان شێوەێ شیوەن ئەگرێتە خۆی کە ئەبێت بە تازیەباری وەک لاواندنەوە و بالوورە و موناجات کە

هەموو بە دەنگی تایبەتی خۆی بەڵام بە جورێک کە نەزمی جورا و جوری هەیە و هەموێ بە دەنگی بەرزەوە ئەڵێن داستان و چیرۆکی کوردی بەشێکە لە فولکلۆرە بە نرخەکانی کوردی کە نابێ دەستی کەمی بگری و یان پشت گوێ خرێ هەر قەڵەم بەدەستی کوردەکە تا ئەو کەسانە وا لەو داستانە کۆنە کوردیانە دەزانن زووترینکات بێتە سەر لاپەڕەکانی بابەتە کوردیەکانەوە چۆن لە بەرهەمی داستانەکانی کوردیدا هەر ڕووداوی باری ژیانی ئادەمیزاد تەنیا نیە بەڵکو ئاواتی ئادمیزادیش ئەخرێتە بەر چاو و بەسەرهاتەکانی مێژوو هەمووی بە شێوەێ داستان داهاتووە لە بەر ئەوە کە لە مێژووی کۆندا ئامرازی نووسین و یان زەوت کردن نەبووە بەڵام هەموو بە سەرهاتەکان لە قاڵبی داستاندا دەرهاتوون و ئەگەر داستانی کۆن بەڕاستی گوێ بۆ شل بکەین برێک مەسەلەکانی مێژوو وا تا ئێستا پسپۆڕان لە سەرێ بە یەک نەگەیشتوون سەرئەنجام دێنە سەر بیر و رای یەکگرتوو وەک بونی تەلەسم ـ دێو ـ درنج ـ و سیحر و جادو لە رۆژگارانی چەند هەزار ساڵە. هەر بە ئاسانی وێنەێ ئاسانی پیشان ئەدات. لە داستانی کوردیدا ئامۆژگارییە کە مرۆڤ بە چاکە کردن چۆن جێگەێ خۆی لە نێو کۆمەڵدا ئەکاتەوە و خەڵک چۆن لە دەوریا کۆ بوەتەوە و ئاخری کەسێک کە چۆن لە بەر زڵم و جەور هەڵوە دا ئەبێت و لە پاش ماوەێ دەربەدەری سەختی لە ئاخردا چۆن بە ساحێب هەومو شتێ ئەبێت و خراپی ئەو کەسانە وادەر حەقی کردوون چۆن چاکە قەرەبووی ئەکاتەوە.

لێرەدا هەم موچیاریە کە لەگەڵ خراپەکان مرۆڤ بەچاکە رەفتاریان لەگەڵ بکات تا پلە و پایەی خۆت بەرزتر بێت و دوهەم مرۆڤ تا سەختی و برسیەتی چەرمەسەری نەکێشی

بە ئارەزۆی خۆناگات و برێک داستانە کوردیەکان بە شێوەی ئەفسانە و خەیاڵ رەنگیان گردووتە خۆی بەڵام لە ئەنجامدا بەسەر کەوتنی مرۆڤ لە گەڵ ئەو هەموو دێوەزمەی رۆژگار دەرئەکەوێت لە پاشدا هەر مرۆڤ زاڵ ئەبێت بە سەر هەموو کەندو کۆسپەکان وا بۆیان درووست کردووە بۆ نموونە داستانی روستەم و زۆراو کە فیردەوسی شانامەی خۆی پێ رازاندوتەوە بە کوردی نووسراوە و برێک پیرە پیاو و پیرەژنی کورد بە بێ کەم و کورتی وەک ئەوشانامە دوبارەیَ ئەکەنەوە لێرەدا ئێمە دوو مەبەستمان بۆ روون ئەبێتەو وەک بیر و مێشک ئەم نەتەوە دوهەم سەرکەوتنی مرۆڤ بە سەر دێوزمە کە لە ئایین زەرتوشت ئەم رەوشتانە لە بەر چاو ئەکرێت. و زۆربەی گۆرانیەکان پێوەندی گیانی بە گیان لە گەڵ (گاتەکان)[1] ئەشو زەرتوشتدا هەیەوەک هورە و سیاچەمانە.

---

١- پاڕانەوەو ـ موناجات کە بەشێکە لە ئاڤیستا.

# گاڵتە و گەپ لە ناو کوردەواریدا

گاڵتە و گەپ لە ئەدەبی جیهانی و فۆلکلۆر گەلان جێگەیەکی بەرزی هەیە بەتایبەت لە کۆمەڵی کوردە واریدا. قسەی خۆشی کورد یا چیرۆکیکی بەیت دەرهاوردن کە خەم رەوێنی درونەو و بەڕاستی جلی پێکەنین کراوە بە بەردا. و زۆر جار لە مەتەڵە کوردیەکان بزەی خستەوە سەر لێوی دڵە زامدارەکان و پرڕ لە ئازارەکان و مەبەست لە سەر ئەو جورە بەیتە داهێنەر و لە بەر ئەوەیە تا ئەوە بسەلمێنی کە چۆن لە کوردەواریدا زیاتر لە گەلانی تر توشی سەختی ناخوشی ژیان لە بەر ئازار و رەنج و دەربەدەری وا بە سەر کوردا هاتوە لە بەرچاوی دوژمن خۆی بەکز و ناهومید دوژمن نەیبینێ و چە قلّی چاوی دوژمن بێت لەم بابەتەوە گەلی کورد بە شێوەی فنوتێک و تیات (تاتر) جوانترین مەتەڵ وگاڵتەش وا بە شان و روخساری هیچ کەس نەگەیت کراسی کەنینی کردووە بەر ئەو جۆرە گاڵتە و گەپ

و مەتەڵانە وا جێگایەکی تایبەتی خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەیەو ریشەیەکی ئەۆ توی لە ناو کۆمەڵی کورددا داکوتاوە و چۆن ئەو پیکەنینە هەموو پێکەوە ئەکەنن. و نە ئەوەیّ بە یەک بکەنن و ئەم گاڵتە و گەپ ـ ە لە کوردەواریدا بەشێکی زۆری لە فولکلۆر ی کوردی خستوتە ئەستوی خۆی چونکە ژیانی پرڕ لە پێکەنین و هانی مرۆڤ ئەدات بە هومید و ئارەزوو هەڵ سگاندنی هەوڵ و تەقەلا بو ژیانی چاکە خۆشی لەگەڵ کومەڵ ،نەک دور و تەنیا بو خۆی بژێت و هەر ئەم گاڵتە و گەپ ـ ە بوەتە هویّ لابردنی کینەو رەق لە دڵ خەڵکدا ژیانی پر لە پێکەنین ئەبێت بە ئامانجی کەسانیک کە هەوڵی شادی بەختیاری بدریّ لە نیو کومەڵی مرۆڤ تا ئەوەی وا هەر لە ئێستا وا زیندوو بە رواڵەت کە چی مردوی زیندوونەمایە چۆن خوشی لە ژیان ببڕیّ و هیچ شادیک نابینی تەنیا شەو رۆژ بە سەریا تی پەر ئەبێت. ل ۶۴ فولکلۆر ی کوردی ـ د ـ موستەفا رەسول ـ بەشی دوهەمی چیرۆکی گاڵتە و گەپ کوردی کە ئەم نیشانەیّ بە کار هێنراوە. ئەم جۆرە چیروکە تەنیا قاڵبیّ پێکەنینە کە لە حکایەتی تری جیا ئەکاتەوە و بەرگی گاڵتە لە بەر ئەکات و بە شێوەیّ تیات دەرئەکەوێت.

بو نموونە جارێک کابرایێک کە قەد بە شار نەچو بوو لەو سەردەمەیش، ئوتوموبیل نەبوە پیادە ئەچێتە نزیک شار لە نزیک ئێوارە کە هەموو شار چراغان ئەبێت. دەس بە جێ بەر و دواهەڵ دیّ کەسێک لە ریّگا توشی دیّ لیّ دەپرسیّ کاکە بو بە توندی دەرئەچێت لە کویّ هاتویّ دەڵی ویستم بچم بو شار بەڵام دیم کە تەواوی شار ئاگری گرتوە. منیش هاتومەتەوە ئیتر نەچوم.

له برێک له گاڵته و گەپەکانی کوردیدا زۆرتر له مرۆڤێ وا به ساوێلکه و نەزان ناوبراوه که تەماح کار و پاره دوست که هەموو روداوەکانی له بەر دونیا دوستی هەیەو کەم‌تر له مرۆڤی دڵ ساف و راست کردار ناوبراوه.

و له راستیدا سوکایەتی هەر بیرو رای ئیلمی چاکی له ناو گاڵته و گەپ کوردیدا به سوکی ناژمێریت و بەدی ناکرێت له گاڵته و گەپ هەموو لاینەکان رەچاو کراوه به تایبەت پله و پایەێ شەرەف و زانای قەد له گاڵته و گەپی کوردی. به نزمی نابینرێ.

یەکی له دەوڵەمەندیەکانی کوردی له گاڵته و گەپدا. کەسێک به ناو مەلانەسرەدین ناوێک به ناو بانگ بوه که هەندێ لایان وایه که فارس بوه و یان تورک بوه. من بیرو رای خوم وایه که نه تورکی و نه فارسی بوه و قارەمانی گاڵته و گەپ یەکیک به ناوی مەڵانەسرەدین بوه و مەبەست له سەر گاڵته بوه بو رێک کردنی ناویان له سەر داناوه ئەگینا له ناو کورددا مەڵا به ئەوپەرێ رێزو و حورمەتەوه بایەخیان بۆ داناوه و بۆ کارەکانی مەسەلەکانی مرۆڤانه هەر به مەڵاکان پرس کراوه و له کومەڵی کورده واریدا هیچ کەسێک نەبوه له مەڵاکان رێزی زیاتر بێت ئەمەش نیشانەێ تێگەیشتن و فام ئەم میللەتەیه که ئەوەیان بو دەرکەوتووه و به فەرمایش قورئان ـ ئالم درێژه پێ‌دەری ریگای ئەنبیایه ئەمەش نیشانەی ئەو پەرێ خوشەویستی و گەورەێ مەڵاکان لەناو گەلی کورد بوه له کوردەواریدا گەلی رو داوێ وا له ئاخرێ کارەوه پووچەڵ و یان پرخێر پێت یان شەڕو ئاشتی به شێوەێ گاڵته و گەپ دەرهاتون و له رووداوه مێژوویەکانی ژیانن که روخساری گاڵته یان له بەر کردەوه و دەماودەم هاتوه بیرەوەری ئەو روداوانه هەروەها مەتەڵیش

بەشێکە لە بەیتو باوی فولکلۆری هەرە کۆنی کوردی کە پشتاوپشت تا بە ئەمڕۆ هاتوە و بڵاو ئەبێتەوە. کە لەم کاتە بیرو هۆشی مرۆڤ ئەسەلمێنی و مێشکی مرۆڤ لەم پرسیارانە ئەکەوێتە جم و جول. لە مەتەڵدا هەر وەک قسەی نەسەق شەقڵی تایبەتی سەرپەرەستی میللەت بە سەر روداوەی جیا جیا ژیاوە ئاشکرایە توانا و بەهرەداری گەل لەوەدا دیارە کە زۆر بە کورتی و پاراوی و لە پاڵەوە کەرسەو سروشتی شێعریدا بەم رووداوانە نزیک ئەکاتەوە کە لەم کاتەدا بو رەمز و رازی زۆر شت دەرئەخات و فەلسەفەیٚ ئەم مەتەڵە جار وا بوە بوکات بە سەر بردن شەوگارانیان داوە تەدەم رۆژەوە ـ و مەتەڵیشی چوەتە رێزی داستانەکانی کوردیەوە و لە بڕێک لە مەتەڵە کوردیەکان زۆر جار لە دارشتنی لە پاڵ بیری وردا جوانیکی پەیکەر و وشە هونینەوە ئەبێنن.

باش وایە سەرنجی خوێنەرە ئازیزەکان بو ئەم بابەتە توزی راکێشن ـ کە بو هێلکە دانراوە و ئەڵی.

سایەقەی ساماڵ هەوری فەرەنگی

دووئا و لە جامێ هەریەک لە رەنگێ

✹ ✹ ✹

ئەدەبێ فولکلۆر بە پەیٚ تەجرەبەو بە سەرهات و هەروەها بەراوەرد کردن لە کارە ساتەکان و روداوەکانی دیسان زۆربەیٚ لە باوەڕەکانی کونی سەرەتای ژیانی ئادەمیزاد بو گەڵی کورد لەم بارەوە وەک باقی فولکلۆرەکان زۆر دەوڵەمەندە کە زۆربەیان لە ریگای

ئیلمیە و بە هوێ کەڵک وەرگرتن لە مێشک و بیرو هوشی خوێانەوە داهێزاوە وەک دەڵێن چاوی‌خراپە لێرەدا بو ئەوانەێ وا بە هەر شێوەێ ئیلم هیپنوتیزم یان (تمرکز حواس) کە دەتوانن برێک کار کە لە توانای هەمو کەس‌دا نەبێت بیکات و مەبەست لە دڵ و چاوە و قەسد و ئیرادەێ موروڤە کە لێرەدا لە بەر ئەوەێ کە باسە کە درێژای زوٚرە لێ شانە چوٚڵ ئەکەین و لەم بارەوە کەس بیەوێ لە بابەت خراپی چاوە کە درووستە یا نە بە رێگەێ ئیلمی کە ئەو کەس قەسدی نەبێت بەڵام دڵی و نییەتی کار ئەکاتە سەری ئەو شتەێ کە وا توشی زەرەری ئەکات[1] لەو کەسانە پرسیار کەن یان بو نموونە کە لە شەوێ هەینێ زوٚر چرا هەڵ ئەکەن کە مردووان روحیان دێنەوە تاتێمە بە خوشی شادی بوێنن و ئەوانیش روحیان شاد بێتەوە هەر ئەم بیرو رایە کە لە کوردەواریدا هەیە بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام لە ناو کورددا باوو بوە وە بە راستیشەوە نزیکە. کە روح زیندوە و ئاگای هەیەلە زیندوان کتێبی ارتباط با ارواح ـ نوسین آلادگاردک بە راشکاوی لەبارەی روح ـ وە دوواوە کە لە داستانە کانی کوردیدا یان باوەڕەکانی کوردی زوٚری تیدایە و بە شێوەێ ئیلمی روون کراوەتەوە. کە چی گەلی کورد لە چەن هەزار ساڵ پێش ئەوانەێ وا بە شێوەێ ئیلمی ئاشکرا و رونە ئەوان تا رادیەک زوٚر ئاشناییان پەێداکردووە بو نموونە ئەگەر لە مێژوودا چوٚن هیچ وەسیلەی نەبوە بو هاتو چوی رێگای دور تەنیا وەسیلەێ کە زیاتر لێی کەڵک ئەگیرا ئەسپ بووە و وەسیلەێ روشنای لە شەوان کاتێ لە ئاویک‌تر چرای باتری‌دار کە

---

۱ – لە رێگای زانینی ئەمروٚژەوە کە دەڵێن برێک چاویان زوٚر «ئەشعەی ئیکس » تێدایە.

مەبەست نیرو بەرق[1] بوە کە ئەو سەردەمە نە بووە بە هوێ پیویستی حەتمی ئەبوات کە بە شەو ئەو دیهاتە یان ئەو شوێنە خەڵک بچێت.

ئەگەر ئەو کەسە وا بە ئەسپ سواری بو ئەو جێگا بڕویشتایە لە بەین ڕێگا لە نزیک کانی و ئاوی یان تاقەدارێک یان دوڵی ... کە بێ خوف ترس ڕێگای خۆی گرتوەبەر لە ناکاو دەنگی هاتوەتە گوێ های سوار بو کوی دەچێ - یان ناو کابرایشی ئەبرد، یان بانکی لێ ئەکرا سوار، سورا ئالێرەوە بێ - ئێستا بڕێک لە پسپوڕان لە سەر ئەم باوەڕەن کە و پەیجوێ لە بازەی روح ئەکەن دەڵێن ئەوانە ئەو رۆحانەن کە وا بە شێوەێ قەتڵ یان کوشتنی خەڵک و ئازاردان دەستیان نەپاراستوە و روحیان هەر جاری بە شێوەیەک خراپ خۆیان نیشان ئەدەن و لە بیاوان و دۆڵ و کەژ و کێودا سەرگردانن و هێشتا ئەو روحانەتەیان دەس لە خراپە هەڵ ناگرێ و بو گەپاندن و ترساندن زیان زیندوان کە لە تاریکی شەوو لە چوڵ و هەردا وێڵن کە کەسێک تەنیا پەیدا کەن و بی ترسێنن.

لە باوەڕەکانی کۆنی کوردیدا بە مێردەزمە[2] کە ڕیشەی ناوەکەێ ئەچێتەوە بو سەر زوانی ئاڤیستای هەروەها شەوو یان پەری و جن و ئاڵ ناویان هەیە.

من لە سەر ئەو باوەڕە نیم کە هەموو بیرو باوڕە کۆنەکانی کوردی بە حەقایق نزیکن بەڵام زۆربەییشان بێ حکمەت نەبوون نمونەیەکی تر لە باوەڕەکانی کۆنی کوردی - ئەوەیە کە کەسی وا تازە ژنی بۆ بێنن ئەگەر زاوا نەبن بە بەستن زاوای ئەزانن کە دوژمن بو

---

۱-لە کوردیدا ئاگروەشی پێ وتراوە.

۲- مێردەزمە = دێوەزمە = دێویەیسنا

تێک چونی نیوانی ئەو کچ و کوڕە لە ڕێگەیٚ دوئا و سیحر و جادوو دەستی بە کارەکرد بێت ئەم بیرورا بیرو باوەڕە کونەکان ناو نەتەوەکانی کورد بوە کە تا هاتن زەرتوشت سیحر و جادو و تلسم لە ئەو ڕۆژگارەدا لە ئێرانی کۆن لە ناوکومەڵدا دەستیٚ باڵای هەبوە و حەزرەتی زەرتوشت دژی ئەو کارە(دیویەسنا) هەڵوستی کردو و هەمویٚ بە دژی مرۆڤ و نابەکاری زانی و بڕێک لە مێژوونووسان ڕایان وایە کە چۆن ئەو جادوگەرانە ژیانیان کەوتوە مەترسیەوە هانی شای تورانیاندا کە هێرش کاتە سەر ئێران وایشی کرد حەزرەتی زەرتوشت لە ئاگر گای خویدا شەهید بو کە لە جێگای خویدا باسی لیٚ کراوە وە مەبەست لە سەر سیحر جادوو کە ئەمرۆ ئەویش بە شێوەیٚ تەردەستی و هەروەها کاهنەکانی هێندی و یان هیپنوتیزم ئەمرۆ بڕێک لەو کارانە ئەگرێت کە لەو سەردەمە بە زمانی کوردی جادوی و سیحری پیٚ وتراوە من لە سەر ئەوباوەرە نیم کە شتیٚ داهێنەری تازە بێت جادو یا غەریبانە پیاکەوتو لە پێش‌دا هەر جادو و غەریبانە کراوە مەبەستم لە کار ئەجاێیەکانی مروڤە کە لە کوندا ٥ هەزار ساڵ پیش زانین لە ئێران بووە کە پیان وتوە غەریبانە یا جادو وەک ئەمرۆ هیپنوتیزم ـ ی پیٚ دەڵین (کە ناوی ئیلمیەکەیەتیٚ) گەلی کورد لە بەر بەیانی مێژوویٚ ئێرانی کونەوە پاسەوانی بەێتوباوی ئێران بوە کە هەر خۆیان ئێرانیان ئاوەدان کردەوە لە مێژوو ئێران باستان پیرنیا لە پەڕەیٚ ٢٦دا هاتوە کە لە کاتیٚ کوشتنی یەکی لە سەرگەورەکانی ئێران توانی بێگانە لە وڵاتی ئێران دەر بکات هێمنایەتی خاتە ناو ئێران و ڕەنج و جەفایەکی زۆری بو ئێران کێشا ناوی ئەم گەورە پیاوە (ماسیس تویسی) بو کە لە پلاتە کوژرا و ئێرانیەکان بوی تازیەباری گەورەیان گرت و پیاوەکانیان

سەریان تاشی و یاڵی ئەسپەکانیان ئەپاچی لە بەر گیانبازی ئەو کەڵە پیاوە بوو لە ناو کوردستان بو ئەوانەیٚ وا جوامێرو ئازاو نە بەز و ناودار بێت هەر ئێستاش ئەکرێت من لە پیرەکانەوە بیستومە کە کەسێک کە سوارەیٚ رووس لە بەریٚ ئەترسا بە ناوی خاڵویارەکە مەشهور بە یارەباڵ بڕیاوە بوە کە دەستگیر ئەبێت بە فەرمانی ئەحمەدشاە دەستی‌یان بڕیوە خودی (ئەحمەدشا) چاوی پێوە بوە کە ئەم پیاوە بو بەر بەست کردنی خوێنی ئەبوا دستیان بخستایا ناو و رونی داغ قرچیاو خوٚی دەستی خستوەتە ناوی روونە قرچیاوەکە. ئەحمەدشا وتبووی بمزانیا وا ئازایە نەم ئەهێشت باڵی ئەم پیاوە کوردە ببڕرن. لە کاتیٚ مرد نیا لە ناوچەیٚ لەیلاخ لە ئاوای ئاسیاوجو چەمەری‌یان بو گیراوە لە زمانی خزمە پیرە کانمەوە بیستومە (نووسەر).

داب و نەریتی کوردەواری ئەگەر بەڕاستی‌ئێمە سەرمان بردە ناوی کەلە پوری پڕ سامانی و دەوڵەمەندی کوردی بیٚشک و گومان زور نهێنی بوٚمان دەرئەکەوێت و ئەوەمان بو ژون ئەبێتەوە کە گەلی کورد لە پاڵ ئەو هەمو تەفرە تونایی روزگار و هەروەها چەرمەسەری‌یەدا چوٚن خاوەنی ئاوا داب و نەریتی پڕ ناوەروٚکە چوٚن لە داب و نەریتە کوردیەکان فەلسەفەیٚ ژیانی ئادەمیزاد لە بەر بەیانی کە تاهاتنی فەرهەنگ و ژوداوەکانی مێژووی تیدایە و روخساریکی مێژووی و رووداوی داهاتنی زانین و ئایینی بە خوێەوە ئەگری و بەڕاستی ساڵەهای ساڵیشە لە سنگی خەلکدا پارێزراوە. و دور نیە کە زوٚربەیٚ بەیتو باوە کوردیەکان پاشماوەیٚ ئایینی میترا پەرەستی و مهر پەرەستنی و خور و روٚژ پەرەستی تا دەگاتە ئایینی مەزدا پەرەستی وەک گورانیەکان بە تایبەت هورەکە لە جێگایٚ

خوێدا باس کراوه و سیاجامه‌کان و زۆربه‌ی داب و نه‌ریته‌کان ئه‌مڕۆ به شێوه‌ی ئیلمی به‌کاردێت وه‌ک ده‌رمانی گیایی و چاره‌سه‌ری نه‌خوشی ڕه‌وانی به‌گوتنی گورانی که له‌م چه‌رخه‌دا به‌و ئاکامه گه‌یشتوه. چه‌نده ئه‌م فه‌رهه‌نگی گه‌لی کورده ده‌وڵه‌مه‌ند بووه له‌و رۆژگارانه‌دا به‌داخه‌وه هێشتا ئێمه نه‌ماتوانیوه ریز ئه‌م که‌له‌پوره نه‌ته‌وایه‌تیه بزانین. و ئێستا گه‌رد و توزی بێ‌میهریی لێی نیشتوه و ره‌نگی خوێ له ده‌س داوه. هیوا دارم له داهاتوی نزیک‌دا بزوتنه‌ووه‌ی زیندوو کردنی فه‌رهه‌نگ و داب و نه‌ریت ده‌ستی پێ بکرێ و دیسان جێگای خوێ بگریته‌وه وه به شێوه‌یه‌ک که له گه‌ڵ فونولوژی ئه‌مڕۆ داریک بکه‌وێت.

# «سەرنج»

ئەم کتێبە پێشکەش بە وانەیَ وا دڵ تەنگن و بۆ ڕوناکی ئەگەڕن. چۆن مرۆڤ ئەگەر ئەزانی هەر ئەمرێت و ڕۆژیک مردن دێتە شوێنی چاکتر ئەوەیە هەر ئێستا مردوی زیندوونەما نەبێت.

کە وا بوو هوشیار بێت هەر بەرەو ڕوناکی هەوڵ بدات چۆن ئەگەر مرۆڤ نەزان بێت بەڕاستی وەک مردوو ئەژمیرێت و کەسێک ئەتوانی کە خۆی بە زنێدوو دابنێت ئەبێ ئەوەش بزانیَ کە ژین تەنیا خواردن و نووستن کار وکاسبی ژیان نیە و مرۆڤی زیندوو بەو کەسە نالێن و پیَ دەڵێن مردووی زیندوونەما.(

یان بە قەولی سەید قوتب: ئەم دنیا پڕە لە مردووی زیندوونەما. ئەمە دێتە سەر ئەوانەیَ وا هەر لە سەرەتای ئومری (تەمەن) ناموبارەکیانەوە بیَ قازانج و بیَ کەڵک ئەژێن و ئەبنە سەر باری میللەتێک و ئەبنە کۆسپ وتەگەرە لەبو پێشکەوتنی زانین.

چۆن ئه‌م تاقمه هه‌ر وه‌ک حه‌یوانی زیانه‌خورو ئه‌بێت بو زک تێر کردنی خۆی ئه‌یانه‌وێ ته‌نیا بو خۆیان هه‌موو شتێکیان ئه‌وێ و له به‌ر نه‌زانین له دواجار ئه‌بنه چینی خۆ فرۆشی و له هه‌ر کارێ خراپ چاو ناپوشن و ئه‌گه‌ر که‌سێک بیه‌وێ به‌ره‌و رۆناکی کومه‌لێک یان میلله‌تێک هه‌نگاو هه‌ڵ بگرێت چۆن به زیانی ئه‌م له خو بێ‌خه‌به‌رانه ته‌واو ئه‌بێت رێگای رۆناکی لێ ئه‌گرن به هه‌ر شێوه‌یه‌ک نامرۆڤانه بویان ده‌ست بدات دای‌ئه‌مرکێنن و نموونه‌ی ئه‌م نه‌زانی و رۆژڕه‌شیه، ئه‌مه‌یه که‌وا چۆن بڕێک هه‌یه‌تی گه‌نجی قاروون و بڕێک نیه‌تی بخوات نانودوو. خۆشی و ناخۆشی سه‌رکه‌وتن و ژێر که‌وتن له ژیاندا کار راستی و هه‌ر ره‌وشتێ بڕێک بیر کردنه‌وه‌ی بێ جێ‌یان ئه‌بن به خراپه، و چاکه‌یش ئه‌که‌ن به خراپ و ئه‌م چینه رێبازی خۆ خوازی و باس خوازی ئه‌گرن. به‌ڵام گرینگ ئه‌وه‌یه ئه‌م مرۆڤه به هوش بێته‌وه و فریای خۆیان که‌ون و خۆیان بناسن و که‌م و کورتیه‌کانی نه‌زانی خۆیان نیشان بکه‌ن. و مرۆڤ راسته‌قینه بناسن و ئاگایان له دواکه‌وتن و سه‌ر که‌وتن قه‌ومه‌کانی خۆیان بن و له زیندانی نه‌زانین به‌ره‌و دنیای زانین روو بکه‌ن. ئه‌وسا که که‌م و کورتی و کێشه‌کانیان زانران و کۆسپ و ته‌گه‌ره‌کانیان نیشان کران ئه‌توانرێت به‌پێ توانای و رێکه‌وت رێبازی چاکه بدوزێنه‌وه و چاره‌یان له رێگای زانین راسته‌قینه بکرێت. چ مرۆڤ و چ نه‌ته‌وه‌یک که شنه‌ێ هوشیاری دای له سه‌ر ده‌ماخیان ئه‌توانرێت چاکه و خراپه لێک بکاته‌وه به هوشیاری رێزی خۆی و نه‌ته‌وه‌ێ ئه‌گرێت. شێوه و ناوه‌رووک خۆیان له جێگه‌ێ خۆیان گرنگیان بداتێ. له دژی ئه‌فسانه و سه‌ره‌سوڕێ باسی به‌تاڵ وه سه‌ر ئێشان و زوورداری و چه‌و سانه‌وه بێت که

چاوی بە زۆر بە سرابێت دایم هەولێ رۆناکی بدات.

ئازیرانی خوێنەر: وەرگرتن و پەیدا کردنی رۆشنبیریش تەنها بە تاقی کردنەوەو شارەزابوون خۆت بە زانینی پێک نایێت بەڵکو زیاتر بە رۆشنبیری و مرۆڤایەتی پێک دێت. و ڕۆشنبیریش تەنیا بە خوێندەواری نیە واتە هەر کەسێک کە پلەی ـ خوێندنی دانشگای‌یان بوئەوە پێ ناڵێن رۆشنبیر چۆن رۆشنبیر بە کەسێک ئەڵێن کە سەوادی(زانیاری) کۆمەڵایەتی و شوێن گرتنی بەسەرهاتی میللەتی خۆی بە زانین رەچاو بکرێو شەریک ئەو بەسەرهاتانە بێت و بەشێ زووری لە چارەنووسی گەلەکەیەوە بەئەستۆ بگرێت.

ئە بێ بە فەلسەفەوە بیرو باوەڕو هۆشیاری ڕێزی خۆت و کۆمەڵەکەت بگرێت. کەسێک وا هۆشیارو ئاگاو زانا بێت قەد بە لای تاریکی‌دا ناچێت کەسێک وا تەنیا بیر لە خۆی ئەکاتەوە بۆ خۆی ئەژێت ئەوانە هەروەک حەیوان چۆن تەنیا لە زگ خۆیان زیاتر ناتوانن شتێ کۆبکەنەوە یانی هەر بو خۆی ئەژێت.

ئەوە پێ‌دەڵێن مرۆڤ وا بۆ خەڵک ژیانی خۆی تەرخان ئەکات تاگشت کەسی شادی خۆشی وەک یەک بێت و تامی ژیانی ڕاستەقێنە بە خواردی هەمووان بدات و ئاسایش‌و ئازادی بۆ خەڵک بێنێ. بەڵێ: مرۆڤی ڕاستەقێنە ئەو کەسەیە وا خۆی بە چەرمەسەرێ و رۆژ رەشی ژیوار ئەکات و خۆشی و ئاسایش بۆ خەڵک داخواز ئەکات و هیوای بە داهاتوو هەیە کە ئیتر زوڵم و ستەم نەمێنێ و خەڵک بە بچوکترین خەیانەت بو سەر زێدو ماڵ و سامان و ناموس و شەرەف چاو پووشی نەکەن بەڵێ: خوێنەرانی بەڕێز ئەمەیە

ئاوێنەی مرۆڤی زانا و ئازاو جوامێر نەک مرۆڤ دڵ پەریشان و گریان لە شێوەێ نامرۆڤان[1] ترسیان بێت.

کونفوسیوس: فیلەسوفی چینی ئەڵێ زەحمەتە وە شک نابەم کەسانێ وا بۆ خۆیان ژیاون و خەریکی زک پڕکردن و زاو زو بن داهێنەری شتێ چاکە بن، تەنیا زەرریان زیاتر بووە چۆن بوونەتە کۆسپ و تەگەرە بۆچینە هۆشیارەکانیش و خۆیانیش هیچ شتێکیان لە هۆشیاری نەزانیوە و دەرونیشیان جێگەێ جەهل و نەفامی زیاتر هیچی نیە هەر وەها رۆشنبیری سیاسیش بەشێکە لە بەشە گرینگەکانی کۆمەڵایەتی پێویستەکانی ژیانی مرۆڤ. چۆن لە کۆمەڵی ئەم چەرخەدا حەزو هەوڵی دەسەڵاتداری و شکۆداری و ئارەزوی زاڵ بۆون و خۆسەپاندن بیروباوەڕی کۆمەڵێ بەسەر کومەڵی تردا پیویستە بیر و هوشی رامیاری بگاتە پلەێ بەرز بە تایبەت گەلی کورد چۆن مێژوو روونی کردوەتەوە کە لە هیچ شۆڕشێکدا بە شەڕ شکستی نەخواردو و شۆڕشەکەێ لە رێگەی شەڕەوە دانەمرکاوە بەڵام بە پێلان فێڵ کە هەر مەبەست لە رامیاری یە داگیرکەرەکان تەنیا لە رێگای رامیاری توانیویانە بزوتنەوەکان دامرکێنن.

رامیار ئەبێت توانای گوڕینی کار و باری هەبێت بەرو چاکەی لە بواری ریکەوت و هەڵکەوتدا ئەوەندە زانای بێت لە باری سیاسیەوە ئەبێ کاتێ کە دوژمن و یستی بە هەڕەشە هێرشی گەل چاو ترسێن بکات ئەو گەلە هەر لە رێبازی ڕامیاری‌یەوە بتوانێت ئاش‌بەتاڵی بکات و تەوەژم و قورسای و پیلانی دوژمن لە سەر کومەڵ کەم بکاتەوە و لە

1- لە کتێبی هوشیاری و رۆشنبیری.

ناو گەلدا سیاسەت بگاتە رادەیەک کە هەر کەسێک ئە بێ بە ئەرکی سەر شانی خۆی بزانێ لە ناو کومەلێ میللەتەکەی چ راهبوری و گەل و میللەت بەرەو چ لایێک چارەنوسی ئەچێت یانی چاکترین رێگا ئەتوانین بلێین هەر لە رێبازی رامیاریەوە پێک دێت. لە راستیدا گەلی کورد لەم بارەوە زۆرتر کزن. لە برێک جاردا ئەم میللەتە دڵ سافە هەر خۆی بوەوتە قوربانی حکومەتە کان و داگیر کەرانیش لەم روەوە زۆرتر بە ئامانجی خۆیان گەیشتن و گەلی کورد خۆی بوەتە تیری قەزای دوژمنانی خۆی. هوشیاری هەستی نەتەوایەتی و مرۆڤایەتیيە نرخ و بایەخدان بە خاکی نیشتمان و زانین بناغەی دامەرزاندنی چاکەیە و کەمتر کۆسپ و تەگەرە دێتە ریبازی ژیان و سود بەخشینە بە نەتەوە و مروڤایەتی زانین لە نیو گەلدا تێکۆشانێکە بێ وچان دژی چەوسانەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی و داگیر کردن بایەخدانە بە زمان قەڵەم و بیر و ئەقل و ئیمانی راستەقینەی ـ دژی دێوی دەرونی نەزانین جەهل و خورافە لە تاریکی بەرەوزانین بە کارهێنانی بە پوختی و پەتی ورەوان بێژی بە نوسینی و بە وتن خۆناسینە بەراستی لەوشتە سەرەکیانەێ کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیاکاتەوە رێزەنی ئاشتی و هوشە ـ هەر چەندە مرۆڤ هوشیار بێت ئەوندە بە سەر دەرو بەرە سروشتی و کومەلایەتیەکەی زاڵ ئەبێت یەکی لە پێوانەکانی پێشکەوتنی نەتەوەیێک پلەی بەرزی هوشیاریە و زانینە، کاتێ کە مرۆڤ هوشیار بوو چاوی لە بەرزی خۆی و نەتەوەکەی ئەبێت. روو لە دروستکاری و راهێنانی کومەڵ ئەکات بەرەو رزگاری و زانین کارێک ئەکات کە هەموو پیویستە مرۆڤایەتیەکان زیندوو ئەکاتەوە لە دەرونی مرۆڤ و جم و جولی ئازادی و سەربەرزی

زید و نیشتمان و هاوڕەگەزی دێتە کایەوە و قەد بەلای تاریکی‌دا ناچێت مرۆڤی سادە و ساویلکە هەر وەکو گەلای دار و یان پووش چۆن بە کزەبای بەرەو هەر لایێ با ئەیبات هەر بەم جۆرەیشە دەیان جار بفروشرێ و بیکرن بە خۆی نازانێ لە چینی نەزانین‌دا رەنگە خۆی بەبورەپیاویش بزانێ هەر وەها کە حەزرەتی ئەلی فەرمویەتی نەزان واتەزانی هەمووشتێ ئەزانێ زۆر لە زانایان بونتە قوربانی نەزانەکان و کوسپ تەگەرەیان خستوتە بەر زاناکان و زاناکان بەداخی نەزانەکانەوە سەریان ناوەتەوە ئەگەر گەلی کورد لە سەردەمی هاتنی دین پیرۆزی ئیسلامەوە تەنیا خۆی بە نوێژ و رۆوژو خەرێک بکردایە چاکتر بوو تا لەوە دەیان دەیان تاقم و دەستە لِی جیا بێتەوە سوفی و دەروێش مەلاو شێخ و ... هەر کامیان ئەوی‌تریان بە جەهەندمێ زانیوەو لە سەر ئاسمان حەوت تەبەقە یان نۆ تەبەقە بە گژ یەکدا چۆن گەلی کوردیان بەم شێوە لە دین راستەقینەی ئیسلامەوە دوور خستەوە تا چ بگات بە بیری نەتەوە رزگار کردن کاتێ کە میللەتانی دیکە بوو دەرکردنی بێگانەکان خەباتیان ئەکرد لە دژی داگیرکەران گەلی کورد بە حەی‌یەلا و یا شێخ لاوە لاوە تێغ و وردە شووشە خواردن خەرێیک بۆون خوێنەرەانی بەرێز لە کوتای‌دا ئە بێ بلێین هوێ نەزانین بە لای خرابی کە ئەگەر لە ناو هەر میللەتێک‌دا بێت ئەو میللەتە ژێر دەست و دەست بە سینەیە و لە سەر سفرەێ نانوخوانی خۆی‌دا بە لارەملی ئەژیت کە وا بوێمە کورد بیر لە رابردووی خۆمان بکێنەوە کە کاتێ قەومی کورد تەمەدون و فەرهەنگی بوو یاسای مروڤایەتی لە چوار هەزار ساڵی پێش زاێین دامەزراند نەتەوەکانی دیکە جیهان لە تەوەحوش و زل کاوی نەزانی و بت‌پەرەست و قانونی کچ زیندوو بە چاڵ کردنیان لایان

باو بوو یان تورکەکان بە پەرەستنی گا و جانەوەران باوەڕیان بووەو ئاێینی مرۆڤ فروشتن بە شێوەیٚ ڕەسمی لە ناویاندا باو بووە ئەمە هویٚ چیە کە ئێستا ئەوان بونتە خاوەنی دەسەڵات و لە ئاسایش و خوشی‌دا ئەژین. ئەویش هەر بە چاو بەستنی کورد و لە ڕیگەی کەڵک وەرگرتن لە نەزانینی کوردەکانە وا بەم ڕۆژە کەوتون.

# «تەواو»

## «له سه‌رچاوه‌ی ئه‌م کتێبانه که‌ڵکم وه‌ر گرتوه‌»


١ ـ کورد و کوردستان — آیت‌الله مردوخ

٢ ـ ایران باستان — مشیرالدوله

٣ ـ تاریخ ده‌هزار ساله ایران — عبدالعظیم رضایی

۴ ـ فرهنگ ایران باستان — استاد پورداود

۵ ـ کورد و کوردستان — ئه‌مین زه‌کی به‌گ

۶ ـ کورد — مینورسکی

٧ ـ بزوتنه‌وه‌یٚ کورد — ره‌مزی قه‌زار

٨ ـ خه‌بات له ڕێگه‌ی کوردستاندا — ن ـ ن ـ خه‌لفین

٩ ـ کێشه‌ی کورد — کاووس ته‌فتان

١٠ ـ تاریخ ایران — عباس اقبال آشتیانی و مشیرالدوله

١١ ـ تاریخ ماد — دیاکونف

١٢ ـ کُرد و پیوستگی نژادی او — رشید یاسمی

١٣ ـ تاریخ ریشهٔ نژادی کُرد — احسان نوری

١۴ ـ کُردها — که‌ندال عصمت (ترجمه دکتر ابراهیم یونسی

١۵ ـ شهرهای ایران — عنایت‌الله رضائی

١۶ ـ مزده یه‌سنا — کیخسرو شاهرخ

١٧ ـ تاریخ ایران — ترجمه کریم کشاورز

۱۸ ـ جونبش ملی کُرد — کریس‌کوچرا (ترجمه دکتر ابراهیم یونسی)

۱۹ ـ تاریخ باستان — دکتر اسماعیل دولت‌شاهی

۲۰ ـ تاریخ کامل ایران — ترجمه دکتر رازی

۲۱ ـ کۆماری کوردستان — ویلیام جونیر (وەرگێڕ سەید موحەمەد سەمەدی)

۲۲ ـ جغرافیای غرب ایران — عمادالدین دولت‌شاهی

۲۳ ـ دین مەزدایی — مهرین مهرداد

۲۴ ـ راپەڕینی کوردەکان (۱۸۸۰) — جەلیل تەجلیل

۲۵ ـ لێکولینەوەی ئەدەبی فولکلۆر ی — دوکتور ئیزەدین موستەفا رەسول

۲۶ ـ مێژووی وڵاتی کوردەواری — دوکتور جەماڵ رەشید

۲۷ ـ ژیانی کوردەواری — ئاواز زەنگەنە کردویە بە کوردی

۲۸ ـ داب و نەریتی کوردەواری — هەردەوێل کاکەیی

۲۹ ـ بین‌النهرین باستان — ترجمە: عبدالرضا هوشنگ مهدوی

۳۰ ـ چیم‌دی — ئەحمەد خواجە

۳۱ ـ جغرافیای ایران باستان — دکتر محمدجواد مشکور

۳۲ ـ فتوح‌البلدان — بخش مربوط به ایران نوشته احمدبن‌یحییٰ

۳۳ ـ چهره زەرتوشت در تاریخ — نوشته داود الهی

۳۴ ـ زمانی یەکگرتو — نوسین دوکتور جەماڵ نەبەز